# پێگەی سوننەت
# لە شەریعەتی ئیسلامدا


**نووسینی**

مصطفى السباعي

**پوختەکردن و وەرگێڕانی**

**مامۆستا عبدالکریم فتاح**



١٤٣٧ك        ٢٠١٦ز










**ناوی کتێب:** پێگەی سوننەت لەشەریعەتی ئیسلامدا.

**نووسینی:** مصطفى السباعي.

**وەرگێڕان وپوختەکردنی:** مامۆستا عبدالکریم فتاح.

**نەخشەسازی ناوەوە:** احمد خالد

**تایپ:** نووسەر.

**نۆرەو ساڵی چاپ:** یەکەم ٢٠١٦ زایینی.

**تیراژ:** (١٠٠٠) دانە.

**نرخ:** ( ٥٠٠٠ ) دینار

**چاپخانە:**

**بەسەرپەرشتی:** نەهرۆ محمود

**ژمارەی سپاردن:** (        )ی ساڵی ٢٠١٦ لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکانی دراوەتێ.

Nuri.haqeeqat@gmail.com



﴿ كَمَا أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُو عَلَيْكُمْ آيَاتِنَا
وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ
تَكُونُوا تَعْلَمُونَ ﴾

البقرة: ١٥١



# پێشەکی وەرگێڕ

لەم رۆژگارەدا قسە و باسێکی زۆر لەسەر سوننەت و پلە و پایـەی سـوننەت لـە شەریعەتی ئیسلامدا بوونی هەیە، هەیانـە بـە زانسـت قسـە دەکـەن و هەشـیانە بێزانست و هەڕەمەکیانـە بەربوونەتـە جەسـتە و گیـانی فـەرموودە، راسـتە لـە سەردەمێکدا دەژین-لەسەرجەم بوارەکانی ئیسلامدا- پێویستی بە پێداچوونەوە و ئیجتیهادی نوێ هەیە، بەڵام دەبێ ئەوە بزانین ئەم کارە بە زانست و ئەهلی زانست ئەنجام دەدرێت، بە کەسانێك دەکرێت خاوەنی پلە و پایـەی مـەزن بـن لـە بـیر و تێڕوانینی بەرین و ئیجتیهاد، کەسانێك بن لـە هـەناوی ئیسـلامەوە هـەڵقوڵابن، ئامانجیان تێگەیشتنی دروست و گەیشتن بێت بە راستی و دۆزینەوەی رێگەچارە بۆ پرسە ئاڵۆزەکان، نەك کاریان بریتی بێت لـە تانەلێـدان و گومـان دروسـتکردن و عەیبدار کردن و رشتنی کینە و رق، مێژوو ئەوەی بۆمان سەلماندووە ئەم جۆرە بیر و ئاراستانە هیچیان لێوە سەوز نابێت، بەڵکو هەنـدێ جـار پەرچـەکرداری تونـد بەرهەم دەهێنن.

بانگەشەی "تەنها قورئان بەسە بـۆ تێگەیشـتن لـە ئیسـلام" بانگەشـەیەکە خـودی قورئان بە درۆی دەخاتەوە، چونکە لە چـەندین ئایـەتی قورئانـدا فـەرمانمان پێکـراوە شوێنی پێغەمبەر(ﷺ) بکەوین و گوێڕایەڵی لـێ بکـەین، راسـتە قورئـان سەرچـاوەی یەکەمی شەریعەتە و هەر شتێکی پێچەوانە بەم سەرچاوە مەزنە رەد دەکرێتـەوە یـان لێی دەوەستین بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی زۆرتری بۆ بکرێت، بـەڵام ناکرێـت فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) وەلابنرێت و کەمبایـەخ تەماشـا بکرێـت وەك سەرچـاوەی دووەمی شەریعەتی ئیسلام، بەڵکو سـوننەتی پێغەمبـەر رێگەیەکـە بـۆ حـاڵیبوونی دروسـت لـە قورئـان، پێغەمبـەر(ﷺ) ئـەخلاقی بـریتی بـوو لـە قورئـان، وەك چـۆن تێگەیشتنی دروست لە قورئان رێگەیەکە بۆ پێغەمبەرناسی و فەرموودەناسی.

بۆ گرنگی پله و پایەی سوننەت و رەدکردنەوەی هەموو ئەو شك و گومانانەی لەسەر سوننەت لە کۆن و نوێدا خراونەتە روو هەستاین بە وەرگێڕان و پوختەکردنی کتێبی **"السنة ومكانتها"**ی دکتۆر **"مصطفى السباعي"**، داوامانە خودا بیگێڕێت بە نوور و رۆشناییەك بۆ رۆڵەکانی ئیسلام و تاریکستانی شك و گومانەکانی پێ بڕەوێتەوە، بۆ نووسەرەکەی خێر و پاداشتێکی مەزن بێت و ئێمەش لەو خێرە بێبەش نەکات.. ئامین.



وەرگێڕ

سلێمانی

٢٠١٦/٤/١٤

  

# دەروازەی یەکەم

## چوار بەشی تێدایە:

**بەشی یەکەم:** مانای سوننەت و پێناسەکەی.

**بەشی دووەم:** هەڵبەستن(دانان)ی فەرموودە و چەند باسێك.

**بەشی سێیەم:** کۆشانی زانایان بۆ بەرەنگاربوونەوەی بزاڤی فەرموودەهەڵبەستن.

**بەشی چوارەم:** بەری ئەو کۆشانە.

# دەروازەی یەکەم

## بەشی یەکەم

## مانای سوننەت و پێناسەکەی

**سوننەت (السنة) لە زمانەوانیدا:**

**بریتییە لە ڕێگەیەکی پەسەند یان ناپەسەند.**

**نموونەی فەرموودەکەی پێغەمبەر**(ﷺ): ((هەر کەس سوننەتێکی باش دابڕێژێت ئەوا پاداشتی سوننەتەکە و پاداشتی ئەو کەسەی بۆ هەیە کاری پێ دەکات هەتا ڕۆژی دوایی، هەرکەسیش سوننەتێکی خراپ دابڕێژێت ئەوا گوناهی ئەو کارە و گوناهی ئەو کەسەش کاری پێ دەکات دەچێتە گەردنی هەتا ڕۆژی دوایی))[1].

**هەروەها نموونەی فەرموودەی:** ((شوێنی سوننەتەکانی ئەوانەی پێش خۆتان دەکەون، بست بە بست و باڵ بە باڵ))[2].

**لە زاراوەی ئەهلی فەرموودەدا:** سوننەت ئەوەیە لە پێغەمبەری خوداوە وەرگیراوە لە گوفتار و کردار و دانپیادانان و سیفەتی خەلقی یان ئەخلاقی یاخود ژیاننامە، یەکسانە پێش بوون بە پێغەمبەر بێت یان دوای بوون بە پێغەمبەر بێت، سوننەت بەم مانایە هاوواتای "فەرموودە"یە لە لای ئەهلی فەرموودە.

**لە زاراوەی ئوسولییەکاندا:** سوننەت ئەوەیە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گوازراوەتەوە لە گوفتار و کردار و دانپیادانان. **نموونەی گوفتار فەرموودەی:** ((**إنما الأعمال بالنيات**)).

---

[1] أخرجه مسلم.

[2] أخرجه البخاري ومسلم.

**نموونەی کردار:** ئەوەیە هاوەڵان دەربارەی عیبادەتەکان لە نوێژ و ڕۆژ و حەج و زەکات و قەزاوەتی بە شایەت و سوێند و کارەکانی تر لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) باسیان کردووە.

**نموونەی دانپیادانان:** ئەو گوفتار و کار و کردەوانەن لە هاوەڵان وەشاونەتەوە و پێغەمبەر(ﷺ) لێیان بێدەنگ بووە بە بێدەنگبوونی ڕازیبوون، یان بە چاکی بینیون و پشتگیری لێکردوون.

**نموونەی بێدەنگبوون بە بێدەنگبوونی ڕازی بوون لە ئیجتیهادی هاوەڵانی:**

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((هیچ کەس نوێژی عەسر نەکات لە بەنی قورەیزە نەبێت))[1].

هەندێکیان وا تێگەیشتن ئەو نەهیکردنەی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر حەقیقەتە و تا دوای مەغریب نوێژی عەصریان دواخست، هەندێکی تریان وا تێگەیشتن مەبەست لەو نەهییە هاندانی هاوەڵان بووە بۆ پەلەکردن، بۆیە لە کاتی خۆیدا نوێژەکەیان کرد، ئەو ڕووداوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باسکرا و دانی بە هەردوو ئیجتیهادەکەدا نا.

**نموونەی بەچاکبینین:** ئەو فەرموودەیە لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕنەوە گۆشتی بزنمژەی دەخوارد کاتێك پێشکەش بە پێغەمبەر(ﷺ) کرابوو بەبێ ئەوەی بیخوات، هەندێ لە هاوەڵان پرسیاریان لێکرد: ((ئایا خواردنی حەرامە ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵام لە زەوی هۆزەکەمدا نییە، بۆیە سروشتم حەزی لێ ناکات))[2].

هەندێ جار سوننەت لەلای ئوسوڵییەکان ئەوەیە بەڵگەیەکی شەرعی لەسەرە یەکسانە بەڵگەکە لە قورئاندا بێت یان لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) یان هاوەڵان ئیجتیهادیان تێدا کردبێت، وەك کۆکردنەوەی قورئان.

نموونەی ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ): ((لەسەر سوننەتی من و سوننەتی خەلیفەکانی ڕاشیدین بڕۆن))[3].

---

[1] أخرجه البخاري ومسلم.

[2] أخرجه البخاري ومسلم.

[3] أخرجه أبو داود والترمذي.

**له زاراوەی فەقیهەکاندا:** سوننەت ئەوەیە لە پێغەمبەری خوداوە جێگیر بووە نەك بە شێوەی فەرز و پێویستبوون(وجوب)، واتە بەرانبەر "واجب" دادەنرێت لە پێنج حوکمەکە، هەندێ جاریش سوننەت بەرانبەر بیدعە بەکاردەهێنرێت، لەوانە ئەو قسەیان کە دەڵێن: تەڵاقی سوننەتی بەم جۆرەیە و تەڵاقی بیدعیش بەو جۆرەیە.

سەرچاوەی ئەم جیاوازییە لە زاراوەدا بۆ جیاوازی ئەو مەرامانە دەگەڕێنەوە هەر دەستەیەك لە ئەهلی زانست گرنگیان پێداوە.

## پێویستبوونی گوێڕایەڵی پێغەمبەری خودا لە ژیانیدا:

لە سەردەمی پێغەمبەری خودادا هاوەڵان حوکمەکانی شەرعیان لە قورئانەوە وەردەگرت و لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) بەدەستیان دەگەیشت، زۆرجار ئایەتەکان پوختەبوون و درێژەیان پێنەدرابوو، یان رەهابوون و سنووردار نەکرابوون، وەك فەرمان بە نوێژ کە بە پوختە هاتووە و قورئان ژمارەی رکاتەکانی و شێوازی ئەنجامدانی و کاتەکانی رۆشن نەکردووەتەوە، نموونەی رەها وەك فەرمان کردن بە زەکات، بەرەهایی هاتووە و کەمترین رادەی ماڵ و سامانێك زەکاتی تێدا پێویست دەبێت دیاری نەکراوە و بڕەکەی و مەرجەکەی دەسنیشان نەکراوە، لەم بارەدا دەبوا هاوەڵان بگەڕێنەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەوەی حوکمەکان بە شێوەیەکی رەوان و رۆشن بزانن.

خودا(سبحانه وتعالى) لە قورئاندا کاری پێغەمبەر(ﷺ) لەمەڕ قورئان دیاریدەکات کە بریتییە لە رۆشنکەرەوە و واڵاکەری مەرام و مەبەستی ئایەتەکان و دەفەرموێت:

﴿ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِۗ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ النحل: ٤٤.

﴿ لَقَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ بَعَثَ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡ أَنفُسِهِمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿١٦٤﴾ ﴾ آل عمران: ١٦٤

جمهوری زانایان بۆ ئەوە دەچن **"الحكمة"** شتێکی ترە جگە لە قورئان، ئەوەش بریتییە لەو نهێنیانەی ئایین و ئەو حوکمە شەرعییانەی خودا پێغەمبەرەکەی(ﷺ) پێ ئاگادارکردووەتەوە.

شافیعی(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت: ((خودا باسی "الكتاب"ی کردووە، ئەوەش بریتییە لە قورئان، پاشان باسی **"الحكمة"**ی کردووە، ئەوەش -وەك ئەهلی زانست بە قورئان دەڵێن- بریتییە لە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ)...))[١].

ئەوەی ڕۆشنە ئەوەیە شافیعی(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) پێداگری لەوە دەکات دەبێت (**الحكمة**) لەو شوێنەی قورئاندا بریتی بێت لە سوننەت، چونکە خودا **"عطف"**ی کردووەتەوە بۆ سەر "الكتاب"، ئەوەش جیاوازی نێوان ئەو دوو وشە پێویست دەکات، بۆیە نابێت هیچ مانایەکی تری هەبێت جگە لە سوننەت، چونکە لە میانەی منەتی خودایی لەسەرمان هاتووە بەوەی ئێمەی پێ فێر دەکات، خودا تەنها بە ڕاست و دروستێك منەت دەکات، بۆیە حیکمەت هەروەك قورئان شوێنکەوتنی پێویست (واجب)ە، ئێمەش تەنها شوێنکەوتنی قورئان و پێغەمبەر(ﷺ) لەسەرمان پێویست کراوە، بۆیە دەبێت حیکمەت ئەوە بێت لە پێغەمبەری خوداوە ڕاگەیەنراوە لە حوکمەکان و گوفتارەکان لە میانەی تەشریعدا.

گەر کارەکە بەو جۆرە بێت کەوابوو پێغەمبەر(ﷺ) قورئان و شتێکی تری لەگەڵ قورئان پێدراوە و پێویستە شوێنی بکەوین، ئەوەش بەئاشکرا لەم ئایەتەدا هاتووە:

**﴿يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَىٰهُمۡ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ وَٱلۡأَغۡلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡ﴾ الأعراف: ١٥٧.**

لەبەر ئەوەی وشەکە گشتییە کەوابوو هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە حەڵاڵی دەکات و حەرامی دەکات لەوەی سەرچاوەکەی قورئانە، یان سەرچاوەکەی وەحییەکە خودا بۆی ڕەوانە کردووە، ئەبو داود فەرموودەیەکی ڕیوایەت کردووە دەفەرموێت: ((دەزانن من **"کتاب"** و هاوشێوەی(هاوتا)ی کیتابم پێدراوە)).

---

[١] الرسالة: ص٧٨.

ئەوەی بەڵگەیە لەسەری ئەوەیە خودا لەسەر موسڵمانان پێویستی کردووە شوێنی پێغەمبەر بکەون لەو شتانەی فەرمانی پێ دەکات و نەهییان لێ دەکات:

﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْ﴾ الحشر: ٧.

گوێڕایەڵی پێغەمبەری هاوتا کردووە بە گوێڕایەڵی خۆی(سبحانه وتعالى) لە زۆرێك لە ئایەتی قورئاندا، لەوانە:

﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ١٣٢﴾ آل عمران: ١٣٢.

هەروەها هۆشداریداوە لە سەرپێچی کردن لە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) و دەفەرموێت:

﴿فَلۡيَحۡذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنۡ أَمۡرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمۡ فِتۡنَةٌ أَوۡ يُصِيبَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ٦٣﴾ النور: ٦٣.

بەڵکو ئاماژەی بەوە داوە سەرپێچی لێی بێباوەڕییە و دەفەرموێت:

﴿قُلۡ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٢﴾ آل عمران: ٣٢.

لە هیچ رێگەیەکەوە موباحی نەکردووە بۆ باوەڕداران سەرپێچی لە فەرمانەکانی بکەن و دەفەرموێت:

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤۡمِنٖ وَلَا مُؤۡمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمۡرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلۡخِيَرَةُ مِنۡ أَمۡرِهِمۡۗ وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلٗا مُّبِينٗا ٣٦﴾ الأحزاب: ٣٦.

لە نیشانەکانی دووڕوویی پشتهەڵکردنە لە دادوەری پێغەمبەر(ﷺ) لەو جێگانەدا کە شوێنی ناکۆکی و جیاوازین:

﴿لَّقَدۡ أَنزَلۡنَآ ءَايَٰتٖ مُّبَيِّنَٰتٖۚ وَٱللَّهُ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٤٦ وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعۡنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٞ مِّنۡهُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَۚ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٤٧ وَإِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَهُمۡ إِذَا فَرِيقٞ مِّنۡهُم مُّعۡرِضُونَ ٤٨ وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلۡحَقُّ يَأۡتُوٓاْ إِلَيۡهِ مُذۡعِنِينَ ٤٩ أَفِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ٱرۡتَابُوٓاْ أَمۡ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَرَسُولُهُۥۚ بَلۡ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٥٠ إِنَّمَا كَانَ قَوۡلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَهُمۡ أَن يَقُولُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٥١﴾ النور: ٤٦ – ٥١.

بەڵكو لە پێویستییەكانی ئیمان ئەوەیە بەهیچ لایەكدا نەڕۆن كاتێك لەگەڵ پێغەمبەری خودان(ﷺ) تا مۆڵەتی لێ وەردەگرن و دەفەرموێت:

﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمُ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٢﴾﴾ النور: ٦٢.

**ئیبن قەیم دەڵێت:** گەر لە پێویستییەكانی ئیمان ئەوە بێت بە هیچ لایەكدا نەچن كاتێك لە خزمەتی پێغەمبەری خودان(ﷺ) بەبێ مۆڵەتی ئەو، ئەوا لەپێشترە لە پێویستییەكانی ئیمان ئەوە بێت نەچن بە لای گوفتار و مەزهەبێكی زانستیدا بە بێ مۆڵەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، مۆڵەتی پێغەبەری خودا(ﷺ) بەو بەڵگانە دەناسرێتەوە كە لە ئەوەوە هاتوون و تیایدا ئاماژەی مۆڵەتی پێغەمبەری(ﷺ) تێدایە.

لە هەموو ئەمانەوە دەگەینە ئەو سەرئەنجامەی هاوەڵان(خوایان لێ رازی بێت) پێویست بووە بگەڕێنەوە بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) تاكو لێكدانەوەی حوكمەكانی قورئانی لێ وەربگرن و تەمومژ و لێڵییەكانیان بۆ رۆشن بكاتەوە و ئاڵۆزییەكانیان بۆ شیبكاتەوە و ناكۆكی و جیاوازیەكانیان بۆ یەكلابكاتەوە و بەرهەڵستییە روواڵەتییەكانی نێوانیان هەڵبگرێت، هاوەڵانیش پابەند دەبوون بە سنووری فەرمانەكان و نەهییەكانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) و لە كار و كردە و عیبادەت و مامەڵەكانیاندا شوێنی دەكەوتن، مەگەر بیانزانیبایە ئەوە تایبەتە بە پێغەمبەری خودا(ﷺ).

ئەوان حوكمەكانی نوێژ و پایە و شێوەی نوێژیان لێوە فێردەبوون و پێغەمبەر(ﷺ) پێی دەفەرموون: ((بەو جۆرە نوێژ بكەن وەك بینیتان من نوێژ دەكەم))[1].

هەر بەو جۆرە مەناسیكی حەجیان لێ وەردەگرت و دەیفەرموو: ((مەناسیكی حەج لە منەوە وەربگرن))[2].

[1] أخرجه البخاري.

[2] أخرجه مسلم.

پێغەمبەر(ﷺ) گەر بیزانیبایە یەکێك لە هاوەڵان شوێنی ناکەوێت لە یەکێك لەو کارانەی ئەو ئەنجامی دەدات ئەوا توورە دەبوو، مالیك لە **"الموطأ"** لە عەتای کوڕی یاسرەوە دەگێڕێتەوە: پیاوێك لە هاوەڵان ژنەکەی نارد بۆ ئەوەی پرسیار بکات دەربارەی ماچکردنی هاوسەری خۆ لە کاتی رۆژوودا، ئوم سەلەمە(خوا لێی رازی بێت) هەواڵی پێدا پێغەمبەر(ﷺ) ماچی کردووە و بەڕۆژوو بووە، ژنەکە گەڕایەوە بۆ لای پیاوەکەی و هەواڵی پێدا، ئەویش وتی: من وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) نیم، ئەوەی خودا بیەوێت بۆ پێغەمبەرەکەی حەڵاڵ دەکات، ئەو قسەیە بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەیشتەوە و توورە بوو و فەرمووی(ﷺ): ((من بۆ خودا لە هەمووتان زیاتر خۆپارێزم و لە هەمووتان زۆرتر زاناترم بە سنوورەکانی خودا))[1].

شوێنکەوتنیان بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەیشتبووە رادەیەك ئەوەی ئەو بیکردبایە ئەوانیش دەیانکرد و ئەوەی ئەو وازی لێ بهێنابایە وازیان لێ دەهێنا، بوخاری لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەر(ﷺ) مۆرئەنگوستیلەیەکی لە زێڕ دروست کرد، خەڵکیش ئەنگوستیلەکانیان کرد بە ئاڵتوون، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) نەیکردە دەستی و فەرمووی: ((من هەرگیز لە دەستی ناکەم)) هەموو خەڵکی بەدوایدا ئەنگوستیلەکانیان لە دەستیان داکەند.

هەروەها **"القاضي عیاض"** لە کتێبی **"الشفاء"**دا لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە(خوا لێی رازی بێت) دەگێڕێتەوە فەرمووی: ((پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی بە هاوەڵانی دەکرد، نەعلەکانی داکەند و خستییە لای چەپییەوە، کاتێك ئەوانەی لەگەڵی بوون ئەوەیان بینی نەعلەکانیان داکەند، کاتێك نوێژەکەی تەواو کرد فەرمووی: چی وایلێکردن نەعلەکانتان دابکەنن؟

فەرموویان: تۆمان بینی نەعلەکانت داکەند، ئەویش فەرمووی: جبریل هەواڵی پێدام نەعلەکان پیسییان پێوەیە)).

هاوەڵانی پێغەمبەر(خوایان لێ رازی بێت) لە ژیاندا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بەم جۆرە بوون، گوفتار و کردار و دانپیادانانی ئەویان بە حوکمی شەرعی دەزانی و هیچ کام

---

[1] أخرجه مسلم.

لەوان جیاوازیان لەسەر ئەوە نەبوو، بەڵکو هیچ کام لـەوان رێگـەی بـە خـۆی نـەدەدا فەرمانی قورئان پێشێل بکات، ئەوان تەنها لە کارە دونیاییەکاندا قسەیان هەبوو، گەر بیانزانیبایە کردار و قسەکەی پێغەمبەر(ﷺ) تەنها ئیجتیهادێکە لە ئەوەوە.

وەك لە غەزوەی بەدردا حەبابی کوڕی مونزیر(خـوا لێـی رازی بێـت) پرسـیاری لـە پێغەمبەری خودا کرد (ﷺ) و پێشنیاری شوێنێ باشتری بۆ دیاری کردنی شوێنی سوپاکە کرد، یان ئیجتیهادێك بێت لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) دەربارەی ئەمرێکی ئایینی بەر لە پشتیوانی لێکردن یان نەهی لێکردنی لەلایەن وەحییەوە، وەك قسـەی عومـەر(خوا لێی رازی بێت) لەسەر دیلـەکانی غـەزوەی بـەدر و هـەروەها قسـەی ئـەو دەربـارەی ئاشتەوایی حودەیبییە، یان شتەکە بە ئەقڵیان نامۆ بوایە لەو بارەدا بۆ تێگەیشـتن لـە حیکمەتەکەی گفتوگۆیـان دەکـرد، یـان وا گومانیـان بردبایـە کـارێکی تایبەتـە بـە پێغەمبەر(ﷺ) و وایان بزانیبایە شوێنکەوتنی ئەو کارە بۆ ئەوان پێویست نییـە، یـان فەرمانی پێبکردنایە و پێیان وابووبێت فەرمانەکە بۆ موباحبوونە، جگە لەمانە هاوەڵان بەرەهایی خۆیان رادەست کردبوو و بەتەواوی شوێنی پێغەمبەری خودا(ﷺ) کەوتبوون.

## پێویستبوونی گوێڕایەڵی پێغەمبەری خودا(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەدوای مردنی:

وەك چۆن قورئان فـەرمانی کـردووە بـە پێویسـتبوونی گوێڕایـەڵی لـە پێغەمبـەری خودا(ﷺ) لە ژیانیدا بە هەمان شێوە لەسـەر موسـڵمانانی پێویسـت کـردووە شـوێنی سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) بکەون لـەدوای مردنـی، چـونکە ئـەو دەقانـەی گوێڕایـەڵی پێغەمبەریان لە ژیانیدا پێویست کـردووە گشـتین و لـە ژیـانی ئـەودا(ﷺ) سـنووردار نەکراون و تەنها تایبەت نەبوون بە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە(خوایان لێ رازی بێت).

هەروەها لەبـەر ئـەوەی هۆیەکـە کۆکـەرەوەی نێـوان هـاوەڵان و موسـڵمانانی دوای هاوەڵانە، چـونکە ئـەوان شـوێنکەوتەی پێغەمبـەری خـودان(ﷺ) بـە شـوێنکەوتن و گوێڕایەڵی لێی.

هەروەها هۆیەکە کۆکەرەوەی نێـوان ژیـانی پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) و دوای مردنـی پێغەمبەری خودایە(ﷺ)، چونکە گوفتار و حـوکم و کـرداری ئـەو(ﷺ) لـە کەسـێکی

مەعسـوومەوە سەرچـاوەیان گرتـووە، ئـەو مەعسـوومەی خـودا فـەرمانی داوە فەرمانەکانی جێبەجێ بکرێت، بۆیە حاڵەکە جیاوازی ناکات لە نێوان ژیان و مردنی.

پێغەمبەر(ﷺ) ڕێنموونی کردووین بۆ پێویستی شوێنکەوتنی سـوننەتەکەی کاتێـك موسڵمان لـە پێغەمبـەر(ﷺ) بـزر دەبێـت و لـەلای ئامـادە نابێـت، پێغەمبـەر(ﷺ) مەعازی کوڕی جەبەلی ڕەوانەی یەمەن کرد و پێی فـەرموو: ((کاتێـك قـەزاوەتێکت بۆ هاتە پێش چۆن بڕیاری لێدەدەی؟ فەرمووی: بە کتێبەکەی خودا قـەزاوەت دەکـەم، فەرمووی: گەر لە کتێبەکەی خـودادا نـەبوو؟ فـەرمووی: بـە سـوننەتی پێغەمبـەری خودا، فەرمووی: گەر لە سوننەتی پێغەمبەری خودادا نـەبوو؟ فـەرمووی: ئیجتیهـاد دەکەم و زیادەڕەویی ناکەم، پێغەمبەر(ﷺ) کێشای بە سـنگی مـەعازدا و فـەرمووی: حەمد بۆ ئـەو خودایـەی نێراوەکـەی پێغەمبـەری خـودای لـە ڕازی کردنـی خـودا و پێغەمبەری خودادا سەرکەوتوو کردووە))[1].

هاندان بۆ کارکردن بە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) لەدوای مردنـی لـە ژمارەیـەکی زۆر فـەرموودەدا هـاتووە و گەیشـتوونەتە ڕادەی تـەواتوری مەعنـەوی، لەوانـە ئـەو فـەرموودەی "الحـاكم وابـن عبـدالبر" لـە ئـەبو هورەیرەوە(خـوا لێـی ڕازی بێـت) دەیگێڕنەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: ((دوو ئەمرم لەناوتاندا بەجێهێلاوە گەر دەستیان پێوە بگرن گومڕا نابن: کتێبەکەی خودا و سوننەتەکانم))[2].

هەروەها بوخاری و حاکم لە ئەبی هورەیرەوە دەگێڕنەوە لە پێغەمبـەری خـوداوە(ﷺ) فەرموویەتی: ((هەموو ئومەتەکەم دەچنە بەهەشـتەوە جگـە لـە کەسـێك نایـەوێت، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، کێ نایەوێت؟ فەرمووی: هەرکەس گوێڕایەڵیم لێ بکات دەچێتە بەهەشتەوە، و هەرکەس لێم یاخی ببێت ئەوە نایەوێت))

هـەروەها "الحـاكم" لـە ئـیبن عەباسـەوە(خوا لێیـان ڕازی بێـت) دەگێڕێتـەوە پێغەمبەر(ﷺ) لە وتاری حەجی ماڵئاواییـدا فـەرمووی: ((شـەیتان بێهیـوا بـووە لـە

[1] أخرجه أحمد، وأبو داود، والترمذي، والدارمي، والبيهقي، وابن سعد.
[2] جامع بيان العلم ٢/٢٤.

زەوییەکەی ئێوەدا بپەرسترێت...لەناو ئێوەدا –دوو شتم–بۆ بەجێهێڵاون گەر دەستی پێوە بگرن هەرگیز گومڕا نابن: کتێبەکەی خودا و سوننەتەکانی پێغەمبەری خودا))

هەروەها "ابن عبد البر" لە **"عرباض بن سارية"**ەوە دەگێڕێتەوە فەرمووویەتی: پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی بەیانی پێ کردین، ئامۆژگارییەکی کاریگەری کردین کە چاوەکان هاتنە گریان و دڵەکان هاتنە لەرزین، وترا: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەڵێی ئامۆژگاری ماڵئاواییمان لێ دەکەی وەسێتمان بۆ بکە، فەرمووی: ((ئاگاتان لە گوێڕایەڵی بێت گەر بەندەیەکی حەبەشیش بێت، گەر کەسێك لە ئێوە بمێنێت جیاوازی زۆر دەبینێت، ئاگاداری سوننەتەکانی من و سوننەتەکانی خەلیفەکانی راشیدینی خاوەن هیدایەت بن، توند دانی پیادا بگرن، ئامان ئاگاتان لەو شتانە بێت سەرهەڵدەدەن، چونکە هەموو بیدعەیەك گومڕاییە))[1].

لەو پێناوەدا هاوەڵان گرنگیان دا بە گەیاندنی سوننەت، چونکە ئەمانەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو بۆ نەوەکانی داهاتوو لە دوای ئەو، پێغەمبەر(ﷺ) هانیداون لەدوای ئەو زانست بگەیەنن بەو فەرموودەی دەفەرموێت: ((رەحمەتی خودا لە کەسێك قسەکانم دەبیستێت و وەك چۆن بیستوویەتی دەیگێڕێتەوە، لەوانەیە ئەو کەسەی پێیدەگات هۆشیارتر بێت لەو کەسەی لە منی بیستووە))[2].

## هاوەڵان چۆن سوننەتی پێغەمبەریان وەردەگرت(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟

پێغەمبەر(ﷺ) لەناو هاوەڵانیدا دەژیا بەبێ ئەوەی پەردە بخاتە نێوان خۆی و ئەوان، لە مزگەوت و بازاڕ وماڵەوە و سەفەر و نیشتەجێبووندا تێکەڵیان دەبوو، کردارەکان و گوفتارەکانی جێگەی رێز و گرنگی پێدانی ئەوان بوو، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) خولگەی ژیانی ئایینی و دونیایی ئەوان بوو، لەو کاتەوە خودا بەهۆی ئەوەوە هیدایەتیدان و لە تاریکی و گومڕایی رزگاری کردن بۆ نوور و هیدایەت، سووربوون و لێبڕانیان بۆ گوفتارەکان و کردارەکانی پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتبووە ئاستێك هاوەڵان بە نۆرە رۆژ

---

[1] و أخرجه الترمذي وأبو داود والإمام أحمد وابن ماجة.

[2] وأخرجه ابن حبان في صحيحه وأبو داود والترمذي وحسنه، والنسائي وابن ماجة والبيهقي.

نارۆژێك پابەندی دانیشتنەکانی دەبوون، ئەوە عومەری کوڕی خەتاب(خوا لێی رازی بێت) ئیمامی بوخاری بە سەنەدێکی لکاو (سند متصل) بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ((من و جیرانێکم لە ئەنصار لە بەنی ئومەیەی کوڕی زەید-کە لە سەرەوەی مەدینە بوو- بە نۆرە دەچووین بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، ئەو رۆژێك دادەبەزی بۆ لای و منیش رۆژێك دادەبەزیم بۆ لای، گەر من دابەزیمایە هەواڵی ئەو رۆژەم بۆ دەهێنایەوە، گەر ئەویش دابەزیبایە هەمان کاری ئەنجام دەدا)).

ئەمە بەڵگەیە لەسەر تێڕوانینی هاوەڵان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) بە تێڕوانینی شوێنکەوتن و ڕێنموونی بە قسەکانی و کردارەکانی، ئەوەش لەبەر ئەوەی لەلایان شوێنکەوتنی ئەو(ﷺ) و وەرگرتنی ئەمر و نەهییەکانی پێویست بوو، بۆیە هۆزە دوورەکان لە مەدینە هەندێ کەسی خۆیان رەوانەی مەدینە دەکرد بۆ ئەوەی حوکمەکانی ئیسلام لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فێربن و پاشان وەك مامۆستا و ڕێنموونیکار بگەڕێنەوە بۆ لایان.

بەڵکو هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) هەبووە رێگەیەکی زۆر دووری بڕیوە تاکو لە حوکمێکی شەرعی پرسیار لە پێغەمبەر(ﷺ) بکات، ئیمامی بوخاری لە سەحیحەکەیدا دەگێڕێتەوە لە عوقبەی کوڕی حاریسەوە، ژنێك هەواڵی پێدا شیری داوە بە ئەو و ژنەکەی، یەکسەر سواری وڵاخێك بوو و لە مەککەوە هات بۆ مەدینە تا گەیشتە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەربارەی حوکمی خودا لەمەڕ پیاوێك خوشکی شیری خۆی هێنابێت و نەزانێت لە شیرەوە خوشکییەتی پرسیاری کرد، پاشان هەواڵی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی ئەو ئافرەتەی شیری بە هەردووکیان داوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: چۆن دەبێت، لە کاتێکدا ئەو حوکمە وتراوە؟ بۆیە هەر ئەو کاتە ژنەکەی لە پیاوەکە جیاکردەوە و مێردی بە پیاوێکی تر کرد.

ئەوان بەهەمیشەیی دەچوون بۆ لای خێزانەکانی پێغەمبەری خودا(خوایان لێ رازی بێت) بۆ ئەوەی پرسیاریان لێ بکەن دەربارەی هەڵسوکەوتی پیاو لەگەڵ ژنەکەی، وەك ئەو نموونەی باسمان کرد دەربارەی ماچکردنی ئافرەت لە لایەن پیاوەکەیەوە لە کاتی رۆژوودا و وەرگرتنی وەڵامەکەی لە دایکی باوەڕدارانەوە ئوم سەلەمە(خوا لێی رازی بێت) و هەواڵدانی بەوەی پێغەمبەر لە رۆژوودا ماچی دەکرد.

هەر بەو جۆرە هاوەڵان لە ژنان دەچوون بۆ لای پێغەمبەری خودا و پرسیاری خۆیان دەکرد، گەر وەڵامێك هەبوایە پێغەمبەر(ﷺ) نەیتوانیبایە بیڵێت بە یەکێك لە هاوسەرەکانی خۆی دەوت و ئەوانیش ژنانیان تێدەگەیاند، وەك هاتنی ئەو ئافرەتەی هات و پرسیاری ئەوەی کرد چۆن لە بێنوێژی(یان خوێنی حەیز) خۆی پاك رابگرێت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: دەستنوێژ بە پارچە لۆکەیەك بگریت، ئافرەتەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، چۆن دەستنوێژی پێ بگرم؟ پێغەمبەر(ﷺ) هەمان قسەکەی دووبارە کردەوە و ئافرەتەکە تێنەگەیشت، بۆیە ئاماژەی بە عائشە(خوا لێی رازی بێت) کرد ئەوەی دەیەوێت تێیبگەیەنێت، ئەویش مەبەستەکەی حاڵی کرد کە بریتییە لە هەڵگرتنی گوڵە لۆکەیەکی پاك بۆ ئەوەی خوێنەکەی پێ بسڕێت[١].

هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) هەموویان لە یەك ئاستی زانیندا نەبوون بە حاڵ و گوفتار و رەفتاری پێغەمبەر(ﷺ)، کۆبوونەوەی گشتی جگە لە رۆژی هەینی و جەژنەکان و هەندێ بوونە بوونی نەبووە تا هەموویان کۆببنەوە و وەکو یەك زانست وەربگرن.

ئیمامی بوخاری لە ئیبن مەسعوودەوە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ((پێغەمبەر(ﷺ) لە چەند رۆژێکدا ناوبەناو ئامۆژگاری دەکردین لە ترسی ئەوەی تووشی شەکەتی نەبین)).

لێرەدا مەسروق دەڵێت: لەگەڵ هاوەڵانی محەمەد(ﷺ) دانیشتم، بینیم وەك جۆگەلەیەك وان، هەیانبوو یەك کەسی پاراو دەکرد، هەیانبوو دوو کەس، هەیانبوو دە کەس، هەیانبوو سەد کەس، هەشیانبوو گەر هەموو ئەهلی زەوی رووی لێبکردبایە پاراوی دەکرد، بۆیە ئاساییی بوو زۆرترین زانست بە سوننەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لای ئەوانە بێت پێشتر موسڵمان بوون وەك خەلیفەکانی راشیدین و عەبدوڵای کوڕی مەسعوود(خوایان لێ رازی بێت)، یان لە هەموان زیاتر پابەندی پێغەمبەر(ﷺ) بووبن و شتیان لێوە نووسی بێت وەك ئەبو هورەیرە و عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص(خوایان لێ رازی بێت).

---

[١] أخرجه البخاري ومسلم والنسائي عن عائشة.

**بۆچی سوننەت لە سەردەمی پێغەمبەردا(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تۆمار نەکرا؟ ئایا لە ژیانی پێغەمبەردا(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هیچی لێ نووسرایەوە؟**

دوو کەس لە نووسەرانی سیرە و زانایانی سوننە و جمهوری موسڵمانان ناکۆکییان نییە لەوەدا قورئان لەلایەن پێغەمبەر و هاوەڵانەوە گرنگی زۆری پێدراوە، تا لە سینەی هاوەڵاندا لەبەرکراوە و لە لاپەڕەکاندا تۆمارکراوە، پێغەمبەر کۆچی دوایی کرد و قورئان هەمووی پارێزراو بوو و تەنها کۆکردنەوەی پێویست بوو لە یەك مەسحەفدا.

بەڵام سوننەت بەو جۆرە نەبوو، لەگەڵ ئەوەی سەرچاوەیەکی گرنگ بوو لە سەرچاوەکانی تەشریع لە سەردەمی پێغەمبەردا، ناکۆکیش لەسەر ئەوە نییە سوننەت بەشێوەیەکی فەرمی تۆمارنەکراوە وەك چۆن قورئان تۆمار کرا، لەوانەیە هۆی تۆمارنەکردنەکە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە پێغەمبەر(ﷺ) بیست و سێ ساڵ لە ناو هاوەڵانیدا ژیاوە و تۆمارکردنی قسەکانی و کردارەکانی و مامەڵەکردنەکانی بە شێوەیەکی پارێزراو لە لاپەڕەکاندا کارێکی گران و ئەستەم بوویێت، ئەوەش لەبەر ئەوەی پێویست بوو خەڵکانێکی زۆر لە هاوەڵان خۆیان یەکلابکەنەوە بۆ تۆمارکردنی ئەو کارە گرانە، ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە نووسەران لە سەردەمی پێغەمبەردا ژمارەیان کەم بوو و لە پەنجەی دەست تێنەدەپەڕین، لەبەر ئەوەی قورئان سەرچاوەی یەکەمی بنەڕەتی تەشریعە و ئەو موعجیزە نەمرەیە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە بۆیە پێویست بوو نووسەران خۆیان بۆ نووسینەوەی یەکلابکەنەوە، تاکو بە سەرنووسکراوی و پارێزگاری تەواوە رادەستی ئەوانەی دوای خۆیان بکەن و پیتێکی لێ کەم نەکات.

**شتێکی تر هەیە:** عەرەب بە هۆی نەخوێندەوارییانەوە تەنها شانیان لەسەر بیر و زەین دەدا بۆ لەبەرکردن، لەبەر ئەوەی قورئان ناوبەناو و بڕبڕ دادەبەزی لەبەرکردنی بۆیان ئاسان بوو، گەر سوننەت تۆماربکرابایە وەك چۆن قورئان تۆمار کرا ئەوا بارگرانییەکی گەورە لەسەریان دروست دەبوو، جگە لەوەی ئەگەری ئەوە هەبوو تێکەڵییەك لە نێوان فەرموودە کورت و پڕ لە حیکمەتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) و قورئاندا سەریهەڵبدابایە بە هۆی لەبیرچوون و پەیپێنەبردنەوە.

لێرەوە تێدەگەین بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) نەهی کردووە لە تۆمـارکردنی سـوننەت وەك لەو فەرمـوودەی سەحیحی "مسلم"دا هاتووە: ((لە منەوە هیچ مەنووسن، هەر کـەس جگە لە قورئان شتێکی لە منەوە تۆمار کردووە با بیسڕێتەوە))

ئەمە ڕێگری ناکات لەوەی لە چاخی پێغەمبەردا(ﷺ) کەسانێك هـەبووبن سـوننەیان تۆمار کردبێت نەك بە شێوەیەکی فەرمی وەك چۆن قورئـان تۆمـار دەکـرا، ئیمـامی بوخاری لە سەحیحەکەیدا فەرموودەیەکی هێناوە: خوزاعە پیاوێکیان لە بـەنی لـەیس کوشت لە خوێنی پیاوێکی کوژراویاندا، ئەو هەواڵە بە پێغەمبەر(ﷺ) گەیشت، سواری وڵاخەکەی بوو و خوتبەیەکی بۆ دان و فەرمووی: ((خودا "کوشتنی یان فیلی" شکەکە لە بوخارییەوەیە- لـە مەککـە بەنـد کـرد، و پێغەمبـەر و بـاوەڕدارانی بەسـەریاندا سەرخست، بۆ هیچ کەسێکی پێش من و هیچ کەسێکی دوای مـن ئـەم کـارە حـەڵاڵ نییە.......)) پیاوێك لە ئەهلی یەمەن هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئـەوەم بۆ بنووسە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بۆ "ئەبی شاهی" بنووسن.

هەر بـەو جـۆرە لـە پێغەمبـەرەوە(ﷺ) جـێگیر بـووە نووسـراوی بـۆ مەلیکـەکان و ئەمیرەکانی نیمچە دوورگەی عەرەبی ناردووە و بانگی کردوون بۆ ئیسلام، هەروەها بۆ هەندێ لە سریەکانی نووسراوێکی دەنووسی و دەیفـەرموو: نەیخوێننـەوە تـا لـە فـلان شوێن تێدەپەڕن.

بە هەمان شێوە سەلماوە هەندێ لە هاوەڵان لاپەڕەی تایبەت بە خۆیان هەبووە لەمـەڕ ئەو فەرموودانەی لە پێغەمبەریان بیستووە وەك لاپـەڕەی عەبـدوڵای کـوڕی عـەمری کوڕی عاص کە ناوی نابوو "**الصادقة**"، ئیمام ئەحمەد و "**البيهقـي**" فەرموودەیـەکیان دەرهێناوە لە ئەبو هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت) دەفەرموێت: ((هیچ کەس وەکو من زاناتر نەبووە بە فەرموودەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) جگە لە عەبدوڵای کـوڕی عـەمر، ئەو دەینووسی، بەڵام من نەمدەنووسی)).

نووسینی فەرموودە لە لایەن عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە سەرنجی هەندێ لە هـاوەڵانی ڕاکێشـا و پێیـان وت: تـۆ هەرچـی پێغەمبـەر(ﷺ) دەیفـەرموێ دەینووسـیتەوە! پێغەمبەر(ﷺ) هەندێ جار تـووڕە دەبێـت و شـتێك دەفـەرموێ ناکرێتـە شـەرعێکی

گشتی، بۆیە ئیبن عەمر گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و قسەکەی بۆ گێڕایەوە و ئەویش فەرمووی: ((لە منەوە بنووسە، سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە تەنها حەق لە دەمم دەردەچێت)) [1].

هەر بەو جۆرە جێگیر بووە عەلی(خوا لێی رازی بێت) لاپەڕیەکی لەلا بوو حوکمەکانی "دیە"ی تێدا تۆمار کرد بوو، هەروەها جێگیر بووە پێغەمبەر(ﷺ) بۆ هەندێ لە کارمەندان نووسراوێکی نووسیوە و بڕی زەکاتی لە حوشتر و مەڕ و مالآت تێدا تۆمار کرد بوو.

**زانایان جیاوازیان هەیە** دەربارەی تەبایی نێوان ئەو دوو فەرموودەی کە یەکێکیان نەهی لە نووسین دەکات و ئەویتریان فەرمان بە نووسین دەکات، زۆرینەیان لەسەر ئەوەن نەهی لە نووسین بە فەرمان بە نووسین نەسخکراوەتەوە، هەیانە دەڵێت: نەهییەکە بۆ ئەو کەسانە بووە هەڵە و تێکەڵکردنی لە نێوان قورئان و فەرموودە لێ بەدوور نەگیراوە، مۆڵەتیش تایبەت بووە بەوانەی هەڵە و تێکەڵکردنی لە نێوان قورئان و فەرموودە لێ بەدوورگیراوە.

**بە باوەڕی من** ناکۆکی و بەرهەڵستی راستەقینە لە نێوان ئەو دوو فەرموودەدا بوونی نییە گەر نەهی وا تێبگەین نەهیکردنە لە تۆمارکردنی فەرمی وەك چۆن قورئان تۆمار دەکرا، مۆڵەتپێدانەکەش بریتییە لە تۆمارکردنی هەندێ دەقی سوننەت بەهۆی رەوش و هەلومەرجی تایبەتەوە، یان رێگەدان بە هەندێ لە هاوەڵان کە سوننەتیان بۆ خۆیان تۆمار دەکرد، تێڕامان لە دەقی نەهییەکە دەمانگەیەنێتە ئەم سەرئەنجامە، چونکە گوتارەکەی روو بە هەموو هاوەڵانە، نابێ بوترێت گەر بەو جۆرە بێت ئەوە پێویستە حوکمەکە لەسەر حەرامکردن بمێنێتەوە(واتە تۆمار نەکردنی سوننەت) گەر تەنها بۆ رەوشێکی تایبەت و کەسانێکی تایبەت رێگە بە تۆمارکردنی سوننەت درابێت، چونکە رێگەدان بە عەبدوڵای کوڕی عەمر بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نووسنی سوننەت رێگەپێدراو بووە لە دیدگای پێغەمبەرەوە(ﷺ) گەر تۆمارکردنێکی گشتی نەبێت وەك تۆمارکردنی قورئان.

---

[1] أخرجه ابن عبدالبر في جامع بيان العلم ٧٦/١.

ئەوەی پشتیوانی مۆڵەتدان دەکات بە نووسین ئەو فەرموودەیە ئیمامی بوخاری ریوایەتی دەکات لە ئیبن عەباسەوە: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) نەخۆشی و ئازارەکەی لێ توند بوویەوە فەرمووی: ((قەڵەم و پەڕەم بۆ بهێنن تا نووسراوێکتان بۆ بنووسم لەدوای ئەوە گومڕا نەبن)) بەڵام عومەر(خوا لێی رازی بێت) بە بیانووی ئەوەی ئازارەکەی زاڵ بووە بەسەریدا رێگری لەو کارە کرد، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مۆڵەتدان بەدوای نەهیلێکردنەکەدا هاتووە، نەك بەو جۆرەی خودا لێی خۆشبێت رشید رەزا بۆی دەچێت گوایە یەکەم جار مۆڵەت دراوە و پاشان بە نەهی نەسخکراوەتەوە.

**هەڵوێستی هاوەڵان لە فەرموودە دوای مردنی پێغەمبەری خودا**صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

**"أبو داود و الترمذي"** لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموودەیەك دەگێڕنەوە کە فەرموودەکە زەیدی کوڕی سابیت دەیگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((خودا رووی کەسێك سوور بکات(یان رووی سپی بکات) قسەکانم دەبیستێ و لەبەری دەکات و تێیدەگات و وەك چۆن بیستوویەتی دەیگەیەنێت، لەوانەیە ئەو کەسەی پێیدەگات لە بیسەرەکە هۆشمەندتر بێت))، بەم جۆرە پێغەمبەر(ﷺ) وەسێتی بۆ هاوەڵانی خۆی کرد سوننەت بگەیەنن بەوانەی دوای خۆیان لەگەڵ وردەکاری لەوەی دەیگێڕنەوە.

هەروەها دەفەرموێت: ((بەسە درۆ بۆ کەسێك هەموو ئەوەی دەیبیستێ بیکات بە قسە(بیگێڕێتەوە)))، هاوەڵان هیچ چارێکیان نەبوو جگە لە گەیاندنی ئەمانەتەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بە موسڵمانانی دوای خۆیان، بەتایبەت دوای ئەوەی بە وڵاتاندا هاوەڵان بڵاوەیان کرد و شوێنکەوتووان لە دەوریان کۆبوونەوە.

هاوەڵان لە گێڕانەوەی فەرموودەدا جیاوازیان لە نێواندا هەبوو، ئەوانەی زۆر بە کەمی فەرموودەیان لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە: **"الزبیر، وزید بن أرقم، وعمران بن الحصین"**.

لە عەبدوڵای کوڕی زوبێرەوە دەگێڕنەوە بە باوکی خۆی وتووە: بۆ نابینم فەرموودە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) بگێڕیتەوە وەك چۆن فلان و فلان دەیگێڕنەوە؟ ئەویش

فەرمووی: بزانە من لە پێغەمبەر(ﷺ) جیانەبوومەتەوە، بەڵام گوێم لێ بوو دەیفەرموو: ((هەر کەس درۆ بە دەممەوە بکات با لە دۆزەخدا پاڵ بداتەوە))[1].

سائیبی کوڕی یەزید دەگێڕێتەوە و دەڵێت: هاوەڵی سەعدی کوڕی مالیك(ئەبو سەعیدی خودری)م کرد لە مەدینەوە بۆ مەککە، نەمبیست لە پێغەمبەری خوداوە تەنها یەك فەرموودە بگێڕێتەوە، لە کاتێکدا ئەنەسی کوڕی مالیك فەرموودە بەدوای فەرموودەدا لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەیگێڕایەوە، پاشان دەیفەرموو: "أو کما قال" لە ترسی ئەوەی نەبادا کەوتبێتە هەڵەیەکەوە مەبەستی نەبووبێت، لێرەوە دەردەکەوێت بیر و یادەوەریان بەو ئەندازەیە نەبووبێت فەرموودەکە بە وشەی خۆی و بەو جۆرەی لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) بیستبوویان بیگێڕنەوە، بۆیە بۆ ئاییینی خۆیان وایان بەباش دەبینیێ فەرموودەی زۆر نەگێڕنەوە.

هەروەها لەوانەی فەرموودەی زۆریان گێڕاوەتەوە ئەبو هورەیرە و ئیبن عەباسن(خوایان لێ رازی بێت)، "إبن عبد البر" لە ئیبن شیهابەوە لە ئیبن عەباسەوە دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((فەرموودەمان لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) پێ دەگەیشت، گەر بمویستبایە بنێرم لە دووی تاکو بێت و فەرموودەکەم بۆ بگێڕێتەوە ئەو دەهات، بەڵام بۆخۆم دەچووم بۆ لای و لەبەر دەرگاکەی دەوەستام تا بۆ لام دەهاتە دەرەوە و فەرموودەکەی بۆ دەگێڕامەوە))[2].

هەرچۆنێك بێت گێڕانەوەی فەرموودە لە سەردەمی خەلافەتی ئەبوبەکر و عومەردا(خوایان لێ رازی بێت) کەم بوو، ئەوەش بۆ وردەکاری گێڕانەوەی فەرموودە و گرنگیدان بە قورئان دەگەڕێتەوە، بە ئەبو هورەیرە(خوا لێی رازی بێت) وترا: ئایا تۆ لە سەردەمی عومەردا بەم جۆرە فەرموودەت دەگێڕایەوە؟ فەرمووی: گەر لە سەردەمی عومەردا وەك چۆن ئێستا فەرموودە دەگێڕمەوە بۆ ئێوە فەرموودەم باسبکردبایە بە عەساکەی لێی دەدام))[3].

---

[1] أخرجه البخاري في صحيحه.

[2] جامع بيان العلم ٩٤/١.

[3] جامع بيان العلم ١٢٠/٢.

**لێرەدا پێویستە لا بەلای دوو باسدا بکەینەوە دەربارەی هەڵوێستی عومەر (خوا لێی رازی بێت) لە فەرموودە و هەڵوێستی کەسانی تریش:**

**یەکەم: ئایا عومەر هیچ کەس لە هاوەڵانی بەند کرد بە هۆی گێڕانەوەی فەرموودەی زۆرەوە؟**

**دووەم: ئایا هاوەڵان مەرجیان دادەنا بۆ وەرگرتنی ئەو هەواڵانەی هاوەڵان دەیانگێڕایەوە؟**

## ئایا عومەر هیچ کەس لە هاوەڵانی بەند کرد بە هۆی گێڕانەوەی فەرموودەی زۆرەوە؟

ئەوەی لەسەر زمان بەناوبانگە گوایە عومەر(خوا لێی رازی بێت) سێ هاوەڵی پێغەمبەری بەند کردووە بە هۆی ئەوەی فەرموودەی زۆریان لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) باسکردووە، ئەو سیانەش: **"عبدالله بن مسعود و أبو الدرداء و أبو ذر"** (خوایان لێ رازی بێت) بوون، زۆر هەوڵمدا سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو بۆ ئەو ریوایەتە ببینمەوە بەڵام بوونی نەبوو، بەڵگەی هەڵبەستن بەئاشکرا پێیەوە دیارە، بەتایبەت **ئیبن مەسعوود**(خوا لێی رازی بێت) یەکێکە لە هاوەڵە مەزنەکانی پێغەمبەرر(ﷺ) و پلە و پایەیەکی گەورەیی لای عومەر(خوا لێی رازی بێت) هەبووە، کاتێك رەوانەی کرد بۆ عێراق منەتی بەسەر ئەهلی عێراقدا کرد بە ناردنی عەبدوڵا بۆ لایان و فەرمووی: ((**عەبدوڵام بۆ ئێوە بەسەر نەفسی خۆمدا پێشخست**))، لە ماوەی خەلافەتی عومەردا مانەوەی ئیبن مەسعوود لە عێراق بوو، رەوانەکردنەکەشی بۆ عێراق بۆ ئەوە بوو خەڵکی ئەو وڵاتە فێری ئایین و حوکمەکانی بکات، حوکمەکانیش بەشێکی لە قورئاندا بووە و بەشێکی لە سوننەتدا ئیتر چۆن عومەر ئیبن مەسعود(خوایان لێ رازی بێت) بەند دەکات؟

ئەوانەی فەرموودەی زۆریان لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە وەك ئیبن عەباس و ئەبو هورەیرە و جابری کوڕی عەبدوڵا و عائشە(خوایان لێ رازی بێت) باسی ئەوە نەکراوە عومەر بەندی کردبن، بەڵکو ریوایەت کراوە: عومەر بە ئەبو هورەیرەی وت-کاتێك فەرموودەی زۆری دەگێڕایەوە-: ئایا تۆ لەگەڵمان بووی کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لە فلان

شوێن بوو؟ فەرمووی: بەڵێ، گوێم لێ بوو دەیفەرموو: ((هەر کەس بەئەنقەست درۆم بە دەمەوە بکات با شوێنی خۆی لە ئاگردا خۆشبکات))، عومەر پێی فەرموو: مادام ئەوەت لەبیرە برۆ و فەرمووده بگێڕەوە، ئیتر چۆن ڕێگە بە ئەبو هورەیرە دەدات فەرمووده بگێڕێتەوە و ئیبن مەسعوود بەند دەکات؟!

## ئایا هاوەڵان هیچ شتێکیان بە مەرج دەگرت بۆ وەرگرتنی ئەو هەواڵانەی دەیانگێڕایەوە؟

**چەند ریوایەتێك لەم بارەیەوە دەگوێزینەوە:**

١. زەهەبی لە **"تذكرة الحفاظ"**دا و لە ژیاننامەی ئەبوبەکردا(خوا لێی رازی بێت) دەڵێت: ((یەکەمین کەس وریایی و ئاگاهی بۆ قبوولّ کردنی هەوالّ بەکارهێنا ئەبوبەکر بوو، پاشن زەهەبی لە ڕێگەی ئیبن شیهابەوە لە قەبیصەوە دەگێڕێتەوە داپیری هات بۆ لای ئەبوبەکر داوای لێکرد میرات وەربگرێت، ئەبوبەکر فەرمووی: لە کتێبەکەی خودادا شتێك بۆ تۆ نابینمەوە، هەروەها لە سوننەتی پێغەمبەری خوداشدا(ﷺ) شتێکت بۆ باس نەکراوە، پاشان ئەبوبەکر پرسیاری لە خەڵکی کرد، موغییرە هەستا و وتی: پێغەمبەر(ﷺ) شەشیەکی پێ دەدا، ئەبوبەکر فەرمووی: هیچ کەسێکت وەك شایەت لەگەڵە؟ محەمەدی کوڕی مەسلەمە بە هەمان فەرمووده شایەتی بۆ دا، ئەبوبەکریش جێبەجێی کرد بۆی.

٢. لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە(خوا لێی رازی بێت): ((ئەبو موسای ئەشعەری(خوا لێی رازی بێت) لە پشتی دەرگاوە سێ جار سەلامی لە عومەر(خوا لێی رازی بێت) کرد، عومەر مۆڵەتی نەدا بۆیە گەڕایەوە، عومەر ناردی بەدوایدا و پێی فەرموو: بۆ گەڕایتەوە؟ فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو(ﷺ) دەیفەرموو: ((گەر یەکێك لە ئێوە سێ جار سەلامی کرد و وەڵامی نەدرایەوە با بگەڕێتەوە))

عومەر فەرمووی: لەسەر ئەو فەرمووده یان بەڵگەم بۆ دەهێنێت یان کارێکت پێ دەکەم(واتە لێت دەدەم)، ئەبو موسا گەڕایەوە بۆ لای ئێمە ڕەنگی گۆڕا بوو، ئێمە دانیشتبووین و پێمان وت: چیتە؟ ئەویش هەواڵەکەی بۆ باس کردین و وتی: ئایا

کەس لە ئێوە ئەو فەرموودەی بیستووە؟ وتمان: بەڵێ، هەموومان بیستوومانە، پیاوێکیان لە خۆیان لەگەڵ نارد هەواڵەکەیان دا بە عومە))[1].

٣. هەروەها لە ڕێگەی هیشامی کوڕی عوروەی کوڕی زوبەیرەوە لە باوکییەوە لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە، عومەر دەربارەی سك لەبارچوونی ئافرەت راوێژی پێ کردن، موغییرە وتی: پێغەمبەر(ﷺ) تیایدا بە خوێنی کۆرپەکە قەزاوەتی کردووە، عومەر فەرمووی: گەر راستگۆی یەکێك بهێنە ئەوە بزانێت، دەڵێت: محەمەدی کوڕی مەسلەمە شایەتی دا پێغەمبەر(ﷺ) بەوە قەزاوەتی کردووە[2].

٤. ((عەلی(خوا لێی رازی بێت) دەفەرموێت: من گەر لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموودەیەکم بیست بێت، خودا چەندی بوێت سوودی پێگەیاندووم، گەر یەکێکی تر فەرموودەکەی بۆ باسکردم سوێندم داوە، گەر سوێندی خوارد بەڕاستم زانیوە، ئەبوبەکر فەرموودەیەکی بۆ گێڕامەوە-ئەبوبەکر راستگۆ بوو- و وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: ((هەر بەندەیەك گوناهێکی ئەنجامدا و پاشان دەسنوێژی گرت و دوو رکات نوێژی کرد و داوای لێخۆشبوونی کرد خودا لێیخۆش دەبێت))[3].

لەم ئاسارانەوە تێدەگەین بەرنامەی ئەبوبەکر و عومەر(خوا لێیان رازی بێت) بەو جۆرە بوو فەرموودە دەبێت شایەتی هەبێت و بەلانیکەمەوە دوو کەس فەرموودەکە بگێڕنەوە، عەلیش(خوا لێی رازی بێت) بەرنامەکەی بەو جۆرە بووە سوێندی کەسەکە بدات.

ئەم تێگەشتنە لە چەرخی نوێدا گوازرایەوە بۆ زۆرێك لەو کەسانەی دەربارەی مێژووی تەشریعی ئیسلامی و مێژووی سوننەت نووسیویانە، وایلێهاتووە بووە بە پرسێکی بەڵگەنەویست لەلایان، لەوانە مامۆستای پایەبەرز دانەری کتێبی **"مذكرة تأريخ التشريع الإسلامي"**.

**لە راستیدا بینای ئەو ڕێسایە لەسەر ئەو ئاسارانە هەڵەیەکی زانستییە و کۆمەڵێك ئاساری تر کە لە عومەرەوە باسکراوە کاری بە فەرموودەیەك کردووە یەك کەس**

---

[1] الحديث في الصحيحين عن أبي سعيد الخدري.

[2] ذكرة الحفاظ١/٢ و ٦ و ٧ و ١٠.

[3] ذكرة الحفاظ، وذكرها الحاكم في "المدخل الى أصول الحديث".

**گێڕاویەتەوە، هەروەها عەلی فەرموودەی وەرگرتووە لە هەندێ لە هاوەڵان و سوێندی نەداون، هەر بەو جۆرە هەمان شت لە ئەبوبەکرەوە دەگێڕنەوە، لەوانە:**

١. ئیمامی بوخاری فەرموودەیەکی دەرهێناوە لە عەبدوڵای کوڕی عامیری کوڕی رەبیعەوە: عومەر(خوا لێی رازی بێت) رۆیشت بۆ شام، کاتێك گەیشتە "سرغ" ئەو هەواڵەی پێگەیشت نەخۆشی تاعوون لە شام روویداوە، "عبدالرحمن بن عوف" هەواڵی پێدا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((گەر هەواڵتان پێگەیشت لە زەوییەك تاعوون هەیە و ئێوە تێیدا بوون وەك هەڵهاتن لەو زەوییە مەچنە دەرەوە))

٢. هەروەها عومەر(خوا لێی رازی بێت) کاری کرد بە مەسح لەسەر "خوف" بە فەرموودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) کە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص بۆی باسکرد[1].

٣. هەروەها عومەر ویستی ئافرەتێکی شێت رەجم بکات، تا یەکێك پێی وت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((قەڵەم لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە...)) بۆیە عومەر فەرمانی کرد رەجم نەکرێت[2].

کەوابوو داوای شایەت لە هاوەڵان لەسەر فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) لەلایەن عومەرەوە(خوا لێی رازی بێت) بۆ ئەوە بووە خەڵکی ئاگاداربکاتەوە تا دڵنیا نەبن لە فەرموودەیەك بە دەم پێغەمبەرەوە نەیگێڕنەوە، بەڵگەی ئەم قسە ئەو ریوایەتەیە مالیك لە ئەنەسەوە دەیگێڕێتەوە و تیایدا هاتووە: عومەر بە ئەبی موسا دەفەرموێت: من(بە داوای شایەت لە تۆ) تۆم تۆمەتبار نەکردووە، بەڵام ترسام خەڵکی بە دەم پێغەمبەرەوە(ﷺ) قسە هەڵبەستن))[3].

"الرازي" لە "المحصول"دا باسی ئەوەی کردووە: ئەبوبەکر(خوا لێی رازی بێت) لە قەزیەی نێوان دوو کەسدا دادوەری کرد، بیلال هەواڵی پێدا پێغەمبەر(ﷺ) پێچەوانەی ئەوە دادوەری کردووە، بۆیە ئەبوبەکر لە دادوەرییەکەی گەڕایەوە))[4].

---

[1] فتح ملهم١/٧.

[2] 'لإحكام لإبن حزم ١٣/٢.

[3] الرسالة للشافعي.

[4] المحصول للرازي.

تەنها یەك ریوایەت باسی ئەوە دەكات ئەبوبەكر داوای زیاتر لە كەسێكی كردووە لە گێڕانەوەی فەرموودەدا ئەویش میراتبردنی داپیرە بوو بۆ زیادە دڵنیابوونەوەیەك، چونكە حوكمەكەی بەو شێوەیە جێگیر دەبوو.

عەلیش(خوا لێی رازی بێت) ریوایەتەكەی میقدادی كوڕی ئەسوەدی قبووڵ كرد دەربارەی مەزی بەبێ ئەوەی سوێندی بدات، پێشتریش لە ریوایەتەكەی تردا سوێندی ئەبوبەكری نەدا، بەڵكو فەرمووی: ئەبوبەكر راستگۆیە، بۆیە سوێنددانی كەسەكە لەلای عەلی(خوا لێی رازی بێت) رێسایەكی گشتی نەبووە.

**پوختەی قسان جێگیر و دروست ئەوەیە** ئەبوبەكر و عومەر و عەلی كاریان بە هەواڵی یەك كەس كردووە، لەو بارانەشدا پێویست بوویێت داوای شایەتی تر بكرێت یان كەسەكە سوێند بدرێت بەو كارە هەستاون، بۆیە ناكرێتە مەزهەبێكی گشتی و كارێكی بەرنامە بۆ دانراو.

## گەشتی هاوەڵان بە وڵاتاندا بۆ داوای فەرموودە:

چاخی دوو خەلیفەی یەكەمی راشیدین تێپەڕی و سوننەت لە سینەی هاوەڵاندا هەڵگیرا بوو و زۆر بڵاوەی نەكرد بوو بە وڵاتاندا، چونكە عومەر رێگری كرد بوو لە زۆربەی هاوەڵان شاری مەدینە بەجێبهێڵن جگە لە ژمارەیەكی كەمیان كە بەرژەوەندی هەبوو لە دەرچوونیان، بە هەمان شێوە لە مەدینەش لەبەر گرنگیدان بە قورئان و ترسان لە تێكەڵبوونی وەهم و ئەندێشە بە سوننەت زۆر بڵاوەی نەكرد بوو، كاتێك سەردەمی عوسمان(خوا لێی رازی بێت) هاتە بەرەوە رێگەی بە هاوەڵان دا شاری مەدینە بەجێبهێڵن و بە وڵاتاندا بڵاوە بكەن، ژمارەی هاوەڵان-بەتایبەت پیرەكانیان- لە كەمی دەدا، بۆیە ئەو هاوەڵانەی گەنج بوون هەستان بە كۆكردنەوەی سوننەت لە دەمی گەورەكانەوە، هەندێكیان بۆ ئەو مەبەستە گەشتیان دەكرد تاكو فەرموودە لە دەمی هاوەڵان وەربگرن.

لە جابری كوڕی عەبدوڵاوە دەفەرموێت: فەرموودەیەكم لە یەكێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) پێگەیشت خۆم لە دەمی ئەو(ﷺ) نەمبیستبوو، حوشترێكم كڕی و گەشتم كرد بۆ لای، پاش مانگێك لە رێگەبڕین هاتم بۆ شام، بینیم ئەو كەسە عەبدوڵای كوڕی ئونەیسی ئەنصارییە، چووم بۆ لای و پێم وت: فەرموودەیەك لە تۆوە

به من گەیشتووە لە پێغەمبەری خودات(ﷺ) بیستووە دەربارەی ستەمکاری کە پێشتر نەمبیستبوو، ترسام بمرم یان بمریت بەر لەوەی لە دەمی خۆت بیبیستم، فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: ((خەڵکی بە خەتەنە نەکراوی و بە رووتی(بُهما) حەشر دەکرێن، وتمان: "بُهم" چییە؟ فەرمووی هیچیان لەگەڵ نییە، بانگکەرێك بانگیان لێ دەکات لە دوورەوە دەبیستریٚ وەك چۆن لە نزیکەوە دەبیستریٚ: من "دەیان"م بۆ هیچ کەسێکی ئەهلی دۆزەخ نییە بچێتە دۆزەخەوە هەتا یەکێك لە ئەهلی بەهەشت ستەمکارییەکی لەسەر ئەو هەبێت و بۆی وەربگرمەوە، هەروەها بۆ هیچ کەسێکی ئەهلی بەهەشت نییە بچێتە بەهەشتەوە هەتا یەکێك لە ئەهلی دۆزەخ ستەمکارییەکی لەلای ئەو بێت و بۆی وەربگرمەوە، تەنانەت زلەیەکیش، وتمان: چۆن لێمان وەردەگرێتەوە؟ لە کاتێکدا ئێمە بە خەتەنە نەکراوی و بەبیٚ هیچ شتێك چووینەتەوە بۆ لای خودا؟ فەرمووی: بە چاکەکان و خراپەکان وەریدەگرێتەوە))[1].

بە هەمان شێوە ئەبو ئەیوبی ئەنصاری لە مەدینەوە سەفەری کردووە بۆ مصر بۆ وەرگرتنی فەرموودەیەك لە عوقبەی کوڕی عامیری جوهنی[2].

چەند هاوەڵێك بەناوبانگن بەوەی زۆرترین ریوایەتیان لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) باسکردووە، جا یان بە هۆی هاوەڵی زۆریان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) وەك عەبدوڵای کوڕی مەسعوود(خوا لێی رازی بێت) یان بە هۆی بەردەوامی خزمەتی لەگەڵی وەك ئەنەسی کوڕی مالیك(خوا لێی رازی بێت)، یان بۆی تێکەڵی ژیانی خێزانی وەك عائشە(خوا لێی رازی بێت) یان بە هۆی گرنگیدان بە فەرموودەکانی وەك عەبدوڵای کوڕی عومەر و عەبدوڵای کوڕی عەمر و ئەبی هورەیرە، خەڵکی بەگشتی بەبیٚ گومان و دڵەڕاوکیٚ فەرموودەیان لە هاوەڵانەوە وەردەگرت و هاوەڵانیش بەهەمان شێوە لەیەکتر فەرموودەیان وەردەگرت و یەکتریان بەدرۆنەدەخستەوە و فەرموودە هەڵبەستن بە دەم پێغەمبەرەوە(ﷺ) بوونی نەبوو تا روودانی فیتنە گەورەکە(شەهیدکردنی عوسمان) کە گۆڕانێکی گەورە لە ژیانی ئایینی موسڵمانانندا هاتە ئاراوە وەك چۆن گۆڕان لە ژیانی سیاسیاندا سەریهەڵدا.

---

[1] أخرجه البخاري في "الأدب المفرد" وأحمد والطبراني والبيهقي واللفظ له.

[2] جامع بيان العلم ٩٣/١.

# بەشی دووەم

# دانانی فەرمووده و چەند باسێك

## کەی فەرمووده هەڵبەستن دەستی پێکرد؟

سالّی چلی کۆچی  ئەو هێڵە جیاکەرەوەیە سوننەتی پاك و بێگەرد لـە درۆ و دانـانی فەرمووده جیادەکاتەوە، لە دوای ئەوە دەستکرا بـە دانـانی فـەرمووده و کردنـی بـە وەسیلەیەك لەپێناو کۆمەڵێك مەرامی سیاسی و دابەشبوونی ناوەکیدا، لەدوای ئـەوە جیاوازی لە نێوان عەلی و معاویەدا چووە قالّبی جەنگەوە و خوێن و ڕۆحێکی زۆر لەو مەیدانەدا ڕژا و موسڵمانان دابەش بوون بۆ چـەندین دەسـتە، جمهـوور لەگـەڵ عـەلی بوون(خوا لێی ڕازی بێت) لەو جیاوازییەی لەگەڵ معاویـە هـەیبوو، خـەواریجیش دژی عەلی و معاویە بوون لە دوای ئەوەی پێشتر دەستەیەکی بەجۆشی عـەلی و ئالوبـەیت بوون، دەسـتەیەکیان دوای شـەهیدکردنی عـەلی(خوا لێـی ڕازی بێـت) و خەلافـەتی معاویە داوای مافی خەلافەتیان بۆ خۆیان دەکرد و لە گوێڕایـەڵی خەلافـەتی ئەمـەوی هاتنە دەرەوە، بەم جۆرە ڕووداوە سیاسییەکان بوو بە هۆیەك بۆ دابەشبوونی موسڵمان و سەرهەڵدانی چەندین پێڕ و دەستە، بەداخەوە ئـەم دابەشـبوونە شـێوەیەکی ئـاییینی وەرگـرت و گـەورەترین کاریگـەری هـەبوو لـە سـەرهەڵدانی مەزهـەبی ئـاییینی لـە ئیسلامدا، هەر دەستەیەك هـەوڵی دەدا هەڵوێسـتی خـۆی بـە قورئـان و فـەرمووده پشتگیر بکات، شتێکی سروشتی بوو هەموو دەستەیەك ئەوەی دەیویست لە قورئان و فەرمووده بەدەستی نەهێنێت، بۆیە هەندێ لەو دەستانە کەوتنە لێکدانەوە(تـەئویل)ی بێجێ و ناڕاست بۆ قورئان و هەڵدانی فەرمووده بۆ سەر مانەیەك مەبەستی نـەبووە و هەنـدێکی تریـان کەوتنـە هەڵبەسـتنی فـەرمووده بـە دەم پێغەمبـەرەوە(ﷺ)، تـا فەرموودەگەلێك بەرهەم بهێنن پشتیوانی بانگەشەی ئەوان بکات، هەڵبـەت لـە دوای ئەوەی نەیانتوانی ئایەت بۆ قورئان زیاد بکەن.

یەکەمجار هەڵبەستی فەرموودە دەربارەی چاکە و گەورەیی کەسەکان(هاوەڵان) سەریهەڵدا، فەرموودەی زۆریان دەربارەی ئیمامەکانیان و سەرۆك دەستەکانیان دانا، دەڵێن لەم مەیدانەدا شیعە دەستپێشخەری کردووە بە جیاوازی دەستە و مەزهەبیانەوە، وەك چۆن "ابن أبی الحدید" لە شەرحی "نهج البلاغة"دا دەڵێت: ((بزانە بنەڕەتی درۆ لەو فەرموودانەدا باسی چاکەی کەسەکان دەکات لە شیعەوە هاتووە....هتد))[1].

لەم رووەوە نەزانان لە ئەهلی سوننەت بە دانانی فەرموودە بە دەم پێغەمبەرەوە رووبەڕوویان بوونەوە.

## لە کام نەوەدا هەڵبەستی فەرموودە سەریهەڵدا؟

ئاسان نییە وێنای ئەوە بکەین هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) کە رۆح و ماڵ و سامانیان فیدای پێغەمبەر کرد و لە پێناوی ئیسلامدا کۆچیان لە نیشتمان و کەسوکاری خۆیان کرد و خۆشەویستی خودا تێکەڵ بە خوێن و گۆشتیان بوو ئاسان نییە پێمان وابێت ئەو هاوەڵانە درۆیان بە دەم پێغەمبەرەوە هەڵبەستبێت بەتایبەت دوای بیستنی ئەو فەرموودە لە دەم خۆشەویستەکەیانە کە دەفەرموێت: ((درۆکردن بە دەم منەوە وەك درۆکردن نییە بە دەم کەسێکی ترەوە، هەر کەس بەئەنقەست درۆم بە دەمەوە بکات با شوێنی خۆی لە ئاگردا خۆشبکات))[2].

عومەر وتاری بۆ خەڵکی دەدا و دەیفەرموو: خەڵکینە، لە مارەیی ئافرەتاندا زیادەڕەوی مەکەن، چونکە گەر مارەیی زۆر رێزێك بوایە لەلای خوداوە نزیکترین کەس پێی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەبوو، ژنێکی لەبەر چاوی خەڵکی لێ راست دەبێتەوە و دەڵێت: بوەستە عومەر، خودا نافەرموێت: ﴿وَءَاتَيۡتُمۡ إِحۡدَىٰهُنَّ قِنطَارٗا﴾ **النساء: ٢٠**، عومەر دەفەرموێت: ((ژنێك راستی کرد و پیاوێك هەڵەی کرد))[3].

---

[1] شرح نهج البلاغة.

[2] حديث مشهور ادعى بعض العلماء أنه متواتر رواه سبعون صحابيا وادعى غيرهم أكثر وقد خرجته كتب السنة كلها.

[3] أخرجه الإمام أحمد في مسنده وأصحاب السنن وأبو يعلى الموصلي.

ئەو نموونەش عەلی(خوا لێی رازی بێت) جیاوازە لەگەڵ عومەر دەربارەی رەجمی ئافرەتی سکپڕ و کارەکەی بە نەشیاو دادەنێت و دەفەرموێت: ((گەر خودا رێگەی لەبەردەم دانابێت(وەك لە قورئاندا هاتووە) ئایا خودا لەبەر ئەوەی لە سکیدایە رێگەیەکی لە بەردەم تۆ دانەناوە؟)) عومەر لە بڕیارەکەی پاشگەزبوویەوە و فەرمووی: ((گەر عەلی نەبایە عومەر تیادەچوو)).

ئەمانە و نموونەی ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی هاوەڵان خاوەنی بوێری و لێبڕان بوون بۆ بەرگری لەوەی باوەڕیان وابووە راست و دروستە و حەقیان بەسەر هەموو هاوەڵ و کەسێکی نزیکدا سەرخستووە، بۆیە محاڵە کەسانێکی لەو جۆرە درۆ بە دەم پێغەمبەرەوە(ﷺ) هەڵبەستن لەپێناو شوێنکەوتنی ئارەزوو و حەزی دونیاییی، چونکە تەنها کەسی ترسنۆك درۆ دەکات، هەر بەو جۆرە محاڵە بێدەنگ بوون لە کەسێك درۆی بە دەم پێغەمبەرەوە هەڵبەستبێت لە کاتێکدا ئەوان بێدەنگ نابن لە ئیجتیهادێکی هەڵە.

لە "البراء"ەوە: ((هەموومان فەرموودەی پێغەمبەری خودامان(ﷺ) نەدەبیست، چونکە سەرقاڵی ماڵ و منداڵمان بووین، بەڵام خەڵکی درۆیان نەدەکرد، بۆیە ئەوەی ئامادە دەبوو فەرموودەکەی دەگێڕایەوە بۆ ئەوانەی لەوێ ئامادە نەبوون))[1].

لە چاخی شوێنکەوتواندا -گومانی تێدا نییە- درۆ لای پێشینەکانی شوێنکەوتوان زۆر کەمتر بووە لەوەی لای گەنجان لە شوێنکەوتوان هەبووە، چونکە رێزی مەقامی پێغەمبەر و کارکەری تەقوا و ئاییینداری لە چاخی یەکەمدا زۆرتر و زیاتر بووە لەوەی لە چاخی دووەمدا هەبووە، هەروەها لەبەر ئەوەی جیاوازییە سیاسییەکان هێشتا لە سەرەتادا بوون، بۆیە پاڵنەری فەرموودە هەڵبەستن بەرتەسکتر بووە بەراورد بە چاخەکانی تر، ئەمە و بوونی هاوەڵان و شوێنکەوتووانی مەزن کە بە زانست و ئاییینداری و دادپەروەری و ئاگاهی بەناوبانگ بوون سەریدەکێشا بۆ رسواکردنی درۆزنان و پەردەلادان لەسەر نییەت و پیلانەکانیان.

[1] أخرجه البيهقي.

**ئـەو پاڵنەرانـەی سەریانکێشـا بـۆ هەڵبەسـتنی فـەرمووده و ئـەو ژینگانـەی تیایاندا سەریهەڵدا:**

یەکەمین شوێنێك هەڵبەستنی فەرمووده تیایدا سەریهەڵدا و پـەرەی سـەند عێـراق بوو، ئیمامانی فەرمووده ئاماژەیان بەمە کردووه، **"الزهـري"** دەڵێـت: ((فـەرمووده لەلای ئێمە دەردەچوو بستێك بوو، لە عێراقەوه دەگەڕایەوه بۆ لامان باڵێك بوو))[١].

مالیك بە عێراقی دەوت: **"دار الضرب"**(ئەو شوێنەی سکەی پـارەی تێـدا دروسـت دەکرێت) واتە شوێنی دروستکردنی فەرموودەی هەڵبەسـتراو بـوو وەك چـۆن دینـار و درهەم دروست دەکران(لێدەدران).

**ئەو هۆیانەی سەریانکێشا بۆ هەڵبەستنی فەرمووده:**

## یەکەم: جیاوازی سیاسی:

دەستە سیاسییەکان لە زەلکاوی درۆکردن بە دەم پێغەمبەرەوە ڕۆچوون، رافیـزە ئـەو دەستەیە بوو لە هەموان زیاتر درۆی بە دەم پێغەمبەرەوە(ﷺ) هەڵدەبەست، شورەیکی کوڕی عەبدوڵای قازی-کە بە تەشەیوع بەناوبانگ بوو لەگـەڵ میانەڕەویـدا- دەڵێـت: ((هەموو ئەوانەی پێیان دەگەم فەرموودەیان لێ وەردەگرم، جگە لە رافیزەکان، ئەوانە خۆیان فەرمووده دادەنێن و دەیکەن بە ئایینی خۆیان))[٢].

**حەماد دەڵێت:** شێخێکی رافیزه بۆی باسـکردم دەیـوت: ((کاتێـك کۆدەبووینـەوه و شتێکمان لا باش و جوان بوایە دەمانکرد بە فەرمووده))[٣].

**شافیعی دەفەرموێت:** ((لە ئەهلی ئارەزوو دەستەیەکم نەبینیوە وەك رافیـزه شـایەتی درۆ بدەن))[٤].

---

[١] ابن عساکر مخطوط.

[٢] منهاج السنة.

[٣] منهاج السنة.

[٤] منهاج السنة.

هەر بەو جۆرە زۆرێك لە فەرموودەیان لە زەمی معاویەدا دانا، بۆ نموونە: ((گەر معاویەتان لەسەر مینبەرەکەم بینی بیکوژن)).

**هەروەها دەربارەی زەمی معاویە و عەمری کوڕی عاص:** ((خودایە، لە فیتنەدا نوقمیان بکە و رووبەڕووی ئاگریان بکەیەوە)).

ئەم دەستەیە زۆرێك لە فەرموودەیان دەربارەی عەلی(خوا لێی رازی بێت) و ئالوبەیت دانا و چەندین فەرموودەشیان دەربارەی خراپی بەشێك لە هاوەڵان هەڵبەست.

**"الخليلي" لە "الإرشاد"دا دەڵێت:** ((رافیزە دەربارەی فەزڵ و گەورەیی عەلی و ئەهلوبەیتی عەلی(خوایان لێ رازی بێت) سێ سەد هەزار فەرموودەیان داناوە)) لەگەڵ ئەوەی زیادەڕەوی لە قسەکەیدا هەیە بەڵام ئاماژەیە بە زۆری فەرموودەی هەڵبەستراو.

بە هەمان شێوە دەستەیەکی نەزان لە ئەهلی سوننە بەرانبەر ئەوان راستبوونەوە دەستیان دایە هەڵبەستنی فەرموودە و درۆیان بە درۆ پاڵ پێوە دەنا، هەرچەند بازنەکەی بەرتەسکتر بوو لەوەی رافیزەکان پێی هەڵدەستان، لەو فەرموودە هەڵبەستراوانە: ((هەرچی درەختی بەهەشتە لێی نووسراوە: **"لا إله إلا الله محمد رسول الله، أبوبكر الصديق،** عمر فاروق، **"عثمان ذي النورين"**)).

هەر بەو جۆرە دەمارگیرانی معاویە دەستیان بە دانانی فەرموودە کرد، لەوانە: ((ئەمینەکان سێ کەسن: من و جبریل و موعاویە))، یان ((تۆی ئەی معاویە لە منی و من لە تۆم))

بە هەمان شێوە سەرخەرانی عەباسییەکان دەستیان دایە هەڵبەستنی فەرموودە، لەوانە: ((عەباس وەسێتدار و میراتگری منە)).

هەروەها ((گەر ساڵی "سەد و سی و پێنج" هاتە بەرەوە ئەو ساڵە ساڵی تۆ و کوڕەکانی تۆیە: سەفاح و مەنصوور و مەهدی))

## ئایا خەواریج لە فەرموودەدا درۆیان دەکرد؟

**زانایان دەڵێن:** خەواریج کەمترین درۆیان بە دەم پێغەمبەرەوە(ﷺ) هەڵبەستووە، هۆی ئەو کارەیان بۆ ئەو باوەڕەیان دەگەڕێتەوە گوناهی گەورە کەسەکەی پێ کافر دەبێت، یان ئەو کەسەی بەڕەهایی گوناهێك ئەنجام دەدات، بۆیە درۆ و فیسقیان بە حەڵاڵ نەدەبینی و لەڕووی تەقواوە زۆر مەزن بوون، لەگەڵ ئەوەش هەندێ سەرکردەیان لە درۆکردن بە دەم پێغەمبەرەوە سەلامەت نەبوون، یەکێك لە شێخەکانیان دەڵێت: ئەم فەرموودانە ئایینن بۆیە تەماشا بکەن ئایینتان لە کێوە وەردەگرن، ئێمە گەر ئارەزوومان لە شتێك بوایە دەمانکرد بە فەرموودە[1].

**"عبدالرحمن بن المهدی" دەڵێت:** خەواریج و زەندیقەکان ئەم فەرموودەیان هەڵبەستووە: ((گەر فەرموودەیەکتان لە منەوە پێگەیشت ئەوا بەسەر کتێبەکەی خودادا واڵای بکەن گەر تەبابوو لەگەڵی ئەوا من وتوومە...هتد)).

ئەمە قسەی هەندێ لە نووسەران و ئەهلی فەرموودەی کۆن و نوێیە، بەڵام من فەرموودەیەکم نەبینیوە کەسێکی خەواریج هەڵیبەستبێت و بۆ ئەو مەبەستەش زۆرێك لە کتێبەکانی فەرموودەی هەڵبەستراوم پشکنی، بەڵام خەواریجێکم نەبینیوە لەو کەسە درۆزنانە سەرژمێر بکرێت فەرموودەیان هەڵبەستوە، ئەو دەقەی پێشووش کە دەڵێت شێخێکی خەواریج وای وت، نازانین ئەو شێخە کێیە، حەمادی کوڕی مەسلەمە شتێکی لەم شێوە دەربارەی شێخێکی رافیزە باس دەکات، ئیتر بۆچی دانەپاڵی بۆ لای شێخێکی خەواریج هەڵەیەك نەبێت لە ریوایەتەکەدا کرابێت؟

ئەو فەرموودە هەڵبەستراوەش((گەر فەرموودەیەکتان لە منەوە پێگەیشت...)) گوایە زەندیقەکان و خەواریجەکان هەڵیانبەستووە نازانین دانەپاڵی بۆ لای ئیبن مەهدی چەندە دروستە، بەڵکو قسەیەکە بەڵگەی لەسەر نییە.

هەوڵمدا تەنها بەڵگەیەکی زانستی ببینمەوە پشتیوانی ئەوە بکات خەواریج فەرموودەیان هەڵبەستووە بەڵام نەمبینییەوە، بەپێچەوانەوە بەڵگەم دەستکەوت لەسەر نەرێکردنی ئەو تۆمەتە بە رووی خەواریجدا.

---

[1] الفرق بين الفرق-ص٤٥.

**"المبرد" دەڵێت:** ((هەموو دەستەکانی خەواریج لە درۆ و گوناهی ئاشکرا بەرین))[1].

هەموو ئەوەی لەبەر دەستماندایە لە دەقە مێژوویەکان بە ئاماژەیەکی بڕاوە و یەکلاکەرەوە ئاماژە بەوە دەکەن خەواریج بە ئەوپەڕی بوێری و راشکاویی و راستگۆییەوە چوون بە گژ دەسەڵاتداران و خەلیفەکان و ئەمیرەکاندا ئیتر بۆچی پەنا بۆ درۆ ببەن؟!

**داود دەڵێ:** ((لە ئەهلی ئارەزوودا هیچ کەسێك بە ئەندازەی خەواریج دادپەروەرتر و راستگۆتر نەبووە لە گێڕانەوەی فەرموودەدا)).

**هەروەها وتراوە:** ((خەواریج لەوانە نەبوون شان لەسەر درۆ دابدەن، ئەوان بە صدق بەناوبانگ بوون تەنانەت دەوترێت: فەرموودەکانیان راستترین فەرموودەیە))[2].

## دووەم: زەندیقەکان:

مەبەستمان بە زەندەقە رقبوونە لە ئیسلام وەك دین و وەك دەوڵەت، ئیسلام کۆمەڵێك دەسەڵات و ئیمارەتی راماڵی لەسەر فریودان و گومڕاکردنی گەلان لەبیروباوەڕیاندا راوەستابوون، دەسەڵاتداران ئیسلامیان بەو بانگەوازە دەبینی مرۆڤەکان هۆشیار دەکاتەوە و جارێکی تر بە درۆ و فریودانی ئەوان فریو ناخۆن، بۆیە کەوتنە هەوڵی گێڕانەوەی دەسەڵاتی لەدەستچوویان، تەنها رێگەیەك لەبەردەمیاندا تێکدانی بیروباوەڕی ئیسلام و شێواندنی ناوبانگی باشی بوو، فەرموودە هەڵبەستن بەرینترین مەیدان بوو بۆ تێکدانی ئیسلام و ریزی موسڵمانان، هەندێ جار لە رێگەی شیعەگەری و هەندێ جار لە رێگەی زوهد و تەصەوف و هەندێ جاریش لە رێگەی فەلسەفە و حیکمەتەوە.

لە نموونەی ئەو فەموودە هەڵبەستراوەی زەندیقەکان پێی هەستاون: ((خودا فریشتەکانی لە مووی باڵ و سنگی خۆی دروست کرد)).

یەکێك لەو زەندیقانە لەبەردەم خەلیفەی عەباسی مەهدیدا دانی بەوەدا نا سەد فەرموودەی هەڵبەستووە لە ناو خەڵکیدا هاتووچۆ دەکات، کاتێك **"عبدالکریم بن أبي**

---

[1] الكامل في الأدب.

[2] منهاج السنة ٣/٣١.

**العوجاء"** هێنرا بۆ کوشتن دانی بەوەدا نا چوار هەزار فەرموودەی هەڵبەستووە حەڵاڵی تێدا حەرام کردووە و حەرامی حەڵاڵ کردووە.

## سێیەم: دەمارگیری بۆ ڕەگەز و هۆز و زمان و وڵات و ئیمام:

**شوعوبییەکان(گەلگەرایان) هەستان بە هەڵبەستنی فەرموودەی:** ((کاتێك خودا تووڕە دەبێت وەحی بە عەرەبی دادەبەزێنێت، بەڵام کاتێك ڕازی دەبێت وەحی بە فارسی دادەبەزێنێت))، خەڵکانێکی نەزان لە عەرەب ڕووبەڕوویان بوونەوە بە هەڵبەستنی فەرموودەی: ((خودا کاتێك تووڕە دەبێت بە فارسی وەحی دادەبەزێنێت، بەڵام کاتێك ڕازی دەبێت بە عەرەبی وەحی دادەبەزێنێت))، هەر بەو جۆرە دەمارگیران بۆ ئەبو حەنیفە فەرموودەیان هەڵبەستووە: ((پیاوێك لە ئومەتەکەم پێی دەوترێت ئەبو حەنیفە چرایە بۆ ئومەتەکەم))، دەمارگیران دژ بە شافیعیش فەرموودەیان هەڵبەستووە.

## چوارەم: چیرۆك و وەعز:

دەستەیەك چیرۆکخوان دەستیاندایە وەعز و ئامۆژگاری خەڵکی، ئەوان لە خودا نەترسان و تەنها دەیانویست خەڵکی لە دانیشتنەکانیاندا بگرین و هاواریان لێ بەرزببێتەوە و سەرسامی قسەکانیان بن، بۆیە چیرۆکی درۆیان هەڵدەبەست و دەیاندایە پاڵ پێغەمبەر(ﷺ)، لەو فەرموودە هەڵبەستراوانەی چیرۆکخوانەکان دایان ناوە: ((هەر کەس بڵێ: **"لا إله إلا الله"** خودا لە هەر وشەیەك باڵندەیەك دروست دەکات دەنووکی لە زێڕ و پەڕەکانی لە مەرجانە))، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و یەحیای کوڕی موعین لە مزگەوتی ڕەصافە نوێژیان کرد، چیرۆکخوانێك لە بەردەمیان ڕاستبوویەوە و وتی: ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و یەحیای کوڕی موعین بۆی باسکردین دەڵێن: عبدالرزاق لە قەتادەوە لە ئەنەسەوە بۆی باسکردوون پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: بەدوایدا فەرموودەکەی وت، نزیکی بیست وەرەقەی لێ باس کرد، ئەحمەد تەماشای یەحیای کرد و یەحیا تەماشای ئەحمەدی کرد و پێی وت: تۆ ئەو فەرموودەت گێڕاوەتەوە؟ وتی: سوێند بە خودا، ئێستا دەیبیستم، کاتێك کەسەکە تەواو بوو یەحیا ئاماژەی بۆ

کەسەکە کرد و ئەویش هات، یەحیا لێی پرسی: کێ ئەو فەرموودەی بۆ بـاس کـردی؟ وتی: ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و یەحیای کوڕی مـوعین، یـەحیا وتـی: مـن یـەحیام و ئەوەش ئەحمەدە، هەرگیز فەرموودەی لەو جۆرەی پێغەمبـەرمان نەبیسـتووە، ئەگـەر هەر فەرموودە هەڵدەبەستی بە دەم کەسانی ترەوە ئەنجامی بدە، چیرۆکخوانەکە وتـی: من بە هەمیشەیی دەمبیست دەیانوت یەحیای کوڕی موعین پیاوێکی گەمژەیە، مـن باوەڕم نەدەکرد ئاوا ئێستا بۆم دەرکەوت بەو جۆرەیە، یەحیا وتی: چۆن؟ وتی: بـۆ لـە دونیادا تەنها ئێوە ناوتان یەحیای کوڕی موعین و ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە؟ لە حەڤدە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و یەحیای کوڕی موعینەوە فەرموودەم نووسیوە))[1].

جێگەی داخە خەڵکی بەگشتی گوێیان لەو چیرۆکخوانانە گرتووە، **"السيوطي"** لە **"تحذير الخواص من أكاذيب القصاص"**دا دەڵێت: یەکێك لەو چیرۆکخوانانە لە بەغداد تەفسیری ئایەتی: ﴿عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ٧٩﴾ **الإسراء: ٧٩** کرد و وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر عەرشەکەی خودا لەگەڵ خودا دادەنیشێت، ئەو قسەیە گەیشتەوە بە محەمەدی کوڕی جەیری **الطبري** زۆر تووڕە بوو و توند بە گژیداچوو، لەسەر دەرگای ماڵەکەی خۆی نووسی: **"سبحان من ليس له أنيس ولا له على عرشه جليس**-پاکێتی بۆ ئەو خودایەی هۆگری نییە و کەس جگە لە خۆی لەسەر عەرشەکەی دانانیشێت**"**، خەڵکی رەشۆکی شاری بەغداد لێی راپەڕین و ماڵەکەیان بەردباران کرد، تا ئەوەندە بەردیان بۆ هەڵدا دەرگای ماڵەکەی گیرا و لەسەری بەرزبوویەوە[2].

## پێنجەم: جیاوازی فیقهی و کەلامی:

خەڵکانێکی لادەر و نەزان لە شـوێنکەوتەی مەزهەبـە فیقهـی و کەلامییـەکان بـۆ پشتیوانی مەزهەبەکەیان هەستان بە دانانی فەرموودە، لەوانە: ((هەر کەس دەستی لە نوێژدا بەرز بکاتەوە نوێژی بۆ نییە)).

یان ((هەر کەس بڵێ قورئان مەخلوقە کافر بووە)).

---

[1] تحذير الخواص من أكاذيب القصاص السيوطي.

[2] الإسلام والحضارة ٥٥٩/٢.

## شەشەم: نەزانی بە ئایین و حەزی خێر:

ئەوەش کاری زۆرێك لە زاهیدان و عابیدان و ساڵحان بوو، دانانی فـەرمووده لەسـەر حەز و ترس(تەرغیب و تەرهیب) بە خێر و چاکە تەماشا دەکرا و وایان دەزانی بەوە لە خودا نزیك دەبنەوە، کاتێك زانایان لێیان هاتنە دەنگ و فەرموودەکەی پێغەمبـەریان دا بە روویاندا: ((من کذب علي متعمدا)) وتیان ئێمە درۆ بـە دەم پێغەمبـەرەوە(ﷺ) ناکەین بەڵکو درۆ بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەکەین، بۆیە دەربارەی خێری خوێنـدنی قورئـان فەرموودەی زۆریان دانا، لەوانـە "نـوح بـن أبـی مـریم" دانـی نـا بـە هەڵبەسـتنی فەرموودەدا و بیانووی هێنایەوە و وتی: خەڵکیم بینی پشتیان لە قورئـان کـرد بـوو و خۆیان بە فیقهی ئەبو حەنیفە و مەغازی ئیبن ئیسحاقەوە خەریك کرد بوو))

لەوانەی فەرموودەیان دادەنا کەسێك بوو بە ناوی "غلام خلیل"، ئەو کەسێکی زاهید بـوو، لـە دونیـا و حـەزەکانی دونیـا وازیهێنـابوو، خـۆی بـۆ عیبـادەت و تـەقوا یەکلاکردبووەوە، کەسێکی خۆشەویست بوو لای خەڵکی بەگشتی، لە رۆژی مردنەکەیدا بەغداد بازاڕ و دوکانەکانیان داخست وەك دڵتەنگی بـۆ مردنەکـەی، لەگـەڵ ئـەوەش شەیتان دانانی فەرموودەی لا جوان و شیرین کرد بوو.

ئەو فەرموودەی دەربارەی گەورەیی خوێندنی ئەزکار و ئەوراد دادەنا، تا پێیوترا: ئەم فەرموودانە چین دەربارەی رەقائق دەیانگێڕییەوە؟ وتی: ئەوانەمان بۆ نەرم کردنی دڵـی خەڵکی رەشۆکی (عوام) داناوە.

## حەوتەم: خۆنزیکردنەوە لە مەلیکەکان و ئـەمیرەکان بـە شـتێك لەگـەڵ ئارەزووی ئەوان بگونجێت:

لە نموونەی ئەوە ئەو کارە بـوو "غیـاث بـن إبـراهیم" ئـەنجامی دەدا، چـوو بـۆ لای مەهدی(خەلیفەی عەباسی) بینی یـاری بـە کـۆتر دەکـرد، یەکسـەر فەرموودەیـەکی بەناوبانگی بۆ گێڕایەوە: ((لا سبق إلا في نصل أو خـف أو حـافر)) و لـەلای خۆیـەوە ئەمەی بۆ فەرموودەکە زیـاد کـرد: "أو جنـاح" ئـەوەش وەك رازیکردنـی مەهـدی، مەهدیش دە هەزار درهەمی پێدا، بەڵام کاتێـك لای مەهـدی چـووە دەرەوە مەهـدی

وتی: ((شایەتی دەدەم پشتە ملت لە پشتەملی درۆکەر دەچێت بە دەم پێغەمبەری خوداوە)) بۆیە فەرمانی کرد بە سەربڕینی کۆترەکە.

کەمتەرخەمی خەلیفە و دەسەڵاتداران سەریکێشاوە بۆ پیێڕاکێشانی درۆزنان لە هەڵبەستنی فەرموودەدا، چاکتر بوو بۆ مەهدی لە گەردنی درۆزنەکەی بدابایە نەك کۆترێکی بێ گوناه سەربڕێت.

**ئەبو بەختەری درۆزن کە قازی هاروونە رەشید بوو،** فەرموودەیەکی هەڵبەست بە دەم پێغەمبەرەوە و وتی: پێغەمبەر(ﷺ) کۆتری هەڵدەفڕاند، هاروون پێی وت: ((لە لام بڕۆ دەرەوە، گەر قورەیشی نەبوویتایە لە کارەکەت لامدەدای)).

ئەم جۆرە هەڵوێستانە لەلای خودا خەلیفەکان لێی بەرپرسیارن گەر ئەو جۆرە ریوایەتانە لەسەر ئەوان باسکراوە راست و دروست بن، ئەوان زەندیقەکانیان دوابڕاو کرد لەبەر ئەوەی پێچەوانە بوون بە حوکم و دەسەڵاتی سیاسەتی ئەوان، بە بەڵگەی ئەوەی هەمان دەستیان لە درۆزنان نەوەشاند کە فەرموودەیان بە دەم پێغەمبەرەوە(ﷺ) هەڵدەبەست.



# بەشی سێیەم

# تێکۆشانی زانایان بۆ بەرەنگاربوونەوەی بزاڤی هەڵبەستنی فەرمووده

هەرکەس لە هەڵوێستی زانایان-لە چاخی هاوەڵانەوە تا تۆمارکردنی سوننەت- دەربارەی دانانی فەرمووده و دانەرانی فەرمووده بکۆڵێتەوە و لەو هەوڵ و کۆششە ورد ببێتەوە زانایان لەپێناو سوننەت و جیاکردنەوەی دروست و نادروست ئەنجامیانداوە لەوە تێدەگات ئەو تێکۆشانەیان نموونەی نییە و ئەو رێگەیەی گرتوویانەتە بەر راستترین رێگەی زانستی بووە بۆ رەخنە و پاڵفتەکردن، هەتا دەتوانی بڵێیت زانایانی ئێمە(رەحمەتی خودایان لێ بێت) یەکەمین دەستە بوون لە نێوان هەموو ئومەتانی سەر زەویدا رێساکانی رەخنەی زانستی وردیان بۆ هەواڵ و ریوایەت داناوە.

**ئەو هەنگاوانەی لەپێناو رەخنەدا گرتیانە بەر تا سوننەیان رزگارکرد لە دەست ئەو پیلانەی بەرانبەری دارێژرابوو، و لەو خەڵتە و پیسییانە پاکیان کردەوە پێیەوە لکابوون:**

**یەکەم: سەنەدی فەرمووده(زنجیرەی ئەو کەسانەی فەرموودەکە دەگێڕنەوە):**

لە دوای مردنی پێغەمبەر(ﷺ) هاوەڵانی پێغەمبەر گومانیان بەرانبەر بە یەکتر نەبوو، شوێنکەوتوانیش لە وەرگرتنی فەرموودەیەك کە هاوەڵێکی پێغەمبەر(ﷺ) دەیگێڕایەوە وەستانیان نەبوو، تا فیتنە سەریهەڵدا و ئەو پیاوە یەهوودییە زیانۆمەندە(**عبدالله بن سبأ**) هەستا بە بانگەوازە پڕ لە تاوانەکەی خۆی لەسەر بیرۆکەی زیادەڕەوی لە شیعەگەریدا و دانان بە خوایەتی عەلیدا(خوا لێی رازی بێت)، لێرەوە دەستخستنە ناو سوننە چاخ لەدوای چاخ زیادی دەکرد، لەو کاتەوە زانایان لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان کەوتنە پشکنینی گواستنەوەی فەرمووده و فەرموودەیەکیان قبوڵ نەدەکرد تا رێگەکەی و راوییەکانیان نەناسیبایە و دڵنیابوونایەتەوە لە متمانە و عەدالەتی.

**ئیمامی مسلم لە پێشەکی سەحیحەکەیدا لە ئیبن سیرینەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت:** ((ئەوان(واتە هاوەڵان و شوێنکەوتووان) پرسیاری سەنەدیان نەدەکرد تا فیتنەکە روویدا، ئەوکات وتیان: ناوی پیاوانتان بهێنن، تەماشای ئەهلی سوننە دەکرا و فەرموودەکانیان وەردەگیرا و تەماشای ئەهلی بیدعە دەکرا ریوایەتەکانیان رەد دەکرایەوە، ئەم جێگیرکردنە لە سەردەمی هاوەڵانی گەنجەوە دەستی پێکرد.

**مسلم لە پێشەکی سەحیحەکەیدا لە موجاهیدەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی:** ((بەشیری عەدوی هات بۆ لای ئیبن عەباس، فەرمودەی دەگێڕایەوە و دەیوت: پێغەمبەر(ﷺ) وای فەرموو و پێغەمبەر وای فەرموو، ئیبن عەباس گوێی بۆ قسەکانی نەدەگرت و تەماشای نەدەکرد، ئەویش وتی: ئەی کوڕی عەباس چییە دەبینم گوێ بۆ قسەکانم ناگریت، لە پێغەمبەرەوە فەرموودەت بۆ دەگێڕمەوە و گوێ ناگریت؟

**ئیبن عەباس پێی وت:** ئێمە جاران گەر گوێمان لێبوایە پیاوێك دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی چاومان دەچووە سەری و گوێمان بۆ رادەهێشت، کاتێك خەڵکی سواری شەپۆلی فیتنە بوون تەنها لەوانەوە وەردەگرین دەیانناسین.

**پاشان شوێنکەوتووان گرنگیان بە سەنەد دا کاتێك درۆ پەرەی سەند، "أبو العالیة" دەڵێت:** ((ئێمە لە هاوەڵانەوە فەرموودەمان دەبیست رازی نەدەبووین تا سواردەبووین و دەچووین بۆ لای و لە دەمی خۆیەوە دەمانبیست)).

**ئیبن موبارەك دەڵێت:** (ئیسناد لە ئایینە، گەر ئیسناد نەبوایە هەرکەس هەرچی بویستبایە دەیوت))

**دووەم: متمانەگری(التوثیق) لە فەرموودەدا:**

ئەوەش بە گەڕانەوە بۆ هاوەڵان و شوێنکەوتووان و ئیمامانی ئەم هونەرە، لە چاودێری خودایی بۆ سوننە ئەوە بوو تەمەنی دەستەیەك لە گەورە فەقیهانی هاوەڵانی درێژکردەوە بۆ ئەوەی ببنە مەرجەعێك خەڵکی بە هیدایەتیان هیدایەت وەربگرن، کاتێك درۆ هاتە ئاراوە خەڵکی پەنایان برد بۆ ئەو دەستە لە هاوەڵان، یەکەمجار پرسیاری ئەوەیان لێ دەکردن لەلایان بوو، پاشان پرسیاری ئەو ریوایەت و ئاسارانەیان

لێ دەکردن لە دەمی خەڵکییەوە دەیانبیست، سەعیدی کوڕی موسەیب دەڵێت: ((چەندین رۆژ و شەو بە دوای یەك فەرموودەدا دەڕۆیشتم))

**سێیەم: رەخنە لەسەر راوییەکان و رۆشنکردنەوەی حاڵیان لە راستگۆیی و درۆ:**

ئەمەش دەروازەیەکی مەزنە زانایان بەهۆیەوە دروست و راستیان لە درۆ جیاکردووەتەوە و بەهێزیان لە لاواز دەستنیشان کردووە و لەم مەیدانەدا کارێکی مەزنیان ئەنجامداوە، شوێنی راوییەکان کەوتوون و لە ژیان و مێژوو و سیرەتیان و ئەوەی لێیان شاراوەتەوە و ئەوەی لێیان دەرکەوتووە کۆڵاونەتەوە، لەو مەیدانەدا لە پێناوی خودا لە لۆمەی لۆمەکەران نەترساون، لە بریندارکردنی راوییەکاندا وەرع و شەرمیان بە خەرج نەداوە.

**بە یەحیای کوڕی سەعیدی قەتانیان وت:** ((تۆ ناترسی ئەوانەی فەرموودەیان لێ وەرناگری لە رۆژی دواییدا لەلای خودا ببن بە نەیارت؟ وتی: گەر ئەوانە نەیارم بن پێمخۆشترە تا پێغەمبەر نەیارم بێت و پێم بفەرموێت: بۆ رێگریت نەکرد لە درۆ بەرانبەر فەرموودەکانم؟))

بۆ ئەو مەبەستەش کۆمەڵێك رێسایان داناوە بۆ وەرگرتن و وەرنەگرتنی فەرموودە.

## گرنگترین ئەو پۆلانەی فەرموودەیان لێ وەرناگیرێت:

١. **درۆزنان بە دەم پێغەمبەری خوداوە:** ئەهلی زانست کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی درۆزنان بە دەم پێغەمبەری خوداوە فەرموودەیان لێ وەرناگیرێت، هەر بەو جۆرە کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی ئەو کارەیان گەورەترین گوناهە و دەستەیەکیش بە کوفری دادەنێن، جیاوازیان هەیە لەسەر قبووڵبوونی تەوبەکەی؟ ئەبوبەکری حومەیدی شێخی بوخاری دەڵێت: هەرگیز تەوبەی قبووڵ نابێت، نەوەوی یەکلای کردووەتەوە تەوبەی قبووڵە و ریوایەت و شایەتی لێ وەردەگیرێت، حاڵی ئەو وەك حاڵی کافرێك وایە موسڵمان بووبێت، **"المظفر السمعاني"** دەڵێت: هەر کەس لە یەك هەواڵدا درۆی کرد هەموو ریوایەتەکانی پێشووی بەردەبنەوە و لێی وەرناگیرێن.

**٢. درۆزنـــان لــه قســەی گشـــتیدا بــا درۆشـــیان بـــه دەم پێغەمبـــەرەوە(ﷺ) هەڵنەبەســتبێت:** لەسەر ئەوە ڕێکەوتوون هەر کەس تەنها یەك جار درۆی لــێ بینــرا فەرموودەی لێ وەرناگیرێت.

**٣. کەسانی خاوەن بیدعە و ئارەزوو:** هەر بەو جــۆرە لەســەر ئــەوە ڕێکــەوتوون کــە فەرموودەی خاوەن بیدعە وەرناگیرێت گەر بە بیدعەکەی کافر ببێت، هەر بەو جــۆرە گەر کەسەکە درۆی بە حەڵاڵ دەبینی با بە بیدعەکەشی کافر نەبێت، بەڵام گەر درۆی بە حەڵاڵ نەدەبینی ئایا لێی وەردەگیرێت یان نە؟

**"ابن كثير" دەڵێت:** ((لەسەر ئەو بابەتە ناکۆکییــەکی کــۆن و نــوێ هەیــە، ئــەوەی زۆرینە لەسەرینی ئەوەیە جیاوازی بکرێت لە نێوان کەســێك بــانگ بــۆ بیدعەکــەی بکات لەگەڵ کەسێك بانگی بۆ نەکات)).

**ئیبن حیبان دەڵێت:** لەلای هەموو ئیمامانی ئێمە بەڵگەی پێ ناهێنرێتەوە، لەمەشدا جیاوازی لە نێوانیاندا نابینم، بەڵام وا دەردەکەوێت ئەم بابەتــە جێگــەی هــاوڕابوون نییە وەك ئیبن حیبان باسی لێوە دەکات.

بوخاری تەخریجی کــردووە، **"عمــران بــن حطــان الخــارجي"** عەبــدوڕەحمانی کــوڕی مەلجەمی مەدح کرد، ئەو لە مەزنترین بانگکەرانی خەوارج بوو.

**هەروەها شافیعی دەڵێت:** شایەتی ئەهلی ئارەزوو قبووڵ دەکەم جگە لە خەتابییەکانی ڕافیزە، چونکە ئەوان شــایەتی درۆ دەدەن بــۆ بەرژەوەنــدی ئەوانــەی لەگــەڵ ئــەوان هاوڕان[١].

**عبدالقادری بەغدادی لە کتێبەکەیدا "الفرق بين الفرق"دا دەڵێت:** دواجار شــافیعی لەو ڕایە پەشیمانبوویەوە شایەتی ئــەهلی ئــارەزوو قبــووڵ بکــات و لــە هەڵواردنــدا موعتەزیلەشی دانا[٢].

ئەوەی بۆم دەردەکەوێت ئەوەیە ئەوان ڕیوایەتی کەسی بیدعەچییان ڕەفز کردووە گەر شتێکی ڕیوایەت کردبێت لەگەڵ بیدعەکەی خۆی تەبا بێت، یان لە دەستەیەك بێت بە

---

[١] اختصار علوم الحديث ص١٠٧.

[٢] الفرق بين الفرق ص١٠٣.

موباح کردنی درۆ لە پێناو ئارەزووەکانیاندا ناسرابن، بۆ ئەو مەبەستە بووە ریوایەتی رافیزەکانیان رەد کردووەتەوە، و ریوایەتی هەندێ شیعەیان قبوولّ بووە کە بە ئەمانەت و صدق بەناوبانگ بوون، هەروەك چۆن ریوایەتی کەسی بیدعەچییان قبـوولّ کـردووە گەر خۆی و دەستەکەی درۆیان بە حەلاڵ نەبینی بێت، وەك **"عمران بن حطان"**.

٤. **زەندیقەکان و فاسیقان و گەمژەکان** کە نازانن چی دەگێڕنـەوە، بـە هـەمان شێوە هەموو ئەوانەی مەرجەکانی دەرخ و عەدالەت و تێگەیشتنیان تێدا نییـە: **"ابن کثیر" دەڵێت:** ((قبوولّکراو بریتییە لە: متمانەداری دەرخکـەر بـۆ ئـەوەی دەیگێڕێتەوە، ئەو کەسەش لە هۆکارەکانی فیسق و رووخانی جوامێری و پیاوەتی کەسێکی موسڵمانی ئاقڵی بالغی تەندروست بێت، هەروەها کەسێکی بەئاگا بێت و گەمژە نەبێت، دەرخکەر بێت بۆ ئەو شتەی دەرخی کردووە و تێگەیشتوو بێت کاتێك قسە لە مانا دەکـات، گـەر یـەکێك لـەم مەرجانـە ناتـەواوی تێکـەوت ریوایەتەکەی رەد دەکرێتەوە))[١].

**ئەو راویانەش وەستان هەیە بـۆ قبـوولّی ریوایەتـەکانیان چـەند پـۆلێکن، گرنگترینیان:**

١. هەرکەس جیاوازی هەیە لەسەر لەکەدارییەکەی و راستکردنەوەکەی(**تجریحە و تعدیلە**).
٢. هەرکەس هەڵەی زۆر بێت و سەرپێچی ئیمامـە خـاوەن متمانـەکان بکـات لـە ریوایەتەکانیاندا.
٣. هەرکەس لەبیرچوونەوەی زۆر بێت.
٤. هەر کەس لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا تێکەڵی کردبێت.
٥. هەرکەس لەبەرکردنی(دەرخکردنی خراپ بێت)
٦. هەرکەس لە متمانەدار و لاوازیش فەرموودە وەربگرێت و پشکنین نەکات.

---
[١] إختصار علوم الحديث.

**چوارەم: دانانی کۆمەڵێك ڕێسای گشتی بۆ دابەشکردنی فەرموودە و جیاکردنەوەی:**

**ئەوەش لەبەر ئەوەی فەرموودەیان دابەش کردووە بۆ سێ بەش: سەحیح و حەسەن و لاواز(ضعیف)**

**ڕادەی سەحیح:**

ئەو فەرموودەیە سەنەدەکەی بە گواستنەوەیەکی عادیلی دەرخکەر لە هاوشێوەی خۆیەوە پەیوەست بووە تا دەگاتە سەر پێغەمبەر(ﷺ) یان تا کۆتاییەکەی لە هاوەڵان یان لە خوار ئەوانەوە، فەرموودەکە شاز و ڕەدکراوە و عیللەتدار(**شاذ، مردوود، معلل**) نەبێت بە عیللەیەکی عەیبدارکەر[1]، گەر لە سەنەدەکەدا هاوەڵی پێغەمبەری تێدا نەبوو فەرموودەکە مورسەلە، لای جمهوری ئەهلی فەرموودە بەڵگەی پێ ناهێنرێتەوە و لە پلەی سەحیح دابەزیوە و لە نێوان فەقیهاندا جیاوازی تێدایە.

**حەسەن:**

لە ڕادەی حەسەندا جیاوازیان لە نێواندا هەیە، چونکە وەك ئیبن صلاح دەڵێت: لەبەر ئەوەی لە ناوەندی سەحیح و لاوازدایە-لە دیدی سەیرکەرەکەوە نەك لە خودی خۆیدا- گوزارشتدان لێی و دیاریکردن و وردکردنەوەی لەسەر زۆرێك لە ئەهلی ئەم پیشەیە دژوارە، ئەوەش لەبەر ئەوەی بارێکی ڕێژەییە و لە لای کەسی لەبەرکەر(**الحافظ**) نەنگییەکی تێدا هەیە و لەوانەیە گوزارشتدان لێی ئەستەم بێت، پاشان گوزارەیەکی بۆ هەڵبژاردووە بە وتنی: ((فەرموودەی حەسەن دوو بەشە:

**(یەکەمیان)** ئەو فەرموودەی پیاوانی سەنەدەکەی خاڵی نیین لە شاراوەیەك، لێوەشاوەییان نەهاتووەتە دی، بەڵام لەگەڵ ئەوەش کەسێکی گەمژەی هەڵە زۆر نیین، و بە درۆ تۆمەتبار نەکراون، و هاوشێوەی مەتنی فەرموودەکە لە ڕوویەکی ترەوە ڕیوایەت کراوە))

---

[1] اختصار علوم الحديث ص٦.

**(دووەم)** ئەوەیە راوییەکانی بە راستگۆیی و ئەمانەت بەناوبانگ بن و نەگەنە پلەی پیاوانی فەرموودەی سەحیح لە لەبەرکردن و وردەکاریدا، و ئەوەی پێی تەنهابووەتەوە بە مونکەر(نەناسراو) ناژمێررێت و مەتنەکەش شاز و عیللەتدار نییە))[1].

لای پێشینەکان لە ئەهلی فەرموودەی سەدەی یەك و دوو بەشێك لە فەرموودە بوونی نەبوو زاراوەی "حەسەن"یان بۆ دانابێت، بەڵکو لە چاخی ئەحمەد و بوخاریدا هاتە ئاراوە و دواتر بەناوبانگ بوو.

**لاواز (الضعیف):**

ئەمەش بەشی سێیەمی جۆرەکانی فەرموودەیە لەلایان، ئەوەش ئەوەیە سیفەتەکانی سەحیح و سیفەتەکانی حەسەنی تێدا کۆنەبوبێتەوە، ناویان ناوە لاواز لە سۆنگەی سەرهەڵدانی لاوازییەوە تیایدا جا یان لە سەنەدەکەیدا یان لە مەتنەکەیدا.

## لە جۆرەکانی لاواز:

**مورسەل:**

ئەوەیە کەسێکی شوێنکەوتوو(**تابعي**) بەرزی بکاتەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) بەبێ ئەوەی باسی هاوەڵەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بکات.

**ئیمامی مسلم لە پێشەکی سەحیحەکەیدا دەڵێت:** ((فەرموودەی مورسەل لە بنچینەی بۆچوونی ئێمەدا و بۆچوونی ئەهلی زانست بە فەرموودە ناکرێتە بەڵگە)).

ئەمەش زیادە وردکردنەوەیەك بووە زانایان بۆ جیاکردنەوەی فەرموودە گرتوویانەتە بەر، ئەگینا گەر کەسە شوێنکەوتووەکە(**تابعي**) کەسێکی دادپەروەر بێت دەبێ چ زیانێك بە فەرموودەکە بگەیەنێت؟!

[1] إختصار علوم الحدیث ص٢٨.

**هەروەها لە جۆرەکانی فەرموودەی لاواز:**

١. **پچڕاو(المنقطع):**

ئەوەیە لە سەنەدەکەیدا یەکێك بزر بێت جگە لە هاوەڵان، یان پیاوێکی نەناسراو تیایدا باس بکرێت.

٢. **گرفتاوی(المعضل):**

ئەوەیە لە سەندەکەیدا دوو و بەرەوژوور لە کەسەکان بزر بن، هەروەها لەوانە ئەوەیە شوێنکەوتەی شوێنکەوتووان فەرموودەکە بداتە پاڵ پێغەمبەر(ﷺ)

٣. **شاز:**

ئەوەیە کەسێکی متمانەدار فەرموودەیەکی گێڕابێتەوە پێچەوانەی ئەوە بێت خەڵکی دەیگێڕنەوە، ئەمە دەبێ لەسەری بوەستی.

لەبەرکەرانی فەرموودە(**الحافظ**) دەڵێن: بریتییە لەو فەرموودەی تەنها یەك سەنەدی هەیە و پێی شاز دەبێتەوە، یەکسانە کەسی متمانەدار پێی شاز ببێتەوە یان کەسی بێمتمانە، لەوەی متمانەدار پێی شاز بووەتەوە وەستان هەیە، و ئەوەی بێمتمانە پێی شاز بووەتەوە رەد دەکرێتەوە.

٤. **نەناسراو(منکر):**

ئەوەیە راوییەك کە نە عەدلی هەیە و نە دەرخ پێی شاز ببێتەوە، ئەو جۆرە لە فەرموودە رەد دەکرێتەوە و قبووڵ ناکرێت.

٥. **لەرزۆك (المضطرب):**

ئەوەیە چەند ریوایەتێکی فەرموودە لە مەتن و سەنەدیدا جیاوازی هەبێت، نەتوانرێت پارسەنگی یەکێکیان بەسەر ئەوانیتردا بدرێت بە هۆی یەکسان بوونیان لە دروستی و ریوایەتی متمانەدار، ئەم جۆرە لاوازە، بەڵام گەر جیاوازییەکە لە ناوی راویەکە یان ناوی باوکی یان دانەپاڵیدا بێت و کەسەکە جێی متمانە بێت لەو بارەدا بڕیاری سەحیحی فەرموودەکە دەدرێت.

# دانراو( الموضوع ) و نیشانەکانی

وەك چۆن زانایان کۆمەڵێك ڕێسایان بۆ سەحیح و حەسەن و لاواز داناوە بە هەمان شێوە کۆمەڵێك ڕێسایان بۆ ناسینی دانراو(هەڵبەستراو) داناوە و نیشانەکانیان باسکردووە تاکو پێیاندا بناسرێتەوە.

ئەو نیشانانەی بەڵگەن لەسەر "دانان"(هەڵبەستن) دابەش دەکەین بۆ دوو بەش: نیشانەکان لە "سەند"دا و نیشانەکان لە "مەتن"دا:

**نیشانەکانی دانان لە سەنەددا:**

**ئەمانەش زۆرن لە گرنگترینیان:**

١. راویەکەی درۆزن بێت و بە درۆ بەناوبانگ بێت و کەسی متمانەدار نەیگێڕێتەوە جگە لەو درۆزنە(زانایان گرنگی زۆریان داوە بە ناسینی درۆزنان و مێژووەکانیان و شوێنی ئەوانە کەوتوون درۆیان لە فەرموودەدا کردووە بە جۆرێك هیچ کام لەوانە لە دەستیان دەرنەچووە).

٢. دانەرەکەی بۆ خۆی دانبنێت بە دانانیدا، وەك چۆن **"أبو عصمة نوح بن أبي مريم"** دانی نا بە دانانی(هەڵبەستنی) فەرموودەی خێر و چاکەی خوێندنی سورەتەکانی قورئان.

٣. راوییەك لە زانایەکەوە بیگێڕێتەوە بەو کەسە(واتە بەو زانایە) نەگەیشتبێت یان دوای مردنی ئەو کەسە ئەم لەدایك بووبێت، یان نەچووبێتە ئەو شوێنەی بانگەشەی ئەوە دەکات سەردانی کردبێت، وەك چۆن **"مأمون بن أحمد الهروي"** بانگەشەی بینینی "هشام بن عمار"ی کرد، ئیبن حبان پرسیاری لێکرد کەی سەردانی شامت کرد(واتە رۆیشتی بۆ لای ئەو پیاوە، چونکە خەڵکی شام بوو) وتی: ساڵی دووسەد و پەنجا، ئیبن حبان وتی: هشامی کوڕی عەمار کە تۆ دەڵێی لەوت وەرگرتووە ساڵی دووسەد و چل و پێنج مردووە(واتە پێنج ساڵ پێشتر).

٤. هەندێ جار لە حاڵی راوییەکە و پاڵنەرە دەروونییەکانەوە هەست بە دانانی فەرموودەکە دەکرێت.

وەك ئەوەی **"الحاكم"** لە **"سيف بن عمر التميمي"** دەیگێڕێتەوە دەڵێت: لە لای **"سعد بن طريف"** دانیشتبووین، کوڕەکەی لە خوێندن(قوتابخانە) بە گریـان هاتـەوە، لێـی پرسی: بۆ دەگریت؟ وتی: مامۆستاکەم لێیدام، سەعد وتی: ئەمڕۆ رسوایان دەکەم.

**"عیکریمـە لــە ئـیبن عەباســەوە" بــە بــەرزکراوەیی دەگێڕێتــەوە وتوویــەتی:** ((مامۆستایانی منداڵەکانتان خراپترین کەسی ئێوەن، کەمترین بەزەییان بە منـداڵی بیٚ باب هەیە و دڵڕەقترینن لەسـەر هـەژاران و گـەدایان))، یـان بـەناو فـەرموودەی هەڵبەستراو: ((هەریسە پشت بەهێز دەكات)) دانەرەکەی **"محمد بن الحجاج النخعي"** بوو "هەریسە"ی دەفرۆشت.

## نیشانەكانی "دانان" لە مەتندا:

### زۆرن، گرنگترینیان:

١. **ناڕەوانی و ناڕێکی گوزارەکەی:** بە جۆرێك کەسی شارەزا بە نهێنییەکانی زمانی عەرەبی دەزانێت ئەو گوزارشتە ناڕەوانە لە کەسێکی زمان پـاراو و رەوانبێـژی وەك سەروەری رەوانبێژان(پێغەمبەر(ﷺ) دەرناچێت.

٢. **تێكچـــوونی ماناكـــەی:** وەك ئـــەوەی فەرموودەكـــە پێچـــەوانە بێـــت بـــە بەڵگەنەویستەکانی ئەقڵ و جێگەی تـەئویلیش نـەبێت، وەك ئـەو بەناوفـەرموودەی دەڵێت: ((کەشتییەکەی نوح حەوت جار تەوافی ماڵی خودای کرد و دوو رکات نوێژی لە مەقامدا کرد))، یان بە پێچەوانە بێت بە رێسا گشتییەکان لە حوکم و ئەخلاقدا، وەك: ((ستەمی تورك نەك دادپەروەری عەرەب))، یان بانگ بکات بۆ ئارەزوویـەکی تێکدەرانە، وەك ((سەیر کردنی رووی جوان چاو رۆشن دەکاتـەوە))، یـان پێچـەوانە بێت بە هەست و بینین، وەك: ((لە دوای سەدی کۆچی منداڵێك لەدایك نابێت خودا پێویستییەکی پێی هەبێت(واتە بۆ خودا سوڵحاو بێت)))، یـان پێچـەوانە بێـت بـە رێساکانی پزیشکی، وەك ((باینجان شفایە بۆ هەموو نەخۆشییەك))، یان پێچـەوانە بێت بەوەی ئەقڵ پێویستی دەکات لە پاکێتی و کەماڵی خودا، وەك ((خودا ئەسپی دروست کرد و لێیخوڕی، ئەویش ئارەقەی کردەوە، بۆیە نەفسی خۆی لەوەی دروست

کرد))، یان پێچەوانە بێت بە بڕاوەکانی مێـژوو و سـوننەتی خـودا لـە گـەردوون و مرۆڤدا، وەك بەناوفەرموودەی: ((عەوجی کوڕی عونق درێژییەکەی سێ هـەزار بـاڵ بوو، کاتێك نوح ترسی نوقمبوونی هەبوو وتی: لەم قەسعەی خۆتدا هەڵمبگرە، واتـە ئەم کەشتییە، تۆفانەکە نەدەگەیشتە قولاپێی، دەستی دەخسـتە نـاو بـنی دەریـا و ماسی دەردەهێنا و لە نزیك خۆر دەیبرژاند)).

**هەروەها لەو جـۆرە بەناوفەرموودانـە:** ((رەتـنی هنـدی شەشسـەد سـاڵ ژیـا و بـە پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) گەیشـت))، یـان هەنـدێ شـتی بێمانـای تێـدا بێـت وەك: ((کەڵەشێری سپی خۆشەویستی من و خۆشەویستی خۆشەویستەکەمە جبریل)).

**ئیبن جەوزی دەڵێت:** ئەو قسەیە چەند جوان و پەسەندە کە دەڵێت: ((هەر فەرموودەیەکم بـینی پێچـەوانەی ئـەقڵ بێـت و ئەسـڵێك لـە ئەسـڵەکان هەڵبوەشـێنێتەوە و لـەوەی گوازراوەتەوە -لە راست و دروست- جیا ببێتەوە بزانە ئەو فەرموودەیە هەڵبەستراوە)).

**"الـرازي" لە "المحصول"دا دەڵێت:** هەر هەواڵێك باتڵێك ئەندێشە بکـات و تـەئویل قبووڵ نەکات ئەوە بەدرۆخراوەیە یان شتێکی ناتەواوە کە ئەندێشەکە دەڕەوێنێتەوە)).

٣. **پێچەوانە بێت لەگەڵ ئاشکرای** قورئاندا، بە جۆرێك تەئویل قبووڵ نەکات، وەك ((منداڵی زینا تا حەوت نەوە ناچنە بەهەشتەوە))، ئەمە پێچەوانەیە لەگەڵ ئایەتی: **﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾ الأنعام: ١٦٤**

هەروەها پێچەوانە بێت لەگـەڵ سـوننەتی متـەواتیردا وەك: ((گـەر بـە دەم منـەوە فەرموودەیەکتان گێڕایەوە و لەگەڵ حەقدا تەبا بوو کاری پێ بکـەن مـن وتبێـتم یـان نـەموتبێت)) ئـەم بەناوفەرموودەیـە پێچـەوانەیە لەگـەڵ فـەرموودەی متـەواتیری: ((هەرکەس بەئەنقەست درۆم بە دەمەوە بکات با شوێنی خۆی لە ئاگردا خۆشبکات))، یان پێچەوانە بێت بەو رێسا گشتییانەی لە قورئان و سوننەتەوە وەرگیراون، وەك ((هەر کەس کوڕێکی ببێت و ناوی بنێت محەمەد ئەوا ئەو و منداڵەکەی لە بەهەشتدا

٤. **پێچەوانەی راستەقینە مێژووییە ناسراوەکان بێت لە چاخی پێغەمبـەردا**(ﷺ) **وەك بەناوفەرموودەی:** پێغەمبەر(ﷺ) جزیەی لەسەر ئەهلی خەیبـەر دانـا و گرانـی و دژواری

لەسەر هەڵگرتن))، ئەوەی لە مێژوودا جێگیرە ئەوەیە جیزیە لەساڵی خەیبەردا نە زانـرا بوو نە تەشریع کرابوو، بەڵکو ئایەتی جیزیە دوای ساڵی تەبوك دابەزی.

**٥. بەناوفەرموودەکە تەبایی هەبێت لەگەڵ مەزهەبی ئەو کەسەی دەیگێڕێتــەوە:** ئەو کەسێکی زیادەڕەوی دەمارگیر بێت، وەك ئەوەی کەسێکی رافیـزە دەیگێڕێتــەوە دەربارەی گەورەیی و چاکەکانی ئەهلولبەیت، کەسێکی مورجیئە بەناوفەرموودەیەك دەربارەی **"إرجاء"** دەگێڕێتەوە.

وەك ئەوەی **"حبة بن جوين" دەیگێڕێتەوە و دەڵێت:** گوێم لە عەلی بوو(خوا لێی رازی بێت) فەرمووی: لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێنج یان حەوت ساڵ خـودام پەرسـت بەر لەوەی هیچ کەس لەم ئومەتە بیپەرستێت)).

**ئیبن حبان دەڵێت: "حبة"** لە شیعەگەریدا کەسێکی توندڕەو بوو، فەرموودەشـی لـێ تێکدەچوو(لا تێکەڵ دەبوو).

**٦. فەرموودەکە شتێك لەخۆ بگرێت ببێت بە پاڵنەر بۆ گواستنەوەکەی،** چـونکە لە جێگەیەکی مەزندا روویداوە و پاشان ناوبانگی دەرنەکردووە و تەنها یـەك کـەس باسی کردوون وەك نموونەی فەرموودەی **"غدير خم"** کە ئەهلی سوونە بڕیـاری درۆ و هەڵبەسـتنیان لەسـەر داوە. **زانایـان دەڵـێن:** لـە نیشـانەکانی هەڵبەسـتنی ئـەو بەناوفەرموودە ئەوەیە باسی ئەوە دەکات فەرموودەکە لـە نـاو کۆمـەڵێکی زۆر لـە هاوەڵاندا روویداوە، پاشان هەموو هاوەڵان بڕیـار دەدەن فەرموودەکـە بشـارنەوە لـە کاتی بوون بە خەلیفەی ئەبوبەکردا(خوا لێی رازی بێت)، نموونەی ئەمە دوور و محاڵە لە راستی و واقیعەوە، تەنهاکەوتنەوەی رافیزە بە گواستنەوەی ئەم بەناوفەرموودەیە بەبێ کۆمەڵی موسڵمانان بەڵگەی درۆیانە تیایدا.

**٧. فەرموودەکە زیادەڕەوی تێدا بێت لە پاداشتی گەورە لەسـەر کـار و کـردەوەی بچـووك،** هـەروەها زیـادەڕەوی لـە هەڕەشـە و سـزا لەسـەر گونـاهی بچـووك، چیرۆکخوانەکان لـەم جۆرەیـان زۆر هەڵبەسـتووە بـۆ نـەرمکردنی دڵـی خـەڵکی و دروستکردنی سەرسوڕمان لەلایان، وەك((هەر کەس نوێـژی چێشـتەنگاو ئەوەنـدە و ئەوەندە رکات بکات خێری حەفتا پێغەمبەری بۆ دەنوسرێت)).

# بەشی چوارەم

# لە بەری بەرهەمی ئەم تێکۆشانە

بەو تێکۆشانە سەرکەوتووانە کارەباری شەریعەت بە دامەزرانی پایەکانی سوننەت کە دووەم سەرچاوەی شەریعەتی ئیسلامە هاتە راستە، و موسڵمانان لە فەرموودەی پێغەمبەرەکەیان دڵنیابوونەوە و هەموو ئەوانەی خزێنرابوونە ناو سوننەتەوە جیاکرانەوە و سەحیح لە حەسەن و لاواز جیاکرایەوە و خودا شەرعەکەی خۆی لە گاڵتەجاڕی گاڵتەجاڕان و پیلانی پیلانگێڕان لە زەندیق و شوعوبی پارێزگاری لێ کرد، موسڵمانان بەری ئەو راپەڕینە مەزنە موبارەکەیان چنییەوە.

## لە دیارترینی بەری ئەو تێکۆشانە:

### یەکەم: تۆمارکردنی سوننە:

خەریکە ریوایەتەکان کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی یەکەمین کەسێك بیری لە تۆمارکردنی سوننە کردبێتەوە بریتییە لە عومەری کوڕی عبدالعزیز، نامەیەکی نارد بۆ **"أبي بكر بن حزم"** والی و قازی شاری مەدینە و تیایدا نووسی: ((بگەڕێ و سەرنج بدە لەوەی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) و بینووسەوە، چونکە من لە تیاچوونی ئەو زانستە و نەمانی زانایان دەترسم))، وا دەردەکەوێ نامەی بۆ هەموو وڵاتان و گەورە زانایان ناردووە و هەمان داوای لێکردوون.

**ئەبو نەعیم لە "تأريخ الأصبهان" نووسیویەتی:** ((عومەری کوڕی عبدالعزیز بۆ هەموو وڵاتەکانی نووسی: بگەڕێن بەدوای فەرموودەی پێغەمبەردا(ﷺ) و بینووسنەوە، ئەوەی دەردەکەوێ ئەوەیە "أبوبكر بن حزم" شتێکی لە سوننەت بۆ عومەر نووسیوە، بەتایبەت ئەو فەرموودانەی لای **"عمرة بنت عبدالرحمن الأنصاري و القاسم بن محمد بن أبي بكر"** بوون، بەڵام هەموو ئەوەی لە مەدینە بوو لە سوننەت و لە ئەسەر تۆمار

نەکران، بەڵکو ئەو کارە ئیمام**"محمد بن مسلم بن شهاب الزهري"**(١٢٤هـ) ئەنجامیدا کە ئاڵایەکی شەکاوە بوو لە چاخی خۆیدا، ئەو کەسە بوو عومەری عبدالعزیز فەرمانی بە ئەهلی مەجلیسی خۆی دەکرد بچن بۆ لای، چونکە کەسێك نەماوە لەسەر رووی زەوی لە ئەو زاناتر بێت بە سوننە.

هەروەها ئەوەی دەردەکەوێت ئەوەیە تۆمارکردنی **"الزهري"** بۆ سوننە وەك ئەو تۆمارکردنە نەبووە کە لەسەر دەستی بوخاری و مسلم و ئەحمەد و کەسانی تر لە پیاوانی مەسنەد ئەنجام دراوە، بەڵکو بریتی بووە لە تۆمارکردنی هەموو ئەوەی بیستوویەتی لە فەرموودەی هاوەڵان بەبێ دەروازە بۆ دانان لەسەر دەروازەی زانستی، لەوانەیە هەندێك لە فەرمووده بە قسەی هاوەڵان و فتوای شوێنکەوتووان تێکەڵ کرابێت، ئەمەش سروتی سەرەتای هەموو کارێکی نوێیە، بەم جۆرە **"الزهري"** یەکەمین کەسە بەردی بناغەی بۆ تۆمارکردنی سوننە داناوە لە کتێبی تایبەتدا، پاشان تۆمارکردن بڵاوەی کر.

یەکەمین کەسێك لە چاخی **"الزهري"**دا لە شاری مەککە فەرموودەی کۆکردەوە "ابن جريج"(١٥٠هـ) و "ابن إسحاق"(١٥١هـ) بوون.

لە مەدینە سەعیدی کوڕی ئەبی عروبە(١٥٦هـ) و "الربيع بن صبيح"(١٦٠هـ) و ئیمامی مالیك(١٧٩هـ).

لە بەصرە: حەمادی کوڕی سەلەمە(١٦٧هـ).

و لە کوفە: سوفیانی سەوری(١٦١هـ).

و لە شام: ئەبو عەمری ئەوزاعی(١٥٧هـ).

و لە واسیت هەشیم(١٧٣هـ).

و لە خوراسان: عەبدوڵای کوڕی موبارەك(١٨١هـ).

لە یەمەن: مەعمەر(١٥٤هـ).

لە رەی: جەریری کوڕی عبدالحميد(١٨٨هـ).

هەر بەو جۆرە سوفیانی کوڕی عوییینــە(١٩٨ھ) و لەیسـی کـوڕی سـەعد(١٧٥ھ) و شوعبەی کوڕی حەجاج(١٦٠ھ)، هەموو ئەمانە لـە یـەك چـاخدا ژیـاون و نازانرێـت کامیان لـەو کـارەدا دەستپێشـخەر بـوون، کارەکـەیان بـەو جـۆرە بـوو فـەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) کۆبکەنەوە هاوڕێ لەگەڵ فەرموودەی هـاوەڵان و فتـوای شـوێنکەتووان لەگەڵ دانەدەمیەکتری دەروازەکان هەندێکی بۆ لای هەندێکی تر لە یەك کتێبدا.

پاشان سەدەی سێ هاتەبەرەوە کە گەشاوەترین چاخی سوننە و بەختەورترین بـوو بـۆ ئیمامانی فەرموودە و دانراوە نـەمرە مەزنـەکانیان، لـەم چـاخەدا لەسـەر رێچـکەی مەسانید دەستیان بە دارِشتنی کتێبەکانیان کرد.

**مەسانید:** کۆکردنەوەی هەموو ئەو فەرموودانەی هاوەڵێك ریوایەتی کـرد بـوو لـە یەك دەروازەدا سەرەڕای فرەیی بابەتەکانی پێی دەوترا مەسانید، یەکەمین کەسێك ئەو کارەی ئەنجامدا **"عبدالله بن موسى العبسي الكوفي"** و **"مسدد البصري"** و **"أسد بـن موسى"** و **"نعيم بن حماد الخزاعي"** بوو.

پاشان لەبەرکەرانی (**الحافظ**) فەرموودە شوێنپێی ئـەوانیان هـەڵگرت، بۆیـە ئیمـام ئەحمەد مەسنەدە بەناوبانگەکەی دانا، هەر بەو جۆرە "**إسحاق بن راهويه و عثمان بـن أبي شيبة**"، رێگەی ئەمانە بەو جۆرە بوو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) تۆمار بکەن نـەك فـەرموودەی هـاوەڵان و فتـوای شـوێنکەوتووان، بـەڵام لـەم کارەیانـدا سـەحیح و ناسەحیحیان بەیەکتر تێکەڵ کرد بوو، ئەوەش ئـەرك و زەحمـەتێکی زۆری بـۆ ئـەهلی فەرموودە دروست کرد بوو، چونکە نەیاندەتوانی سەحیحەکان جیابکەنەوە مەگـەر لـە ئیمامێکی خاوەن شانوشکۆوە، ئەگەر نە، فەرموودەکە بە نەزانراوی لای دەمایەوە.

ئەمەش وایکـرد وا لـە ئیمـامی ئـەهلی فـەرموودە محەمـەدی کـوڕی ئیسـماعیلی بوخاری(٢٥٦ھ) بکات لە دانانی کتێبەکەیدا رێگەیەکی نوێ بگرێتە بەر، بەوەی تەنها خۆی لەسـەر فـەرموودەی سـەحیح کورتبکاتـەوە بـەبێ دەسـتبردن بـۆ ئـەوانی تـر، کتێبەکەی خۆی دانا بە ناوی "الجامع الصحيح"ی بەناوبانگ.

لەسـەر هـەمان رێچـکەی ئـەو قوتابییەکـەی ئیمـامی **"مسـلم بـن الحجـاج القشـيري"**(٢٦١) سەحیحە بەناوبانگەکەی بە ناوی **"صحيح مسلم"** دانا، ئەم دوانـە

به ڕێخۆشکردنیان چاکەیان بەسەر هەموو ئەوانەوە هەیە بەدوای فەرموودەدا دەگەڕان تاکو بگەنە فەرموودەی سەحیح بەبێ باس و پرسیار.

بەدوای ئەواندا زۆرێك شوێنیان کەوتن و زۆرێك لە کتێب نووسران، گرنگترینیان: "**سنن أبي داود**(٢٧٥هـ) و **سنن النسائي**(٣٠٣هـ) و **جامع الترمذي**(٥٢٧٩) و **سنن ابن ماجة**(٢٧٣هـ)"ن.

پاشان سەدەی چوار هات و پیاوانی ئەو سەدەیە شتێکی تازەیان نەخستە سەر ئەوەی پیاوانی سەدەی سێ پێی هەستابوون، مەگەر کەمێکی زۆر کەم، لە بەناوبانگترین ئیمامانی ئەم سەدەیە "**سليمان بن أحمد الطبراني**"ە(٣٦٠هـ) کە سێ موعجەمەکەی خۆی دانا:

١. گەورەکەی تەرخان کرد بۆ ئەو فەرموودانەی هەر هاوەڵێك سەربەخۆ دەیگێڕێتەوە و ناوی هاوەڵانی بەپێی پیت ڕێکخست، ئەمەش بریتییە لە پێنجسەد و بیست و پێنج هەزار فەرموودە.

٢. ناوەند.

٣. بچووك لەم دوانەی دوایدا ئەو فەرموودانەی باس کردووە کەر هەر شێخێك سەربەخۆ لە شێخەکانی خۆیەوە دەیگێڕێتەوە، ناوی شێخەکانی دیسان لەسەر پیت ڕێخستووە، هەروەها لەوانە "**الدار القطني**"(٣٨٥هـ) کە سوننەنە بەناوبانگەکەی خۆی دانا و "**ابن حبان البستي**"(٣٥٤هـ) و "**ابن خزيمة**"(٣١١هـ) و "**الطحاوي**"(٣٢١هـ).

بەم جۆرە سوننە تۆمارکرا و کۆکرایەوە و سەحیحی لەوانی تر جیاکرایەوە.

زانایانی دوای ئەوان کەمێکی زۆر کەم نەبێت لە پیاگەیشتن شتێکیان نەخستە سەر ئەو زانستە، لەو پیاگەیشتنانە لەسەر کتێبە سەحیحەکان: "مستدرك"ی "**أبي عبدالله الحاكم النيسابوري**"(٤٠٥هـ) کە بە کۆمەڵێك فەرموودەدا گەیشتووە لەسەر "بوخاری و مسلم" پێیوایە ئەوانە سەحیحن و تەبان لەگەڵ ئەو مەرجانەی بوخاری و مسلم بۆ فەرموودەیان داناوە لەگەڵ ئەوەی ئەو دوو ئیمامە لە سەحیحەکانیاندا تەخریجیان نەکردووە، زانایان-بەناوبانگترینیان زەهەبی- خۆیان رادەستی بەشێکی کردووە و لە بەشێکی تریدا لەگەڵی جیاوازن.

**دووەم: زانستی زاراوەی فەرمووده:**

لە بەری ئەم بزاڤە موبارەكە تۆماركردنی ئەو ڕێسایانە بوو زانایان بـۆ بەرەنگاربوونـەوەی هەڵبەستنی فەرمووده دایانڕێژان، وەك باسمان كرد فەرموودەیان بۆ سێ بەش و ئەوەی بـەو بەشانەوە پەیوەست دەبێت دابەش كـرد بـەو جـۆرە بـووین بـە خـاوەنی زانسـتی زاراوەی فەرمووده كە ڕێسای زانستی بۆ ڕاستكردنەوەی هـەواڵ(خبر) دادەڕێـژێت، زانایـانی ئێمـە یەكەمین كەسن ئەو ڕێسایانەیان داڕشتووە لەسەر بنچینەیەكی زانسـتی تۆكمـە، زانایـانی پێشین هەمان ڕێچكەیان لە مەیدانەكانی تری زانستدا گرتووەتە بەر، وەك مێژوو و فیقە و تەفسیر و زمان و ئەدەب، لە دانراوە زانستییەكاندا هەر پرس و باسێك لە چاخی یەكەمدا بە سەنەدێكی لكاو(سند متصل) بەو كەسەی قسەكەی كردووە گرێدەدرا، تەنانەت كتێبی زانایان لەلایەن قوتابییەكانیانەوە بە سـەنەدی لكاو(سـند متصـل) نـەوە لـەدوای نـەوە گواستوویانەتەوە، ئێمە لە ئەمڕۆدا گومانمان نییە سەحیحی بوخـاری-كـە لەبـەر دەسـتی موسڵماناندایە- دانراوی ئیمامی بوخارییە، چونكە نەوە لـەدوای نـەوە و بـە سـەنەدێكی پەیوەست لە ئەویان گێڕاوەتەوە، ئەم تایبەتمەندییە لە زانایانی ئومەتانی تردا بوونی نییـە، تەنانەت لە كتێبە پیرۆزەكانیاندا.

یەكەمین كەسێك هەندێ لە باسی ئەم زانستەی نووسیوە **"علي بـن المـديني"**(شـێخی بوخاری) بووە، هەر بەو جۆرە بوخاری و مسلم لەسەر ئەم زانستە قسەیان كـردووە، و **"الترمذي"**ش لە هەندێ باسدا.

بەڵام یەكەمین كەسێك كتێبی لەم هونەرەدا دانا بە دانانێكی زانسـتی، بـە جۆرێـك هەموو دەروازەكانی باسەكان لە یەك دانراودا كۆبكاتەوە بریتی بوو لە **"القاضـي أبـو محمد الرامهرمزي"**(٣٦٠هـ) لە كتێبەكەیدا: **"المحدث الفاصل بين الراوي والسامع"**.

پاشان **"الحاكم أبو عبدالله النيسـابوري"**(٤٠٥هـ مردووە) كتێبێكـی دانـا بـە نـاوی **"معرفة علوم الحديث"**.

پاشان ئەبو نەعیم ئەصفەهانی(٤٣٠هـ) لەسەر كتێبەكـەی **"الحـاكم"** كتێبێكـی دەرهێنا.

پاشان "**الخطيب أبوبكر البغدادي**"(٤٦٣هـ) هات و له یاساکانی ریوایەتدا کتێبێکی بە ناوی "**الكفاية**" دانا، له ئادابی ریوایەتیشدا کتێبێکی دانا بە ناوی"**الجامع لآداب الشيخ والسامع**".

پاش ئەو "**القاضي عياض**"(٥٤٤) هات و کتێبی "**الإلماع**" دانا کە لە کتێبەکانی "**الخطيب**" سەرچاوەی گرتبوو.

پاشان "**أبو عمرو عثمان بن الصلاح الشهرزوري**"(٦٤٣هـ) هات و کتێبە بەناوبانگەکەی دانا بە ناوی"**مقدمة ابن الصلاح**"، ئەمەش کتێبێکی گشتگیرترە لە هەموو ئەوانەی پێش خۆی دانرا بوون، بۆیە چەندین کەس بەدوایدا هاتن و کەوتنە لێکدانەوە و شەرحکردنی ئەو کتێبەکە وەك"**التقريب**"ی نەوەوی و "**التدريب**"ی "**السيوطي**"، پاشان ئیمامی "**ابن كثير**" پوختەی کردووە لە کتێبێکدا بە ناوی "**اختصار علوم الحديث**".

**سێیەم: زانستی جەرح و تەعدیل (تانەلێدان و راستکردنەوە):**

لە بەری ئەو تێکۆشانە موبارەکە هاتنە ئارای زانستی جەرح و تەعدیلە یان زانستی ترازووی هەڵسەنگاندنی پیاوان، ئەوەش ئەو زانستەی لە حاڵ و باری راوییەکان و ئەمانەتداری و متمانە و دادپەروەری و دەرخیان یان پێچەوانەی ئەمانە دەکۆڵێتەوە، لە درۆ و بێئاگایی و لەبیرچوون.

بە بوخاری وترا هەندێ کەس کتێبی "التأريخ"ت بەباش نابینن و دەڵێن: غەیبەتی خەڵکی تێدا کردووە، ئەویش فەرمووی: ئێمە ئەوەمان وەك ریوایەت گێڕاوەتەوە و لە خۆمانەوە نەمانگواستووەتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: "**بئس أخو العشيرة**- خراپترین برای عەشرەت"(واتە وشەی خراپترینی بەکارهێناوە).

لە چاخی هاوەڵە گەنجەکانەوە وەك ئیبن عەباس(٧٨هـ) و ئەنەسی کوڕی مالیك(٩٣هـ)ەوە رەخنە لە راوی فەرموودە دەستی پێکردووە.

دوای ئەوانیش شوێنکەوتووان وەك سەعیدی کوڕی موسەیب(٩٣هـ) و ئیبن سیرین(١١٠هـ).

پاشان کارەکە بەردەوام بــوو، شــوعبە(١٦٠ھ) لــە پیــاوان کۆڵاوەتــەوە و تــەنها لــە متمانەدارەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە.

هەروەها ئیمامی مالیك(١٧٩ھ)، بەناوبانگترین زانا لە سەدەی دووەمدا لە زانســتی جــەرح و تەعدیلــدا بریتییــە لــە "معمــر"(١٥٤ھ) و هشــام الدســتوائی(١٥٤ھ) و ئەوزاعی(١٥٧ھ) و ســەوری(١٦١ھ) و حــەمادی کــوڕی ســەلەمە(١٦٧ھ) و لەیســی کوڕی سەعد(١٧٥ھ).

لەدوای ئەمانە چینێکی تر ســەریهەڵدا وەك عەبــدوڵای کــوڕی موبــارەك(١٨١ھ) و فەزاری(١٨٥ھ) و ابن عیینە(١٩٨ھ) و وکیع بن الجراح(١٩٧ھ)، بەناوبانگترین زانای ئەم چینە یەحیای کوڕی سەعیدی قــەتان(١٩٨ھ) و عبــدالرحمن بــن مهــدی(١٩٨ھ) بوون، ئەم دوانە لەلای جمهوور دوو کەسی جێمتمانەی خــاوەن حوجــەت بــوون و هــەر کەسێکیان جەرح بکردبایە ڕەد دەکرایــەوە و هەرکەســیش جیــاوازی لەســەر هەبوایــە دەگەڕانەوە بۆ پارسەنگدانی ئەو دوانە لەسەر ئەو کەسە[1].

پاشان بەدوایاندا چینێکی تر لە ئیمامان هاتن لەوانە: یەزیدی کوڕی هاروون(٢٠٦ھ) و ئەبو داودی تەیالیسی(٢٠٤ھ) و عبدالرزاقی کوڕی هەمام(٢١١ھ) و زەحاکی کوڕی مەخلەد(٢١٢ھ).

پاشان دەست بە دانانی کتێب کرا لە زانستی "جــەرح و تەعــدیل"دا، لەوانــەی لــە پێشــەنگی ئــەو کەســانەدان لەســەر ئــەم زانســتە کتێبیــان دانــاوە یــەحیای کــوڕی موعین(٢٣٣ھ) و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل(٢٤١ھ)، ئیبن سەعد(٢٣٠ھ) خاوەنی کتێبی **"الطبقات"**، عەلی کوڕی مەدینی(٢٣٤ھ).

پاشان بەدوایاندا بوخاری و مسلم و ئەبو زورعە و ئەبو حاتەمی رازیان و ئەبو داودی سجستیانی.

هەندێ لە کتێبی جەرح و تەعدیل تەنها باسی کەسە خاوەن متمانەکانی کردووە لەوانە **"الثقات"**ی ئیبن حیبانی بوستی، هەشیانە تەنها باسی کەسە لاوازەکانی تێدایــە وەك

[1] توجیه النظر ص١١٤.

بوخاری و نەسائی و دار قوتنی و عوقەیلی و ئیبن جوزی و ئیبن عـودەی و کتێبەکـەی **"الكامل في الضعفاء"** کە تەواوترین کتێبێکە لەم مەیدانەدا، هەر بەو جۆرە ئیمـامی زەهەبی کتێبەکەی خۆی بە ناوی **"ميزان الإعتدال"** لە کتێبەکەی ئیبن عودەی داناوە.

هەشیانە متمانەدارەکان و لاوازەکانی کۆکردووەتەوە، ئەوانەش زۆرن بەناوبانگترینیان **"تواريخ البخـاري"** و **"الجـرح والتعـديل"**ی ئـیبن ئـەبی حـاتمی رازی، و **"الطبقـات الكبرى"**ی ئیبن سەعد.

## چوارەم: زانستەکانی فەرموودە:

چەند زانستێکی تر هەبوون لێکۆڵینەوەی سوننە و ریوایەتـەکانی و بـەرگری لێـی و پشکنینی بنەڕەتەکانی و سەرچاوەکەی پێویستی کردبوون، ئـەبو عەبـدولا حـاکم لـە کتێبەکەیدا **"معرفة علوم الحديث"** بەستوویەتەوە بە پەنجا و دوو زانستەوە، نەوەوی لە کتێبەکەیدا **"التقريب"** بەستوویەتەوە بە شەست و پێنج زانستەوە، گرنگترینیان ئاماژە پێ دەکەین بۆ ئەوەی رادەی وردەکاری زانایانی سوننە لە رەخنە و پشکنین لە مەیدانی دەرخی سوننە و هەوڵیان بۆ پارێزگاری لێکردنی رۆشن بکەینەوە:

**(یەکـەم): ناسـین(زانین)ی راسـتگۆیی و وردەکـاری و جێگیربـوونی فەرموودەوێـژ و دروستی بنەڕەتەکانی و ئەوەی تەمەنی هەڵیدەگرێت و گەشتەکەی لـە سـەنەدەکاندا و شتانی تر لە بێئاگایی و کەمتەرخەمی بە نەفسی کەسەکە و زانست و بنەڕەتەکانی.**

لەوانە کە حاکم وتوویەتی: ((ئەوەی قوتابی فەرموودە پێی ئاتاجە لەم سەردەمی ئێمـەدا ئەوەیە لە حاڵی فەرموودەوێژەکە(**المحدث**) بکۆڵێتـەوە، یەکـەم: ئایـا لـە یەکتاپەرسـتیدا باوەڕی بە شەریعەت هەیە؟

ئایا نەفسی خۆی پابەند کردووە بە گوڕێڕایەڵی پێغەمبەرانەوە لەوەی وەحیان بۆ کـراوە و شەرعیان بۆ رەوانەکراوە؟ پاشان لە حاڵی ئەو کەسە دەکۆڵێتەوە: ئایا خاوەنی ئارەزووێکـە خەڵکی بانگ بکات بۆ سەری؟ چـونکە بانگکـەر بـۆ بیدعـە هیچـی لێـوە نانووسـرێت، ئەمەش بە هۆی کۆدەنگی ئیمامانی موسڵمان لەسەر وازهێنان لەوەی لایەتی.

پاشان تەمەنی دەکۆڵێتەوە: ئایا ئەو تەمەنی ئەوە هەڵدەگرێت لەو شێخانەی وەرگرتبێت باسیان لەبارەوە دەکات؟ پاشان تێڕامان لە ئوسوڵی: ئایا درێژینە یان داهێنراوە؟

لەم چاخەی ئێمەدا دەستەیەك سەریانهەڵداوە کتێب دەکرن و فەرموودەکانی ناوی دەگێڕنەوە، دەستەیەکیش ئەوەی ئەوان دەیڵێن بە نووسینی خۆیان لە ئێستادا لە کتێبی کۆندا دەینووسنەوە و پاشان لە ئەوانەوە دەیگێڕنەوە، هەر کەس لە ئەوانەوە بیبیستێت- گەر ئەهلی ئەم زانستە نەبێت- ئەوا بە نەزانییەکەی پاساوێکی هەیە، بەڵام ئەهلی ئەم زانستە گەر لە نموونەی ئەوانەوە بیبیستێت لە دوای ئاگاهی و شارەزایی ئەوا تانەلێدراوە و دادپەروەری بەربووەتەوە تا تەوبە دەکات)).

**(دووەم): ناسینی مەسنەدەکان لە فەرموودەدا:**

مەسنەدی فەرموودە ئەوەیە فەرموودەوێژەکە لە شێخێکەوە ریوایەتی کردبێت، بیستنی لەو کەسەوە ئاشکرا بێت فەرموودەکەی هەڵگرتووە، هەر بەو جۆرە بیستنی شێخەکەی لە شێخەکەی خۆی تا دانەپاڵەکە دەگاتە هاوەڵێکی بەناوبانگ و لەوێشەوە دەچێتەوە سەر پێغەمبەری خودا(ﷺ).

**(سێیەم): ناسینی راوەستاوەکان(راگیراوەکان) لە ئاسار:**

ئەوەش وەك ئەوەی "الحاكم" لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە دەریهێناوە وتی: ((هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بە نینوکێکیان تەقەیان دەدا لە دەرگاکەی)) حاکم دەڵێت: ئەم فەرموودەیە گەر کەسێك ئەهلی پیشەکە نەبێت وا ئەندێشە دەکات مەسنەد بێت بە هۆی ناوهێنانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) تیایدا بەڵام لە راستیدا مەسنەد نییە، بەڵکو لەسەر هاوەڵێك وەستاوە و لە هاوەڵانی خۆیەوە کارەکە دەگێڕێتەوە نەك بە سەنەدی یەکێك لە ئەوان.

**(چوارەم): ناسینی هاوەڵان بەپێی پلە و پایەیان:**

هاوەڵان-وەك حاکم باسی دەکات- دوازدە چینن، یەکەمیان ئەوانەن لە مەککە موسڵمان بوون، کۆتاییەکەشی منداڵ بوون و پێغەمبەریان(ﷺ) لە فەتحی مەککە و حەجیماڵئاواییدا بینیوە و لە هاوەڵان سەرژمێر دەکرێن.

**( پێنجەم ): ناسینی مورسەلی جۆراوجۆر لە بەڵگە پێهێنانەوە:**

ئەم جۆرە لە زانستی فەرموودە گرانە، کەم کەس دەتوانێت پەی پێ ببات مەگەر کەسێك بێت لەم زانستەدا وەك دەریای لێ هاتبێت.

**( شەشەم ): ناسینی فەرموودەی پچڕاو:**

ئەم جۆرەیان جیاوازە لە فەرموودەی "مورسەل" و کەم لە لەبەرکەرانی فەرموودە دەتوانن لەیەکتر جیایان بکەنەوە، پاشان باسی ئەوە دەکات سێ جۆرە و بۆ هەر جۆرێك نموونەیەك دەهێنێتەوە:

**یەکەم:** ئەوەیە لە سەنەدەکەیدا دوو پیاوی نەناسراو هەبن نە ناویان هێنرابێت و نە ناسرابن.

**دووەم:** ئەوەیە لە سەنەدەکەیدا پیاوێك هەبێت ناوی نەهاتبێت، بەڵام لە رێگەیەکی ترەوە بناسرێت.

**سێیەم:** ئەوەیە لە سەنەدەکەیدا راوییەك بوونی هەبێت لەو کەسەوەی نەیبیستبێت کە فەرموودەکەی لێ دەگێڕێتەوە بەر لە گەیشتن بە شوێنکەوتوو(تابعی) کە جێگەی ناردن(**الإرسال**)ە، بەم جۆرە ناوترێت مورسەل، بەڵکو پێی دەوترێت پچڕاو.

**( حەوتەم ): ناسینی زنجیرە لە دانەپاڵدا:**

جۆرێکە لە بیستنی ئاشکرا کە تەمومژی لەسەر نییە، ئەمەش چەندین جۆرە:

لەوانەیە زنجیرەکە بە گوزارەیەکی دیاریکراو بێت لە کاتی گێڕانەوەیدا لە لای هەموو پیاوانی سەنەدەکە، وەك ئەوەی هەموویان بڵێن **"حدثنا"** یان بڵێن **"سمعته يقول"** یان بڵێن **"شهدت على فلان أنه قال"**، هەندێ جاریش زنجیرەکە بە کارێکی دیاریکراو دەبێت کە هەر شێخێك لەگەڵ قوتابییەکەی دەیکات، وەك فەرموودەی زنجیرە بە تەوقە لەگەڵ کردن.

**( هەشتەم ): ناسینی فەرموودەی موعەنعەن:**

ئەمە هەڵبەستنی تێدا نییە و بە کۆدەنگی ئیمامانی گواستنەوە لەسەر خۆپاریزی گێڕەرەوەکانی لە جۆرەکانی هەڵبەستن فەرموودەیەکی پەیوەستە.

(**نۆیەم**): **ناسینی گرفتاوی(المعضل) لە ریوایەتەکان:**

ئەوەیە لە نێوان ناردنی بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) زیاتر لە یەك پیاو بوونی هەبێت و مورسەلیش نەبێت، چونکە مورسەلەکان بۆ شوێنکەوتووانە، نەك بۆ کەسانی تر.

(**دەیەم**): **ناسینی** مودرەج(تەکخراو)ی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) لە قسەی هاوەڵاندا و دەرهێنانی قسەی کەسانی تر لە قسەی پێغەمبەر(ﷺ).

(**یازدەهەم**): **ناسینی شوێنکەوتووان:**

شوێنکەوتووان چەندین چینن، پاشان جیاکاری نەکردووە لە نێوان شوێنکەوتووان و شوێنکەوتوانی شوێنکەوتوواندا، حاکم چینەکانی باس کردوون کە پازدە چینن، یەکەمیان ئەوانەن بەو دە هاوەڵە گەیشتوون کە پێغەمبەر(ﷺ) شایەتی بەهەشتی بۆ داون، وەك سەعیدی کوڕی موسەیب، دوایین چینیان ئەوانەن کە بە ئەنەسی کوڕی مالیك گەیشتوون لە ئەهلی بەصرە، و بە عەبدوڵای کوڕی ئەبی ئەوفا گەیشتوون لە ئەهلی کوفە، و بە سائیبی کوڕی یەزید گەیشتوون لە ئەهلی مەدینە و بە عەبدوڵای کوڕی حاریس گەیشتوون لە ئەهلی مصر و بە ئەبو ئومامەی باهیلی گەیشتوون لە ئەهلی شام.

(**دوازدەهەم**): **ناسینی منداڵانی هاوەڵان:**

هەر کەس ئەم جۆرە نەزانێت زۆرێك لە ریوایەتەکانی لا تێکەڵ دەبێت، سەرەتا ناسینی منداڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوجا ناسینی منداڵەکانی هاوەڵە مەزنەکان، پاشان ناسینی منداڵەکانی شوێنکەوتووان و شوێنکەوتووانی شوێنکەوتووان و کەسانی تر لە ئیمامە مەزنەکان.

(**سیازدەهەم**): **زانینی زانستی جەرح و تەعدیل:**

ئەم دوانە لە بنەڕەتدا دوو جۆرن، هەریەکەیان زانستێکی سەربەخۆیە.

(**چواردەهەم**): **ناسینی سەحیح و سەقیم(دەردەدار):**

ئەمە جیایە لە جەرح و تەعدیل، لەوانەیە سەنەدێك لە جەرحکردن سەلامەت بێت بەڵام لە سەحیحەکان دەرناهێنرێت.

نموونەیەك بۆ ئەوە دەهێنێتەوە بەوەی بە سەنەدێكی پەیوەست دەریهێناوە بۆ لای ئیبن عومەر لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ): ((نوێژی شەو و رۆژ دوو دووە و ویتریش یەك ركاتە لە كۆتایی شەودا))، حاكم دەڵێت: ئەم فەرموودەیە تەنها كەسی متمانەداری دامەزراو لە سەنەدەكەیدا هەیە، ناوهێنانی "رۆژ" تێیدا وەهمە بۆی دروست بووە.

( **پازدەهەم** ): **زانینی فیقهی فەرموودە:**

بەری ئەم زانستەیە و شەریعەتی پێوە راگیراوە، پاشان كۆمەڵێك ناو باس دەكات لە ئیمامانی فەرموودە كە فیقهی فەرموودەیان خستووەتە سەر ریوایەتی فەرموودە، وەك ئیبن شیهابی زوهەری، ئەوزاعی و عەبدوڵای كوڕی موبارەك و سوفیانی كوڕی عوییینە و ئەحمەدی كوڕی حەنبەل.

( **شازدەهەم** ): **ناسینی نەسخكەر و نەسخكراو لە فەرموودە.**

( **حەڤدەهەم** ): **لەو فەرموودانەیە** لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) باسكراوە، ناسینی فەرموودەی مەشهوور(بەناوبانگ) لە فەرموودەی ناسەحیح، لەوانەیە فەرموودەیەكی مەشهوور لە سەحیحەكان دەرنەچێت.

( **هەژدەهەم** ): **ناسینی فەرموودەی غەریب(نامۆ):**

**ئەمەش جۆراوجۆرە:**

هەیانە غەریبی سەحیحە و راوییەكی متمانەدار پێی تەنهادەكەوێتەوە، یان غەریبی هەندێ لە شێخەكانە وەك **"لا یبیع حاضر لباد"** دەڵێت: ئەمە فەرموودەیەكی غەریبی مالیكی كوڕی ئەنەسە لە نافیعەوە، لە كاتێكدا ئەو ئیمامە و فەرموودەكانی كۆدەكرێنەوە.

( **نۆزدەهەم** ): **ناسینی فەرموودەی تەنها:**

**ئەمەش سێ جۆرە:**

**جۆری یەكەم:** ناسینی سوننەنەكانی پێغەمبەر(ﷺ) كە ئەهلی مەدینە پێی تەنهادەكەونەوە لە هاوەڵێكەوە، وەك ئەوەی كوفییەكان لە یەكەم سەنەدەوە بۆ كۆتایی دەیگێڕنەوە یان مەدینەییەكان و بەم جۆرە.

**جۆری دووەم:** فەرموودەیەکە تەنها یەك پیاو لە یەکێك لە ئیمامەکانەوە پێی تەنهادەبێتەوە.

**جۆری سێیەم:** بۆ نموونە فەرموودەیەك لە ئەهلی مەدینەوە راوییەکی ئەهلی مەککەی پێ تەنهاکەوتووە.

**(بیستهەم): ناسینی مودەلیسەکان:**

ئەوانەی لەسەریان نووسیون جیاکاری ناکەن لە نێوان ئەوەی بیستوویانە و ئەوەی نەیانبیستووە، (حاکم) جۆرەکانی تەدلیس باس دەکات کە شەش جۆرن.

**(بیست و یەك): ناسینی عیللەتەکانی فەرموودە:**

ئەمەش زانستێکە و جیایە لە سەحیح و سەقیم و زانستی جەرح و تەعدیل.

حاکم دەڵێت: ((لە چەندین رووەوە فەرموودە عیللەتدار دەکرێت، تانەدان(جرح) دەستتێوەردانی تێدا ناکات، فەرموودەی تانەلێدراو لاواز و بەربووەوەیە، **عیللەتی فەرموودە** لە فەرموودەی متمانەدارەکاندا زۆرە، زانینی عیللەکەیان لێ شاراوە بێت و فەرموودەکە عیللەتدار دەربچێت، بەڵگە تیایاندا لای ئێمە لەبەرکردن و تێگەیشتن و ناسینە)).

**(بیست و دوو): ناسینی سوننەتی بەرهەڵستکار بە یەکتری:**

مەزهەبێك بەڵگە بە یەکێکیان دەهێنێتەوە و مەزهەبێکی تر بەویتریان بەڵگە دەهێنێتەوە.

**(بیست و سێ): ناسینی ئەخبار کە لە هیچ روویەکەوە بەرهەڵستکاری بۆ نییە.**

**(بیست و چوار): ناسینی گوزارەی فیقهی زیادە لە فەرموودەگەلێکدا کە تەنها یەك راوی بە زیادە تەنها دەبێتەوە.**

لەوانە: ئەو فەرموودەی ئیبن مەسعوودە (خوا لێی رازی بێت) دەفەرموێت: لە پێغەمبەری خودام(ﷺ) پرسی: چ کارێك باشترین کارە؟

فەرمووی: نوێژ لە سەرەتای کاتییەوە(في أول وقتها)، پرسیم: پاشان چیتر؟

فەرمووی: تێکۆشان لە پێناوی خودا، پرسیم: پاشان چیتر؟

فەرمووی: چاکە لەگەڵ دایك و باوك)).

حاکم دەڵێت: ئەم فەرمووودەیـەکی سـەحیحە و پـارێزراوە، دەسـتەیە لـە ئیمامـانی موسڵمانان لە مالیکی کوڕی میغوەلەوە ریوایەتیان کردووە.

هەر بەو جۆرە لە عوسمانی کـوڕی عومـەرەوە، تـەنها بەنـداری کـوڕی بەشـار و حەسەنی کوڕی موکەرەم (**في أول وقتها**–لە سـەرەتای کاتـەوە)یان هێنـاوە، ئـەو دوانەش جێمتمانەن.

**(بیست و پێنج): ناسینی مەزهەبی فەرمووودەوێژ.**

**(بیست و شەش): ناسینی تەصحیفات لە مەتنەکاندا.**

دەستەیە لە ئیمامانی فەرمووده تیایدا خلیسکاون.

### پێنجەم: کۆمەڵێك کتێب دەربارەی فەرمووده هەڵبەستن و دانەرانی فەرمووده:

لە نەرێتی فەرمووودەوێژان ئەوە بوو ناوی درۆزنەکانیان لە دانیشتنەکانیاندا دەهێنا و دەیانوت: فلان درۆزنە و فلان زەندیقە و فلان قەدەرییە.

### ناوی درۆزنەکان و کارەکانیان:

١. **أبان بن جعفر الميري**

٣٠٠ فەرمووودەی بە دەم ئەبو حەنیفەوە هەڵبەستووە.

٢. **إبراهيم بن زيد الأسلمي**

فەرمووودەی بە دەم مالیکەوە هەڵبەستووە.

٣. **أحمد بن عبدالله الجويباري**

هەزاران فەرمووودەی بۆ کەرامییەکان داناوە.

٤. **جابر بن يزيد الجعفي**

سفیان دەڵێت: بە سی هەزار فەرمووده گوێم لە جابر بووە، حەڵاڵ نییە هیچیان باس بکەم.

٥. محمد بن شجاع الثلجي

فەرموودەی لەسەر تەشبیھ داناوە.

٦. نوح بن أبي مريم

فەرموودەکانی خێر و چاکەی خوێندنەوەی سورەتەکانی قورئانی داناوە، سورەت لە دوای سورەت.

٧. الحارث بن عبدالله.
٨. مقاتل بن سليمان.
٩. محمد بن سعيد المصلوب.
١٠. محمد بن عمر لواقدي.
١١. إبراهيم بن محمد الأسلمي.
١٢. وهب بن الوهب القاضي.
١٣. محمد بن السائب الكلبي.
١٤. أبو داود النخعي، هتد..

هەموو لەوانەن فەرموودەیان هەڵبەستووە

.

**لە بەناوبانگترین ئەو کتێبانەی زانایان دەربارەی هەڵبەستن نووسیویانە:**

١. الموضوعات: أبو فرج الجوزي(٥٩٧ھ مردووە).
ئەو فەرموودانەی تێدا داناوە باوەڕی وابووە دانراون، با لە کتێبی سەحیحیشدا هاتبن.

٢. المغني عن الحفظ والكتاب: أبو حفص عمر بن البدر الموصلي(٦٢٢ھ مردووە).
چەند دەروازەیەکی باس کردووە کە فەرموودەی تێدا سەحیح نییە

٣. الدر الملتقط في تبيين الغلط: العلامة الصغاني رضي الدين أبي الفضل حسن بن محمد بن حسين(٦٥٠ ھ مردووە).
زانایان بەدواداچوونیان بۆ کردووە

٤. تذكرة الموضوعات: ابن طاهر المقدسي(٥٠٧هـ مردووە).
ئەو فەرموودانەی باس کردووە درۆزن و برینداز(تانەلێدراو) و لاواز گێڕاویانەتەوە

٥. تذكرة الموضوعات: محمد بن طاهر بن علي الفتني(٩٨٦هـ مردووە).
ریسالەیەکی کردووە بە پاشکۆی دەربارەی فەرمووده هەڵبەستەکان بە ناوی "رسالة في الوضاعين والضعفاء"

٦. الموضوعات: الشيخ علي القاريء الحنفي(١٠١٤ هـ مردووە).

٧. الفوائد المجموعة في الأحاديث الموضوعة: الشوكاني(١٢٥٠هـ مردووە).

**شەشەم: کتێب لەسەر ئەو فەرموودە بەناوبانگانەی لەسەر زمانن:**

و رۆشنکردنەوەی ئەوەی تێیاندایە لە سەحیح و لاواز و هەڵبەستراو، لەوانە:

١. الآلي في الأحاديث المشهورة: الزركشي (٧٩٤هـ مردووە).
"السيوطي" پوختەی کردووە لە "الدرر المنتشرة في الأحاديث المشتهرة"

٢. المقاصد الحسنة في الأحاديث المشتهرة على الألسنة: السخاوي (٩٠٢هـ مردووە).

٣. كشف الخفاء والإلباس فيما يدور على ألسنة الناس من الحديث: ابن الديبع الشيباني الأثري (٩٤٤هـ مردووە)

٤. أسنى المطالب في أحاديث مختلفة المراتب: محمد الحوت البيروتي. کتێبی "تمييز الطيب وزاد عليه) هێناوە و زیادەی خستووەتە سەر.

بەم جۆرە ئەوەی ویستم دەربارەی گوزەرکردنی قوناغەکانی سوننە بە کورتی ئاماژەم پێکرد و کۆتاییم پێهێنا.

# دەروازەی دووەم

---

## ئەو شوبهانەی لەسەر سوننە هاتوون لە چاخە جیاوازەکاندا

**حەوت بەشی تێدایە:**

**بەشی یەکەم:** سوننە لەگەڵ شیعە و خەواریج.

**بەشی دووەم:** سوننە لەگەڵ موعتەزیلە و ئەهلی کەلام.

**بەشی سێیەم:** سوننە لەگەڵ ئەوانەی بە حوجەی نازانن لە کۆندا.

**بەشی چوارەم:** سوننە لەگەڵ ئەوانەی بە حوجەی نازانن لە چاخی نوێدا.

**بەشی پێنجەم:** سوننە لەگەڵ ئەوانەی حوجییەتی هەواڵی ئاحاد ڕەددەکەنەوە.

**بەشی شەشەم:** سوننە لەگەڵ ڕۆژهەڵاتناسان.

**بەشی حەوتەم:** سوننە لەگەڵ هەندێ لە نووسەرانی هاوچەرخ.

# دەروازەی دووەم

## ئەو شوبهانەی لەسەر سوننە هاتوون لە چاخە جیاوازەکاندا

## ڕێخۆشکردن

لەگەڵ ئەو گشتە جەنگەی سوننە ڕووبەڕووی بوویەوە و تیایدا بە سەرکەوتووی هاتــە دەرەوە ئاساییە هەندێ برینی بچووکی پێوە بێت، بەڵام ئەو برینانە کاریان نەکردووەتە سەر قەوارە و زیندەگی و هێزی، سوننە بەدرێژایی مێژوو نــەیارانی زۆری لــە دەســتە موسڵمانەکانەوە بۆ پەیدا بووە و شوبهەی ئەوەیان لەســەر دانــاوە ناتوانرێــت بکرێتــە سەرچاوەی تەشریع، بە پشتیوانی خودا لە چەند بەشێکدا ئەوانە باس لێوە دەکەین.

# بەشی یەکەم

# سوننە لەگەڵ شیعە و خەواریج

هاوەڵان کەمترین گومانیان لەوە نەبوو لەسەریان پێویستە شوێنی پێغەمبەر(ﷺ) بکەون و پەیامەکەی بە هەموو خەڵکی و نەوەکانی دوای خۆیان بگەیەنن، مێژوو پێمان دەڵێت لە چاخی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) هاوەڵان بە چاوی شك و دوژمنایەتییەوە تەماشای یەکتریان نەکردووە، بەڵکو برای یەکتربوون و یەکتریان خۆشدەویست، و یەك بیروباوەڕ و یەك ئامانج کۆیدەکردنەوە، و خۆشەویستی یەك پێغەمبەر(ﷺ) و یەك کتێب و یەك شەرع دڵیانی پێکەوە گرێدابوو.

قورئان دەفەرموێت: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ ۚ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا ۖ سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ﴾ الفتح: ٢٩.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾ الحشر: ٩.

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد یەکەمین جیاوازییەك لە نێوان هاوەڵاندا سەریهەڵدا بریتی بوو لە جیاوازیان لەوەی کێ خەلافەت بگرێتە دەست، هەرچەند جیاوازییەکەیان لە بابەتێکدا بوو کە لە ترسناکترین و دژوارترین ئەو بابەتانەیە گەلان رووبەڕووی هەڵدێر دەکاتەوە لەگەڵ ئەوەش قسەکردنی هاوەڵان و ئاڵوگۆڕکردنی بۆچوونەکان و بەرگری هەریەکەیان لە رای خۆی و گەیشتن بە دوایین بڕیار لە ئەوپەڕی ئارامی و خۆڕاگری و باش هەستان بوو بە کارەکە و رێزگرتن بوو لە حورمەتی یەکتری.

کۆبوونەوەی سەقیفە دوای مشتومڕی نێوان کۆچکەران و سەرخەران بە بەیعەتکردنی ئەبوبەکر(خوا لێی رازی بێت) کۆتایی هات، بەڵام عەلی و چەند کەسێك لەگەڵی(خوایان لێ رازی بێت) لە بەیعەت پێدانی دواکەوتن.

کارەکە بەو جۆرە بەردەوام بوو تا خەلافـەتی ئەبوبـەکر و عومـەر کۆتـایی هـات و سەرەتای خەلافەتی عوسمان دەستی پێکرد، هاوەڵان لەسەر خێر بە جوانترین هاوکـاری هاوکاری یەکتریان دەکرد و بە جوانترین شێوە ئامۆژگارییان بۆ یـەکتر هـەبوو، و لـە وردترین مانای تەشریعدا جیـاوازی سـەریهەڵدەدا، دۆسـتایەتی و پلـەی دەسـەڵات و گەورەیی بەرانبەر رێگر نەبوو لـە راگەیانـدنی حـەق بەڕاشـکاوی بـەبێ دووڕوویـی و دوودڵـی، لـە پـاڵ ئەوەشـدا هـەموو دەسـت لـەناو دەسـت بـوون و وەك سـەربازێك گوێڕایەڵیان لەیەکتر دەکرد و یاخیبوون و ناکۆکیان لەگـەڵ یـەکتر نـەدەزانی، هـەموو کاریان بۆ بیناکردنی دەوڵەتێکی نوێ و شەرعێکی نـوێ و ئومـەتێکی نـوێ دەکـرد، ئەمە بەردەوام بوو تا لە نیوەی دووەمی خەلافـەتی عوسمانـەوە(خوا لێـی رازی بێـت) فیتنە سەریهەڵدا و دوژمنانی خودا لە یەهود و عەجەم خۆیان کرد بەناویاندا، ئەوەش سەریکێشا بۆ شـەهیدبوونی خەلیفـەی سـێیەم و پاشـانیش خەلیفـەی چـوارەم، کـار گەیشتە دەستی معاویە، لێرەدا بەناوی خۆشەویستی عەلییەوە(خوا لێـی رازی بێـت) زماندرێژی کرایە سەر هاوەڵان، وەك چۆن ئەوانەی خۆیان بـە شـیعەی عـەلی دەزانـی زماندرێژییان کردە سەر هـاوەڵان، خـەواریجیش بـە هـەمان شـێوە کەوتنـە هێـرش و زماندرێژی و جمهووری هاوەڵانی ئەو کاتەیان کافر کرد، چونکە سەرپێچیان لە ئەمری خودا کرد و هەرکەسیش سەرپێچی لە ئەمری خودا بکات کافر بووە، بەڵام جمهوور لە ناکۆکی هاوەڵان هەڵوێستێکی میانەڕەوی گرت، ئەوان پێیانوایە سێ خەلیفەی یەکـەم لەپێشتربوون بە خەلافەت لە عەلی و عەلیش(خوا لێی رازی بێت) لە معاویە لەپێشتر بوو بە خەلافەت، لەگەڵ ئەوەش لای ئەدەبیان بەرانبـەر هـاوەڵان بەرنـەداوە و بیـانوو پاساو بۆ ئەوانە دادەنێن بە هەڵەداچوون وەك ئیجتیهادێکی هەڵە و کەسی موجتەهید لە هەڵەی ئیجتیهادەکەیدا گوناهی لەسەر نییە.

کێشەکە هەر بە جیاوازی هاوەڵانەوە نەوەسـتا، بـەڵکو پیلانـی دوژمنـانی ئیسـلام سەرباری جیاوازی هاوەڵان لەگەڵ یەکتر کۆمەڵێك قسەیان بە دەم هاوەڵانەوە هەڵبەست بەرانبەر یەکتر نەیان کردبوو، بەداخەوە کەسانێك هەبوون لە جمهووری شیعەدا گوێیان بۆ ئەو درۆ گوازراوانە دەگرت، بەڵکو یەکەمین کەسێك دەمدرێژی کردە سەر هاوەڵان و

دانیشتنەکانیان بەو فەرموودە هەڵبەستراوانە پڕ کرد دەربارەی حەقی عەلی و ئالوبەیتی بریتی بوون لە شیعە، ئەمەش بە دانپیادانانی "ابن أبی الحدید" لە (شرح نهج البلاغة)دا.

**رای خەواریجەکان:**

هەرچۆنێك بێت ئەو جیاوازیەی نێوان هاوەڵان سەریکێشا بۆئەوەی هەریەك لە خەواریج و شیعە رای تایبەت بە خۆیان هەبێت دەربارەی هاوەڵان جیاواز لە رای جمهوور لە موسڵمانان، خەواریج بە جیاوازی دەستەکانیان هەموو هاوەڵانی پێش فیتنە بە دادپەروەر تەماشا دەکەن، پاشان عەلی و عوسمان و هاوەڵانی جەمەل و ئەوانەی بە دادوەر رازی بوون و دوو دادوەرەکە یان یەکێکیان بەڕاست دەزانن کافر دەکەن، بۆیە فەرموودەی جمهووری هاوەڵان لەدوای فیتنەکە وەرناگرن.

**رای شیعە:**

جمهووری دەستەکانی شیعە ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان(خوایان لێ رازی بێت) بریندار دەکەن، هەر بەو جۆرە عائشە و تەلحە و زوبیر و معاویە و عەمری کوڕی عاص(خوایان لێ رازی بێت) و هەموو ئەوانەی لەگەڵ ئەوان بوون بریندار دەکەن، تەنها پازدە هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) کە وەلائیان بۆ عەلی(خوا لێی رازی بێت) بووە بریندار ناکەن، لەسەر ئەم بنەمایەیان فەرموودەی جمهووری هاوەڵان رەد دەکەنەوە، دەستەیەك لە شیعە کە بریتین لە زەیدییەکان لەگەڵ جمهووری شیعە ناکۆکن و پێیانوایە عەلی(خوا لێی رازی بێت) باشتر بووە بۆ خەلافەت لە دوو کەسەکەی پێش خۆی(ئەبوبەکر و عومەر)، بەڵام خەلافەتی ئەوانیش دروستە، ئەمانە میانەڕەوترین دەستەی شیعەن و فیقهەکەیان لە فیقهی ئەهلی سوننەوە نزیکە.

**رای جمهوور:**

جمهووری موسڵمان کار بەوە دەکەن هەموو هاوەڵان خاوەنی عەدالەتن، یەکسانە پێش فیتنەکە بێت یان دوای فتنەکە، چووبێتە ناو فیتنەکە یان کەناری گرتبێت، بەڵام

خۆیان لە ریوایەتی هاوەڵانی عەلی بەدوور دەگرن جگە لـە ریوایەتـەکانی عەبـدوڵای کوڕی مەسعوود و هاوەڵەکانی، چونکە ئەمانە جێمتمانەن و درۆکردن بە دەم عەلیەوە بە گونجاو نازانن وەك چۆن رەفیزەکان لە شیعەی عەلی ئەنجامیان دەدا.

بەرهەمی ئەم ناکۆکییە جمهووری شیعە تەنها ئەو فەرموودانـەی ئـەهلی سـوننەیان قبووڵە کە لەگەڵ فەرموودەکانی ئەوان پێکدێنەوە و هەموو ئەو فەرموودانەی باس لە فەزڵ و گەورەیی هاوەڵان دەکەن(ئەوانـەی ئـەوان برینـداریان دەکـەن) لای ئـەوان بـە هەڵبەستراو دادەنرێت با لە سەحیحترین کتێبی سوننەشدا هاتبن.



# بەشی دووەم

# سوننە لەگەڵ موعتەزیلە و ئەهلی کەلام

گوازراوە(المنقول)ی زانایان لەمەڕ هەڵوێستی موعتەزیلە دەربارەی سوننە جیاوازی تێدایە، ئایا ئەوان لەگەڵ جمهوورن لە حوجییەتی سوننەدا بە هەردوو بەشەکەیەوە متەواتیر و ئاحاد؟ یان ئینکاری بە حوجەتبوونی هەردوو بەشە دەکەن؟ یان باوەڕیان بە حوجەتبوونی متەواتیر هەیە بەبێ ئاحاد؟

ئامدی لە ئەبو حوسەینی بەصری موعتەزیلییەوە بۆمان دەگوێزێتەوە ئەو یەکێك بووە لەوانەی لەڕووی ئەقڵەوە باوەڕی بە پەرستن بووە بە هەواڵی(بە فەرموودەی) ئاحاد، لە "الجبائي" و دەستەیەك لە ئەهلی کەلامەوە بۆمان دەگێڕێتەوە لەڕووی ئەقڵەوە پەرستن بە هەواڵی ئاحاد دروست نییە.

"السيوطي" لە "التدريب"دا لە ئەبی عەلی جوبائییەوە بۆمان دەگوێزێتەوە کە هەواڵێك قبووڵ ناکات گەر یەك کەسی دادپەروەر گێڕابێتیەوە مەگەر هەواڵی کەسی دادپەروەری تری خرابێتە سەر، یان ئاشکرای قورئان یان ئاشکرای هەواڵێکی تر پشتیوانی لێ بکات، یان ئەو هەواڵە لە نێوان هاوەڵاندا بەربڵاو بێت یان هەندێکیان کاریان پێ کردبێت.

ئەبو حوسەینی بەصری لە "المعتمد"دا باسی کردووە و مامۆستا ئەبو نەصری تەمیمی لە ئەبو عەلیەوە باسی ئەوە دەکات هەواڵێك لای ئەو جێگەی قبووڵە چوار کەس ریوایەتیان کردبێت.

ئیبن حەزم دەگێڕێتەوە ((هەموو ئەهلی ئیسلام لەسەر ئەوەن هەواڵی یەك کەسی جێمتمانە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) قبووڵ بکرێت، هەر دەستەیەك لە زانستی خۆیدا وەك ئەهلی سوننە و خەواریج و شیعە و قەدەری لەسەر ئەوە ڕۆیشتووە، تا دوای سەدەی کۆچی ئەهلی کەلام لە موعتەزیلە هاتن و سەرپێچییان لە ئیجماع کرد، عەمری

کوڕی عوبەید دینداری خۆی لەسەر ئەوە بوو حەسەنی بەصری دەیگێڕایەوە(لە فەرمووده) و فتوای پێ دەدا، ئەمە کارێکە هەر کەس کەمترین زانستی هەبێت دەیزانێت))[1].

لە جێگەیەکی تر دەڵێت: موعتەزیلە حوجییەتی هەواڵی ئاحاد ڕەد دەکەنەوە و دەڵێت: ((هەموو موعتەزیلە و خەواریج دەڵێن: هەواڵی ئاحاد زانست ناگەیەنێت، هەروەها دەڵێن: ئەوەی ئەگەری درۆ و هەڵەی لێ بکرێت حوکمدان پێی حەڵاڵ نییە لە ئایینی خوادا(عز وجل) و نابێت بدرێتە پاڵ خودا و پێغەمبەر(ﷺ))[2].

ئیبن قەیم لە "أعلام الموقعين"دا ئەو قسەیە دەداتە پاڵ موعتەزیلە کە دەقی ڕاشکاوی دامەزراو(**نص صريح ثابت**)ی هاتوو لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەربارەی شفاعەت بۆ یاخیبووان لە باوەڕداران بە ئایەتی موتەشابیهی ﴿**فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ**﴾ **المدثر: ٤٨** ڕەد دەکەنەوە.

وەك دەبینی ئەم گواستنەوانە(منقولات) بە یەکتردا دەکێشن و حوکمێکی ڕاشکاومان لەسەر بابەتەکە پێ نادەن، پێم باش بوو بگەڕێمەوە بۆ کتێبەکانی ئەهلی کەلام و ئەوەی زانایان دەربارەی موعتەزیلە دەیڵێن و لەم بابەتەدا بۆخۆم لەسەری بوەستم، گەیشتمە ئەوەی ئیمام ئەبو مەنصوور ئەبوبەکری بەغدادی خاوەنی "المواقف" و ڕازی لە "**النظامية**"وە(کە دەستەیەکی موعتەزیلە بوو) ڕەدکردنەوەی حوجییەتی فەرموودەی متەواتیر و زانست گەیاندنی دەگوێزنەوە و پێیانوایە بۆی هەیە متەواتیر درۆ بێت و ئومەت لەسەر هەڵە کۆببێتەوە، وەك چۆن ڕازی ڕەدکردنەوەی هەواڵی ئاحاد دەداتە پاڵ "**النظامية**".

لەبەر ئەوەی"**النظامية**" یەکێکە لەو بیست و دوو دەستەی موعتەزیلە و هەڵوێستیان لە سوننە لەسەر هەڵوێستیان لە هاوەڵان وەستاوە، بۆیە پێم باش بوو ئەوەی ئیمام ئەبو مەنصووری بەغدادی(ساڵی(٤٢٩ھ) مردووە) باسی کردووە لە کتێبی "الفرق بين

---

[1] الإحكام لابن حزم ١/١١٤.
[2] الإحكام ١/١١٩.

الفرق" بگوێزمەوە، بەتایبەت هەڵوێستی ئەو دەستەیە لەمەڕ هـاوەڵان و هەڵوێسـتی سەرکردەکانیان لە فەرموودە:

دوای ئەوەی باسی بیروباوەڕی دەستەکانی موعتەزیلە دەکات کە هەموویان لەسـەری هاوڕان دێتە سەر ئەو شتانەی تیایدا ناکۆکن، سەرەتا باسـی واصـلییەکان دەکـات و دەڵێت:

## "واصل بن عطاء ( ١٣١ك مردووە )"

"واصل" بە بیدعەی سێیەم لە پێشین(سلف) جیابوویـەوە ئـەوەش ئـەوە بـوو بـینی ئەهلی چاخی خۆی لەسەر عەلی و هاوەڵانی و تەڵحە و زوبێر و عائشە(خوا لێیان رازی بێت) و دەستەی جەمـەل جیاوازیـان هـەبوو، خـەواریج تەڵحـە و زوبـێر و عائشـە و شوێنکەوتووانیان لە ڕۆژی جەمەلدا کافر کرد بەوەی جەنگیان لەگەڵ عـەلی(خوا لێـی رازی بێت) کردووە، و عەلی(خوا لێی رازی بێت) لە جەنگانی دژ بە دەستەی جەمـەل لەسەر حەق بووە، هەروەها لە جەنگانی دژ بە معاویە لە ڕۆژی صـەفیندا تـا دانـانی دادوەر عەلی لەسەر حەق بووە پاشان بە دانانی دادوەر کافر بووە.

ئەهلی سوننە و جەماعە ئیسلامی هەردوو دەستەکە رادەگەیەنن لە جەنگی جەمەلدا و دەڵێن: عەلی لەسەر حەق بـوو لـە جـەنگان دژ بـەو دەسـتەیە، هـاوەڵانی جەمـەل یاخیبوان و بەهەڵەداچووان بوون لە جەنگیان دژ بە عەلی، هەڵەکەیان کـوفر و فیسـق نییە شایەتمانیان هەڵناوەشێنێتەوە.

"واصل" لە قسەی ئەم دوو دەستەیە دەرچوو، و بانگەشەی ئەوەی کرد یـەکێك لـەو دوو دەستەیە فاسقن بـەڵام نـەك بـە دیـاریکراوی و ئـەو نازانێـت کامیـان دەسـتەی فاسقەکەیە، بۆیە دروستە عەلی و شوێنکەوتووانی بن لە حەسـەن و حوسـەین و ئـیبن عەباس و عەماری کوڕی یاسر و ئەبو ئەیوبی ئەنصاری و هـەموو ئەوانـەی لـە ڕۆژی جەمەلدا لەگەڵ عەلی بوون، هەروەها دروستە دەستەی فاسق عائشە و تەڵحە و زوبێر و ئەوانە بن لەگەڵیان بوون.

پاشان واصل دەربارەی شکی لەسەر ئەو دوو دەستەیە دەڵێت:

((گەر عەلی و تەلحە یان عەلی و زوبێر یان پیاوێك لـە هـاوەڵانی عـەلی و پیاوێـك لـە هاوەڵانی جەمەل لەسەر بەستە پاقلەیەك لەلای من شایەتی بدەن حوکم بە شـایەتییەکەیان ناکەم بەهۆی بوونی زانستم بەوەی یەکێکیان فاسقە نەك بـە دیـاریکراوی، هـەروەك چـۆن حوکم دەرناکەم بە شایەتی یەکێك لە لەعنکەرەکان(تەڵاقی مولاعەنـە) بـە هـۆی بـوونی زانستم بە فاسقبوونی یەکێکیان نەك بە دیاریکراوی، گـەر دوو پیـاو لـە یـەکێك لـە دوو دەستەکە شایەی بدەن هەر کامێکیان بێت شایەتییەکەیان قبووڵ دەکەم))[1].

## عەمری کوڕی عوبەید:

عەمر لەم بیدعەیەدا لە واصل زیاتر تێپەڕانـد و هەسـتا بـە فاسـقکردنی هـەردوو دەسـتەکەی ڕۆژی جەمـەل و شـایەتی هـیچ دەسـتەیەك قبـووڵ ناکـات، قەدەرییەکان(موعتەزیلە) لە دوای واصل و عـەمر لەسـەر ئـەم پرسـە بـوون بـە دوو دەستە، **"النظام و معمر والجاحظ"** لەمەڕ ئەو دوو دەسـتەیە قسـەکەی "واصـل"یان وەرگرت، بەڵام **"حوشب و هاشـم الأوقـص"** دەڵـێن: سـەرکردەکان ڕزگاریـان بـوو و شوێنکەوتوانیان تیاچوون[2].

## ئەبو هوزەیل:

پاشان دەربارەی هوزەیلییەکان کە بریتین لە شوێنکەوتەی **"أبي الهذيل محمـد بـن الهـذيل"** ناسـراو بـە عـەلاف(٢٢٧ یـان ٢٣٥ھ)، ڕسـواییەکانی بـەدوای یەکـدا سەریکێشا بۆ کافرکردنی لەلایەن تـەواوی دەسـتە موسـڵمانەکانەوە، **"المـرداد و الجبائي و جعفر بن حرب"** لە سەرانی موعتەزیلە بۆخۆیان تەکفیری دەکەن و باسی ڕسواییەکانی دەکەن.

---

[1] الفرق بين الفرق ص٧١-٧٢.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

## النظام:

نیزامییەکان دەستەیەکن دەچنەوە سەر ئەبو ئیسحاق ئیبراهیمی کوڕی سەیار ناسراو بە **"النظام"**، باسی ئەوە دەکات چۆن تێکچوون رووی لە بیروباوەڕی **"النظام"** و هەموو ئەوانە کردووە تێکەڵی بوون لە زەندیقەکان و فەیلەسوفەکان و کەسانی تریش، **"النظام"** موعجیزەی لەتکردنی مانگ و تەسبیحاتی چەو لە دەستی پێغەمبەردا(ﷺ) و هەڵقوڵینی ئاو لە نێوان پەنجەکانییەوە رەد دەکاتەوە، بۆ ئەوەی لەو رێگەوە بگاتە رەدکردنەوەی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر(ﷺ).

لە خاڵی بیست و یەکدا ئاماژە بەوە دەکات **"النظام"** تانەی لە هەواڵی هاوەڵان و شوێنکەوتووان داوە، ئەمەش لە پێناو فتواکانیان لە ئیجتیهاددا، **"الجاحظ"** لە کتێبی "المعارف"دا و هەروەها لە کتێبە ناسراوەکەی بە "الفتیا" باس لەوە دەکات **"النظام"** و هاوەڵانی لە فەرموودەدا تانەیان لە ریوایەتەکانی فەرموودەی ئەبی هورەیرە داوە و وا بانگەشە دەکەن ئەبو هورەیرە درۆزنترین کەس بوویێت، هەروەها تانەیان لە عومەری کوڕی خەتاب(خوا لێی رازی بێت) داوە و وا بانگەشە دەکەن لە رۆژی حودەیبییەدا گومان لە دینیدا سەریهەڵداوە، هەر بەو جۆرە لە رۆژی مردنی پێغەمبەردا شکی بۆ دروست بووە، هتد...

موعتەزیلە فیتنەی خەلقی قورئانیان هێنایە ئاراوە، مەئموون(خەلیفەی عەباسی) بە فەرمی خەڵکی ناچار دەکرد باوەڕیان بە خەلقی قورئان هەبێت، ئەهلی فەرموودە هەڵوێستێکی مەردانەیان نواند لە بەرگری کردن لە حەق، ئەوان بەرانبەر بەڵێن و هەڕەشەی مەئموون وەستانەوە و لەو پێناوەدا بەندیخانە و کوشتنیان قبووڵ کرد، سیازدە ساڵ(واتە ٢١٨-٢٣٢ه) ئیمام ئەحمەد لەژێر لێدان و سزا و بەندیخانەدا بوو، متەوەکیل ساڵی **٢٣٢**ك هاتە سەر دەسەڵات و مەیلی خۆی بۆ ئەهلی سوننە راگەیاند و ئەو میحنەتەی لەسەر خەڵکی هەڵگرت و رێز و پایەی ئەهلی فەرموودەی بەرز کردەوە و موعتەزیلە بچووکبوونەوە و پاشەکشێیان کرد و کۆتاییان پێهات، بەڵام ئەم ململانێیە دوو سەرئەنجامی ترسناکی بەرهەم هێنا:

**یەکەم:** ئەو کەلەبەرە گەورەی موعتەزیلە کردبوویانەوە دەربارەی هاوەڵان و پلە و پایەیان دەستەیەك لە رۆژهەڵاتناسە دەمارگیرەکان لێی هاتنە ژوورەوە و هاوەڵانیان بە درۆ و یاریکردن بە ئایینی خودا تۆمەتبار کرد، ئەوەش بینا لەسەر ئەوەی **"النظام"** و هاوەڵانی دەربارەی هاوەڵان رایانگەیاند بوو لە درۆ و بوختان، دەستەیەك لە نووسەرە موسڵمانەکان شوێنی رۆژهەڵاتناسان کەوتن و هەمان قسە و بۆچوونی ئەوانیان دووبارە کردەوە.

**دووەم:** جمهووری موعتەزیلە لە رێچکەی فیقهیدا مەزهەبی ئەبو حەنیفە و هاوەڵانی ئەبو حەنیفەیان گرتبووە بەر، بیشری مورەیسی کە یەکێك بوو لە سەرانی موعتەزیلە ئەوەی راگەیاند بوو لە مەزهەبی فیقیهدا شوێنی ئەبو یوسف(هاوەڵی ئەبو حەنیفە) دەکەوێت، بەڵام کاتێك بیدعەی خەلقی قورئانی راگەیاند ئەبو یوسف کۆچی لێ کرد، کاتێك ئەو دوژمنایەتییە لە نێوان ئەهلی فەرموودە و موعتەزیلەدا پەرەی سەند ئەهلی فەرموودە(بەتایبەت ئەوانەی زیادەڕەوییان تێدا بوو) کەوتنە تانەلێدان و بریندار کردنی هاوەڵانی ئەبو حەنیفە بەو بیانووەی ئەمانەش-وەك موعتەزیلە- شوێنی ڕا و بۆچوون کەوتوون، بەڵام حەنەفییەکان هیچ تاوانێکیان نەبوو جگە لەوەی مەزهەبەکەیان بوو بوو بە مەزهەبی نەیارانی ئەهلی فەرموودە(واتە بوو بوو بە مەزهەبی موعتەزیلە).

تەنانەت ئەبو حەنیفە لە دەمی ئەوانە لە ئەهلی فەرموودە سەلامەت نەبووە کە دواتر هاتن و وتنی خەلقی قورئانیان دایە پاڵ ئەویش، لە کاتێکدا پێچەوانەی ئەو تۆمەتە لە ئەوەوە باس دەکرێت.

تەنانەت محەمەدی کوڕی حەسەن(هاوەڵی ئەبو حەنیفە) دەڵێت: ((هەر کەس لە دوای کەسێکی موعتەزیلییەوە نوێژ بکات با نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە)).

لە ئەبو یوسف پرسیاری موعتەزیلە کرا وتی: ((ئەوانە زەندیقن))[1].

---

[1] الفرق بين الفرق: ص١٠٣.

# بەشی سێیەم

## سوننە لەگەڵ ئەوانەی لە کۆندا حوجەتبوونی ڕەد دەکەنەوە

هێشتا سەدەی دووی کۆچی کۆتایی پێ نەهاتبوو سوننە ڕووبەڕووی کەسانێك بوویەوە بانگەوازیان بۆ ئەوە دەکرد سوننە حوجییەتی نییە ببێت بە سەرچاوەیەك بۆ تەشریعی ئیسلامی، و تەنها متەواتیر لە سوننە حوجییەتی هەیە و ئەوەی خەبەری ئاحادە وەرناگیرێت، هەروەها سوننەیەکیان ڕەد دەکردەوە وەك ڕۆشنکردنەوەی قورئان نەهاتبێت و دووپاتی ئەوە نەکاتەوە لە قورئاندایە و حوکمێکی سەربەخۆ بهێنێت.

یەکەمین کەسێك قسەی لەم مەزهەبە کردووە -وەك بۆمان دەرکەوتووە- ئیمامی شافیعییە(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) لە دەروازەی **"جماع العلم"**دا لە کتێبی **"الأم"**دا هێناویەتی و شافیعی باس لەوە دەکات ڕووبەڕووبوونەوەیەك لە نێوان ئەو و یەکێك لەوانەی خۆی دەداتە پاڵ زانست ڕوویداوە کە هەموو هەواڵێك ڕەد دەکەنەوە، هەر بەو جۆرە شافیعی لە **"الرسالة"**دا بەدوور و درێژی حوجییەتی هەواڵی ئاحاد باس لێوە دەکات.

**ئەمە ئەوەیە لە کتێبی "الأم"دا باسی کردووە:**

شافیعی(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت: (یەکێك لەوانەی خۆی دەداتە پاڵ زانست -لەسەر مەزهەبی هاوەڵەکانی خۆی- پێی وتم: تۆ کەسێکی عەرەبی، قورئانیش بە زمانی ئەوانە دابەزیوە کە تۆ یەکێکی لەوان و شارەزای بە لەبەرکردنی و لەم قورئانەدا کۆمەڵێك فەرز هەن خودا دایبەزاندوون، گەر کەسێك گومان ببات قورئان پیتێکی تەمومژاوی و ناڕوونە داوای تەوبەکردنی لێ دەکەم ئەگینا گەر تەوبەی نەکرد لە گەردنی دەدەم، خودا(عز وجل) دەفەرموێت: ﴿تِبْيَـٰنًا لِّكُلِّ شيء﴾ **النحل: ٨٩**، ئیتر چۆن دروستە بۆ تۆ یان بۆ هەر کەسێکی تر شتێك خودا فەرزی کردووە **جارێك بڵێت:** فەرزەکە تیایدا گشتییە و **جارێکیش بڵێت:** فەرزەکە تیایدا تایبەتە، **جارێك بڵێت:**

فرمانەکە بۆ فەرزە و **جارێکیش بڵێت:** فرمانەکە ئاماژەی موباحبوونی تێدایە، ئەوەی وا لە تۆ دەکات جیاوازی بکەی لە نێوان ئەو دوو فرمانەدا فەرموودەیەکە کە پیاوێك لە پیاوێکی ترەوە دەیگێڕێتەوە یان دوو فەرموودە یان سێ فەرموودە تا بە پێغەمبەری خودای(ﷺ) دەگەیەنن، تۆ و هەموو ئەوانەی مەزهەبی تۆیان گرتووەتە بەر هیچ کەس لەوانەی پێیان گەیشتوون و پێشی خۆتان خستوون بەری ناکەن لە راستگۆیی و لەبەرکردن، هیچ کەس لەوانەی کە ئێوە پێی گەیشتوون لای من لە هەڵە و لەبیرچوون و تێکەوتنی قسە بەری نییە، بەڵکو دەبینم ئێوە دەربارەی **هەندێکیان دەڵێن:** فلاّن کەس لە فلاّن فەرموودەدا هەڵەی کردووە و فلاّنیش لە فلاّن فەرموودەدا، **هەروەها دەبینم دەڵێن:** گەر پیاوێك لەسەر فەرموودەیەك بڵێت ئێوە بەو فەرموودە حەلاّڵ دەکەن و حەرام دەکەن کە زانستی کەسانێکی تایبەتە و پێغەمبەر(ﷺ) نەیفەرمووە بەڵکو ئێوە بەهەڵەداچوون یان ئەو کەسەی بۆی باس کردوون و ئێوە بە درۆی دەخەنەوە، یان بۆی باس کردوون ئێوە داوای تەوبەتان لێ نەکردووە، **تەنها ئەوەندەی پێ دەڵێن:** شتێکی خراپت وتووە، ئایا دروستە جیاوازی بکرێت لە نێوان شتێك لە حوکمەکانی قورئان بە هەواڵی کەسێك، لە کاتێکدا ئاشکرای ئەو کەسە بەو جۆرەیە خۆتان وەسفی دەکەن، ئێوە دەچن هەواڵی ئەو کەسانە بەرانبەر کتێبەکەی خودا راستدەکەنەوە و ئەوەی بتانەوێ وەریدەگرن و ئەوەی نەتانەوێ رەدی دەکەنەوە.

**شافیعی دەڵێ:** ((وتم: ئێمە بە زانستی یەقینی و رووی هەواڵی راستگۆیانە و رووی پێوانە هەواڵێك وەردەگرین، هۆیەکانی ئەمەش جۆراوجۆرە، گەر هەمووی تێدا هاتە دی هەندێکی جێگیرتر و یەقینبەخشترە لە هەندێکی تری.

**وتی:** وەکو چی؟

**وتم:** وەرگرتنم لە پیاوێکەوە بە دانپیادانانی ئەو و بە بەڵگە و سوێندنەخواردنی ئەو و سوێندخواردنی هاوەڵەکەی، دانپیادانان بەهێزترە لە بەڵگە، بەڵگەش بەهێزترە لە سوێند خواردن و سوێندخواردنی هاوەڵەکەی، ئێمە هەرچەند یەك شت بەرهەم دەهێنین، بەڵام هۆیەکانی جۆراوجۆرن.

کەسەکە نەیارەکە وتی: گەر لەسەر ئەوە وەستان هەواڵەکانیان لێ وەربگرن، هەواڵەکانیش ئەوەیان تێدا بێت کە باستان کرد لە کاروباری خۆتان بە قبووڵ کردنیان، ئەوا بەڵگەتان چییە لەسەر ئەو کەسەی هەواڵەکە رەد دەکاتەوە؟

**هەروەها نەیارەکە وتی:** من هیچ شتێك لەو وەرناگرم، چونکە ئەگەری وەهم و ئەندێشەیان هەیە، من تەنها شتێك وەردەگرم شایەتی پێ بدەم لەسەر خودا وەك چۆن شایەتی بە کتێبەکەی دەدەم کە هیچ کەس ناتوانێ شکی لە پیتێکی هەبێت)).

**شافیعی دەڵێ:** ((وتم پێی: هەر کەس زانستی زمان بزانێت کە کتێبەکەی خودا و حوکمەکانی خودای پێ دابەزیوە زانستی زمانەکەی بەو دوانە رێنموونی دەکات بۆ قبووڵ کردنی هەواڵ(فەرمووده)ی راستگۆیان لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) گشتی و تایبەتی.

شافیعی پاشان بەڵگە لەسەر ئەوە دەهێنێتەوە و دەڵێت: خودا(عز وجل) دەفەرموێت:

﴿ هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ﴾ **الجمعة: ٢**

**نەیارەکە وتی:** ئێمە زانیمان کتێب لە ئایەتەکەدا بریتییە لە کتێبەکەی خودا، ئەی **"الحكمة"** چییە؟

**وتم:** سوننەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ).

**نەیارەکە وتی:** ئەگەری ئەوەی تێدایە فێرکردنی کتاب بە گشتی بێت و فێرکردنی حیکمەت تایبەت بێت کە بریتییە لە فێربوونی حوکمەکانی قورئان؟

**وتم:** مەبەستت ئەوەیە پێغەمبەر(ﷺ) لە خوداوە کۆی ئەوەی بەگشتی خراوەتە روو لە فەرزەکانی نوێژ و زەکات و حەج و شتانی تر رۆشن بکاتەوە، ئەو کات خودا بە کتێبەکەی فەرزەکانی راگەیاندووە و پاشان لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی رۆشنی کردوونەتەوە؟

**وتی:** ئەوە هەڵدەگرێت.(واتە بەو جۆرە بێت).

**وتم:** گەر بەو جۆرە بۆی بچیت کەوابوو ئەوە مانای یەکەمی پێش ئەوەیە، کە گەیشتن پێی تەنها بە هەواڵێك دەبێت لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ).

**نەیارەکە وتی:** ئەی ئەگەر تۆ تەنها قسە دووبارە بکەیەوە؟

**وتم:** ئەی کامیان پێی لەپێشترە، کاتێك کتاب و حیکمەت باس دەکات دوو شت بن نەك یەك شت؟

**وتی:** ئەگەری هەیە بەو جۆرە بێت وەك باست کرد کتاب و سوننە بن ئەو کات دوو شت بن، بەڵام ئەگەریشی هەیە یەك شت بن؟

**وتم:** بەهێزترینیان یەکەمینە، لە قورئانیشدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی وتمان و پێچەوانەی ئەوەی تۆ بۆی دەچیت:

**وتی:** لە کوێ؟

**وتم:** لە ئایەتی: ﴿ وَٱذۡكُرۡنَ مَا يُتۡلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلۡحِكۡمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ﴿٣٤﴾ ﴾ **الأحزاب: ٣٤**، هەواڵی ئەوەی دا دوو شت خوێنراونەتەوە لە ماڵەکانیاندا.

**نەیارەکە وتی:** ئەوە قورئان دەخوێنرێتەوە دروستە ئەی چۆن حیکمەت دەخوێنرێتەوە؟

**وتم:** مانای **"تلاوة"** ئەوەیە بە زمانی سوننەت گوزارشت بکات وەك چۆن گوزارشت لە قورئان دەدات.

**نەیارەکە وتی:** ئەمەیان(ئەم بەڵگەیان) رۆشنترە لەوەی یەکەمیان کە حیکمەت شتێکی ترە جگە لە قورئان.

**وتم:** خودا شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) لەسەر ئێمە فەرز کردووە.

**وتی: لە کوێ؟**

**وتم:** خودا(عز وجل) دەفەرموێت: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴿٦٥﴾ ﴾ **النساء: ٦٥**

هــەروەها دەفــەرموێت: ﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَۖ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ عَلَيۡهِمۡ حَفِيظٗا ۝٨٠﴾ **النساء: ٨٠**

هــەروەها دەفــەرموێت: ﴿فَلۡيَحۡذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنۡ أَمۡرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمۡ فِتۡنَةٌ أَوۡ يُصِيبَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ۝٦٣﴾ **النور: ٦٣**

**نەیارەکە وتی:** هیچ شتێك لەپێشتر نییە دەربارەی **"الحکمة"** بیلێین جگە لەوەی بلێین سوننەتی پێغەمبەری خودایە(ﷺ)، گەر ئەوە بەو جۆرە بێت هەندێك لە هاوەڵانی ئێمە دەیلێین: (خودا فەرمانی پێکردووین بە خۆڕادەست کردن بۆ حوکمی پێغەمبەر(ﷺ)، حوکمەکەشی بۆ ئەوەیە خودا دایبەزاندووە) ئەوا ئەو کەسەی خۆی رادەستی پێغەمبەر(ﷺ) ناکات لەپێشترە بدرێتە پاڵ خۆڕادەست نەکردن بۆ حوکمی خودا تا خۆڕادەست نەکردن بۆ حوکمی پێغەمبەر(ﷺ).

**وتم:** خودا شوێنکەوتنی فەرمانی پێغەمبەرەکەی فەرز کردووە بە ئایەتی: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْ﴾ **الحشر: ٧**

**نەیارەکە وتی:** لە قورئاندا زۆر رۆشنە لەسەر ئێمە فەرزە ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکردووین وەریبگرین و ئەوەی نەهی لێکردووین لێی دووربکەوینەوە.

**شافیعی دەڵێت:** وتم: ئایا فەرز لەسەر ئێمە و ئەوانەی پێش ئێمە یەکێکە؟

**نەیارەکە وتی:** بەڵێ.

**وتم:** گەر بەو جۆرە بێت پێویستە لەسەرمان شوێنی فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) بکەوین، گەر پێغەمبەر(ﷺ) شتێکی لەسەر فەرز کردین ئایا کاروبارێکی پێ نیشان داوین فەرزەکەی پێ جێبەجێ بکەین؟

**نەیارەکە وتی:** بەڵێ!

**وتم:** ئایا هیچ رێگەیەك بوونی هەیە بۆ جێبەجێ کردنی فەرزێکی خودا(عز وجل) لە شوێنکەوتنی فەرمانێکی پێغەمبەری خودا(ﷺ) یان شوێنکەوتنی فەرمانێکی کەسێك

له پێش تۆوه یان له دوای تۆوه جگه له هــهواڵێك كــه لــه پێغهمبــهری خــوداوه(ﷺ) بهدهستمان گهیشتووه؟

**لێرهدا شافیعی باسی ئهوهشی بۆ كرد:** چۆن قورئان ههندێكی ههندێكی دهســڕێتهوه و هیچ ڕێگهیهكمان لهبهردهمدا نییه جگه له ههواڵ له پێغهمبهری خوداوه(ﷺ).

**نهیارهكه وتی:** بهڵگه بۆ تۆ جێگیره و پێویســته لهســهرمان هــهواڵ لــه پێغهمبــهری خوداوه(ﷺ) وهربگرین، من قبووڵی هــهواڵ دهكــهم لــه موســڵمانانهوه دهربــارهی ئــهو مانانهی له قورئاندا هاتوون.

كهسه نهیارهكه گهڕانهوهی خۆی لــهو بیروبــاوهڕه ڕاگهیانــد دوای ئــهوهی حــهقی بــۆ دهركهوت.

**پاشان نهیارهكه پرسیاری له شافیعی كرد چۆن گشتی دهبێت جارێك له قورئاندا گشتی بێت و جارێكیش تایبهت بێت؟**

**شافیعی بۆی ڕۆشن دهكاتهوه كه:** زمانی عــهرهب بهرینه، ههندێ جار شتێكی گشــتی گوزارشت لێ دهدا و مهبهستی پێ تایبهتــه، وتــنی تایبــهتكردنی گشــتی تــهنها بــه بهڵگهی قورئان و سوننهت دهبێت، پاشان چهند نموونهیهكی له گشــتاندنی قورئــان بــۆ باس كرد كه به ههواڵ له پێغهمبهرهوه(ﷺ) تایبهت كراون، وهك گشتاندنی نوێژ لهسهر ئهوانــهی ئــههلی تــهكلیفن و ئهوانــهی خــاوهن حــهیزن جیاكراونهتــهوه لــهو كاره(لــه نوێژكردن)، زهكات لهسهر ههموو ماڵێك گشتییه، بهڵام پێغهمبهر(ﷺ) ههندێ مــاڵی تایبــهت كردووهتــهوه، وهســێت بــۆ دایــك و بــاوك بــه جیاكردنــهوهی بهشــهكان نهسخكراوهتهوه، میرات بۆ باوكان و دایكان و منداڵ گشتییه و كافری لێ تایبهتكراوه و میراتی موسڵمان نابات، بهنده لــه ئــازاد و بكــوژ لــه كــوژراو هــهموو ئهوانــه لــه سوننهتدا هاتوون، نهیارهكه دان بهوهدا دهنێت هیچ ڕێگهیهك نییه بــۆ زانــینی ئهوانــه جگه له سوننه.

**دواجار نهیارهكه ڕایدهگهیهنێت قبووڵ كردنی ههواڵی پێغهمبهر(ﷺ) قبووڵكردنه لــه خوداوه.**

# بەشی چوارەم

## سوننە لەگەڵ ئەوانەی لە چاخی نوێدا ڕەدی دەکەنەوە

لەم چاخەی ئێمەشدا کەسانێك کە زانستیان نییە بەم هونەرە(**علوم الحدیث**) حوجەتبوونی سوننەت رەد دەکەنەوە، گۆڤاری "المنار"ی رشید رەزا خودالێی خۆشبێت لە دوو ژمارەی (٧ و ١٢)ی ساڵی نۆیەم دوو وتاری تۆفیق صدقی بڵاوکردووەتەوە کە ئەم رایەی هەیە لەژێر ناوی: **"الإسلام هو القرآن وحده"**، شوبهەکانی بە کورتی ئەمانەن:

**یەکەم:** خودا(عز وجل) دەفەرموێت: ﴿**مَّا فَرَّطْنَا فِي ٱلْكِتَٰبِ مِن شَيْءٍ**﴾ **الأنعام: ٣٨.**

هەروەها ئایەتی: ﴿**وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَيْءٍ**﴾ **النحل: ٨٩**، بەڵگەی ئەوەیە قورئان هەموو شتێك لە کاروباری دین و حوکمەکانی لەئامێز دەگرێت، خودا قورئانی ڕۆشن کردووەتەوە و بەدوورودرێژی واڵای کردووە بە جۆرێك ئاتاج نەبێت بە سوننە، ئەگەر ئاتاج بێت بە سوننە ئەوا قورئان زیادەڕەوی تێدایە و نەدەبووە بەیانکەری هەموو شتێك، ئەمەش دژایەتی دەگەیاند لە قسەی خودادا.

**دووەم:** لە ئایەتی: ﴿ **إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ⑨** ﴾ **الحجر: ٩**، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خودا پارێزگاری قورئانی لە ئەستۆگرتووە نەك پارێزگاری سوننە، گەر سوننە بەڵگە و حوجە بوایە وەك قورئان خودا پارێزگاری ئەویشی لە ئەستۆ دەگرت.

**سێیەم:** گەر سوننە حوجە بوایە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی دەکرد بە نووسینەوەی و دواتر هاوەڵان و شوێنکەوتووان کاریان دەکرد بۆ نووسینەوەی، ئەوەش بۆ ئەوەی لە دەستێوەردان و گۆڕین و هەڵە و لەبیرچوون بیپارێزن، و بیگەیەنن بە دەستی موسڵمانانی دوای خۆیان، چونکە هەواڵێك لەڕووی گومانەوە جێگیر کرابێت(**ظني الثبوت**) دروست نییە بەڵگەی پێ بهێنرێتەوە، خودا(سبحانە وتعالی) دەفەرموێت: ﴿ **وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ** ﴾ **الإسراء: ٣٦.**

هەروەها دەفەرمویّت: ﴿إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ﴾ **الأنعام: ١٤٨**، ناتوانین جیّگیربوون و دروستییەکەی یەکلابکەینەوە مەگەر بە نووسینی لەلایەن ئەوانەوە وەك چۆن قورئان نووسرایەوە، بەڵکو جیّگیر ئەوەیە پیّغەمبەر(ﷺ) نەهی لە نووسینەوەی کردووە و فەرمانی کردووە بە سڕینەوەی ئەوەی نووسیویانەتەوە، بۆیە هاوەڵان و شویّنکەوتوان بەو جۆرەیان کرد.

**چوارەم:** لە پیّغەمبەرەوە(ﷺ) حوجەت نەبوونی سوننە هاتووە، لەوانە: ((فەرمووده بە دەم منەوە بلاّوە دەکات، ئەوەی بۆتان هات و لەگەڵ قورئان تەبا بوو ئەوە لە منەوەیە، ئەوەی بۆتان هات و پیّچەوانەی قورئان بوو لە منەوە نییە)).

بۆیە گەر لە سوننەوە حوکمیّکی تازە جیّگیر کرا لە قورئاندا نەبوو ئەو حوکمە پیّچەوانەی قورئانە، گەر حوکمیّکی تازەش جیّگیر نەکات و تەنها دووبارەکردنەوەی حوکمی قورئان بیّت ئەوا تەنها قورئان حوجەیە.

هەروەها لەو فەرموودانە: ((گەر فەرموودەیەکتان بۆ باسکرا بە مەعروفتان زانی و بە مونکەرتان تەماشا نەدەکرد من وتبیّتم یان نەموتبیّت بەڕاستی بزانن، چونکە من مەعرووف دەڵیّم و شتیّك ناڵیّم مونکەر بیّت، گەر فەرموودەیەکتان لە منەوە بۆ باسکرا بە مونکەرتان دەزانی و بە مەعرووفتان نەدەزانی من وتبیّتم یان نەموتبیّت بە راستی مەزانن، چونکە شتیّك ناڵیّم مونکەر بیّت و مەعرووف نەبیّت)).

ئەم فەرموودەیە رایدەگەیەنیّت ئەو شتەی لە پیّغەمبەرەوە(ﷺ) باس دەکریّت بە ترازووی مەعرووف لەلای موسڵمانان بپیّوریّت لە حوکمی کتیّبەکەی خودا، بۆیە سوننە نابیّتە حوجە.

هەروەها لەو فەرموودانە: ((من شتیّك حەڵاڵ دەکەم خودا لە کتیّبەکەیدا حەڵاڵی کردبیّت و شتیّك حەرام دەکەم خودا لە کتیّبەکەیدا حەرامی کردبیّت)).

لە ریوایەتیّکی تردا: ((خەڵکی خۆیان لە شتیّك نەگرنەوە لە منەوە وترابیّت، چونکە من تەنها ئەوە حەڵاڵ دەکەم خودا حەڵاڵی کردووە و تەنها ئەوە حەرام دەکەم خودا حەرامی کردووە)).

**ئەمە پوختەی ئەو شویهانە بوو دکتۆر تۆفیق صدقی لە گۆڤاری ناوبراودا هێناویەتی.**

## وەڵامی شوبهەی یەکەم:

قورئان ئوسوڵی ئایین و رێساکانی حوکمە گشتییەکان لەخۆ دەگرێت، هەندێکیشی راشکاوانە دەربڕیوە، و هەندێکی تری بۆ رۆشنکردنەوەی پێغەمبەر(ﷺ) وازلێهێناوە، لەبەر ئەوەی خودا پێغەمبەرەکەی(ﷺ) رەوانە کردووە بۆ ئەوەی حوکمەکانی ئایین بۆ خەڵکی رۆشن بکاتەوە، خودا شوێنکەوتنی ئەو پێغەمبەرەی لەسەر پێویست کردوون بۆیە رۆشنکردنەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ حوکمەکان رۆشنکردنەوەی قورئانە، لێرەوە حوکمەکانی شەریعەت لە کیتاب و سوننەت و ئەوەی دەبێتە پاشکۆی ئەو دوانە لە ئیجماع و پێوانە حوکمگەلێکن لە کتێبەکەی خودا(سبحانە وتعالی)، جا یان بە دەق یان بە ئاماژە، بۆیە دژایەتی نییە لە نێوان حوجییەتی سوننەت و ئەوەی قورئان هاتووە وەك بەیانکەری هەموو شتێك(**تبيانا لكل شيء**).

شافیعی(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت: ((هەرشتێك روو لە هەر کەسێك بکات لە ئاییینەکەی خودادا بەڵگەیەك هەیە بۆ رێنموونی لەسەری))، خودا(سبحانە وتعالی) دەفەرموێت:﴿الٓرۚ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ لِتُخۡرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِ رَبِّهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ١﴾ **إبراهيم: ١**.

هەروەها دەفەرموێت:﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ٤٤﴾ **النحل: ٤٤**.

هەروەها ئایەتی: ﴿وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ تِبۡيَٰنٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ﴾ **النحل: ٨٩**

"البيان" ناوێکی کۆکەرەوەیە بۆ مانای کۆکراوە لە ئوسوڵ و فرە رەهەند لە لقەکاندا، ئەوەی خودا(سبحانە وتعالی) لە کتێبەکەیدا بەیانی کردووە تاکو مرۆڤەکان بەندایەتی خۆیانی پێ دەربڕن لە چەند روویەکەوەیە:

١. هەیانە بە دەق بۆ درسوتکراوەکانی رۆشن کردووەتەوە وەك کۆی فەرزەکان لەوەدا کە نوێژ و زەکات و رۆژ و حەجیان لەسەرە و فاحیشەی لەسەر حەرام کردوون ئەوەی

دەرکەوتووە و ئەوەی شاراوەیە، هەروەها بە دەق زینا و کوشتن و عارەق و خواردنی گۆشتی مردارەوەبوو و خوێن و گۆشتی بەرازی لێ حەرام کردوون، هەروەها رۆشنی کردووەتەوە چۆن دەستنوێژ هەڵدەگیرێت، و شتانی تر کە بە دەق رۆشنکراونەتەوە.

٢. هەیانە بە کتێبەکەی فەرزبوونی دامەزراندووە و پاشان لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) -وەك نوێژ- ژمارەی رکاتەکان و زەکات و کاتی زەکات و شتانی تر کە حوکمەکانیان لە قورئاندا هاتووە دیاریکردووە.

٣. هەیانە سوننەتی پێغەمبەرە و حوکمێکی خودا(قورئان)ی لەسەر نییە، قورئان گوێڕایەڵی پێغەمبەری(ﷺ) پێویست کردووە، و داوای کردووە لە پای حوکمەکانی ئەودا بوەستن، هەر کەس لە پێغەمبەری قبووڵ بکات بە فەرزێکی خودایی قبووڵی کردووە.

٤. هەیانە خودا(سبحانە وتعالی) فەرزی کردووە لەسەر بەندەکانی بۆ داواکردن و بەدەستهێنانی ئیجتیهاد بکەن، گوێڕایەڵی ئەوانی تاقیکردووەتەوە لە ئیجتیهاددا، وەك چۆن گوێڕایەڵی ئەوانی تاقیکردووەتەوە لەو شتانەی خۆی فەرزی کردووە لەسەریان.

پاشان دەڵێت: هەر کەس فەرزەکان لە خوداوە(سبحانە وتعالی) قبووڵ بکات لە کتێبەکەیدا ئەوا سوننەتی پێغەمبەری(ﷺ) بە فەرزی خودا لەسەر بەندەکانی قبووڵ کردووە و داوای لێکردوون لە پای حوکمی ئەودا بوەستن، هەر کەس لە پێغەمبەری(ﷺ) قبووڵ بکات لە خودای قبووڵ کردووە، بەهۆی ئەوەی گوێڕایەڵی ئەوی فەرز کردووە، بۆیە قبووڵ کردن لە کتێبەکەی خودا و قبووڵکردن لە سوننەتی پێغەمبەرەوە کۆدەکاتەوە و هەریەك لەم دوانە قبووڵ کردنە لە خوداوە، با لقی هۆیەکان کە لێیانەوە قبووڵ دەکات جۆراوجۆریش بێت.

**وەڵامی شوبهەی دووەم:**

ئەوەی خودا بەڵێنی داوە لە پارێزگاری کردنی زیکر تەنها قورئان ناگرێتەوە، بەڵکو مەبەست پێی شەرع و ئاییینی خودایە کە پێغەمبەرەکەی پێ رەوانە کردووە، ئەوەش گشتگیرترە لەوەی بەتەنها قورئان و سوننەت بێت، بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەم ئایەتەیە: ﴿فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٤٣﴾ **النحل: ٤٣**، "أهل الذكر" واتە ئەهلی زانست

به ئایینی خودا و شەریعەتەکەی، گومـانی تێـدا نییـە وەك چـۆن خـودا کتێبەکـەی پاراسـتووە سـوننەتی پێغەمبەرەکەشـی پاراسـتووە بـەوەی ئیمامـانی زانسـتی بـۆ ئامادەکردووە تاکو بیپارێزن و بیگوێزنەوە و لە نێوان خۆیاندا لێکۆڵینەوەی بۆ بکەن و سەحیحی لە شتە نامۆکان جیابکەنەوە، لەو پێنـاوەدا تەمـەنی خۆیـان فـانی کـرد و تێکۆشانێکی مـەزنیان بـەخت کـرد، بـەو جـۆرە سـوننەتی پێغەمبـەر(ﷺ) بـوو بـە قوتابخانەیەکی پارێزراوی تۆمارکراو لە سەرچاوەکەی خۆیەوە و شتێکی لێ بزر نەبووە.

زانایان-لەپێش هەموویانەوە شافیعی(رەحمەتی خودای لێ بێت)- دەڵێن سوننەتەکان لەلای ئەهلی زانست بەگشـتی بـوونی هەیـە، بـا هەندێکیشـی لـە هەنـدێکی تـری کۆکراوەتر بێت، بەڵام گەر هـەموو زانسـتەکەیان کۆبکەیـەوە هـەمووی دەگرێتـەوە، کاتێك زانستی هەریەکەیان بەجیا تەماشا بکەی شتێکی بەسـەردا تێدەپـەڕی، بـەڵام ئەوەی لەدەست دەچێت لای کەسانی تر بوونی هەیە[1].

ئیبن حەزم دەچێت بەگژ ئەوانەدا پێیانوایە زیکر تەنها بریتییە لە قورئـان و دەڵێـت: ((ئەوە بانگەشەیەکی بێ بەڵگەیـە و تایبـەتکردنی وشـەی **"ذکـر"**ە بـەبێ بەڵگـە.. **"الذکر"** ناوێکە بۆ هەموو ئەوە بەکاردەهێنرێت خودا بـۆ سـەر پێغەمبەرەکـەی(ﷺ) دابەزاندووە لە قورئان یان سوننەت کە وەحییەکە قورئانی پێ ڕۆشن دەکرێتەوە..))[2].

## وەڵامی شوبهەی سێیەم:

فەرمان نەکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بە نووسینی سوننە و نەهی کردن لە نووسـینی وەك لە هەندێ فەرموودەدا هاتووە بەڵگەی حوجـەت نـەبوونی نییـە، بـەڵکو-وەك پێشـتر باسمان کرد- بەرژەوەندی داوای ئەوەی دەکرد نووسـەران لـە هـاوەڵان-بـەهۆی ژمـارە کەمییانەوە- خۆیان بۆ تۆمارکردنی قورئان ساغ بکەنەوە و خەریکی پارێزگاری کردنی قورئان بن نەبادا شتێکی لێ بزر ببێت یان بە شتێکی تر تێکەڵ بکرێت، پێشتر باسـی ئەوەمان کرد نەهیکردن لە نووسینەوەی سوننە نەهیکردن بووە لە تۆمـار کردنـی بـە

[1] الرسالة ص٤٣.
[2] الإحكام ١٢١/١.

شێوەیەکی فەرمی وەك چۆن قورئان تۆمار دەکرا، بەڵام نووسەرێك بۆ خۆی بینووسیێتەوە ئەوە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) روویداوە.

حوججەت بوون تەنها لەسەر نووسین کورت نابێتەوە تا بوترێت گەر حوججەتبوونی سوننەت لە لای پێغەمبەر(ﷺ) مەبەست بوایە فەرمانی دەکرد بە نووسینەوەی، حوججەت بوون بە زۆر شت جێگیر دەبێت، لەوانە:

**تەواتور و گواستنەوەی کەسانێکی دادپەروەر و جێمتمانە، یەکێکیش لەوانە نووسینەوەیە،** کۆکردنەوەی قورئان لە سەردەمی ئەبوبەکردا(خوا لێی رازی بێت) تەنها تۆمارکردنەوەی ئەو لاپەڕانە نەبوو کە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) تۆمار کرابوون، تا لەبەرکردنی هاوەڵان بۆ هەر ئایەتێك تەواتوری پەیدا نەکردبایە بەتەنها نووسینەکە رازی نەدەبوون، گواستنەوە لە رێگەی لەبەرکردنەوە هیچی کەمتر نییە لە نووسین، بەتایبەت لە نەتەوەیەکی وەك عەرەب کە هێزی لەبەرکردن بەناوبانگ بوون.

**ئەو قسەش کە دەوترێت تۆمارکردنی سوننە دواکەوتووە بۆیە متمانە بە دەرخ کردنی ناکرێت و جێگەی گومانە و گومانیش لە ئاییینی خودادا دروست نییە،** ئەمە قسەی کەسێکە بێئاگایە لە تێکۆشانی زانایان بۆ قەلاچۆ کردنی لادان و دانان، گەر سوننە بەزۆری بە گواستنەوە و لەبەرکردن و هەندێ جاریش بە نووسین -لە چاخی هاوەڵانەوە بۆ کۆتایی سەدەی یەك- گوازرابێتەوە کە **"الزهري"** بە فەرمانی عومەری عبدالعزیز سوننە تۆمار دەکات ئەوا زنجیرەی پارێزگاری و پاراستن پەیوەست بووە و پچڕان رووی لێ نەکردووە و دروست نییە شك و گومانی بخرێتە سەر، بەڵام ئەوەی خزێنراوەتە ناو سوننەتەوە لە درۆ و هەڵبەستن زانایان رووبەڕووی بوونەتەوە و رۆشنیان کردووەتەوە کە بوارێك بۆ شك و گومان ناهێڵێتەوە، بە جۆرێك دڵی مرۆڤ بۆ لای سوننە ئارام دەبێتەوە تا نزیکدەبێتەوە لە پلەی یەقین، لەگەڵ ئەوەش ئێمە ناڵێین فەرموودەی ئاحاد -کە زۆربەی سوننە پێکدەهێنێت- فەرموودەیەکی بڕاوەیە و یەقین دەبەخشێت -لەگەڵ ئەوەی هەندێ لە زانایان وتوویانە- بەڵکو دەڵێین فەرموودەی ئاحاد گومان دەبەخشێت.

**بانگەشەی ئەوەش گومان لە ئاییینی خوادا دروست نییە،** ئەوە لەو بوارەدایە پەیوەندی بە ئوسوڵی ئایینەوە هەیە کە هەر کەس نەرێی بکات یان شکی تیایدا هەبێت بە کافر

دادەنرێت، وەك یەكتایی خودا و راستگۆیی پێغەمبەرەكەی(ﷺ) و دانەپاڵی قورئان بۆ لای پەروەردگار، هەر بەو جۆرە پایەكانی ئیسلام وەك نوێژ و زەكات و رۆژ و حەج، بەڵام لە لقەكاندا رێگر نییە لە رێگەی گومانەوە جێگیر بكرێن، بەڵكو ئەو كەسەی ئەم بانگەشەیە دەكات ناتوانێت بیسەلمێنێ هەموو حوكمەكانی ئایین یەقینییە، بەراورد بەوەی لە رێگەی ئیجتیهادەوە لە دەقەكانی قورئان دەردەهێنرێن حوكمی براوە زۆر كەمە، لە قورئاندا گشتی و تایبەت و رەها و سنووردار و پوختە و رۆشنكراو بوونیان هەیە، هەموو ئەمانەش بڕانەوە لە تێگەیشتنی دەقەكەدا دەكەنە كارێكی ئەستەم، ئەمە لە **"علم الأصول"** كارێكی بەڵگەنەویستە، كاركردن بە شایەتی كە رێگەیەكی گومانئامێزە بۆ جێگیر كردنی حوكمێكی شەرعی بەڵگەیە لەسەر ئەوانەی باوەڕیان بە حوججەت نەبوونی سوننە هەیە، چونكە شایەتییەكە ئەگەری درۆ و هەڵەی تێدایە، ئایا لە دوای ئەمە بوارێك دەمێنێتەوە بۆ وتنی ئەو قسەی گومان بەكارنایەت بۆ جێگیركردنی حوكمی شەرعی؟

**وەڵامی شوبهەی چوارەم:**

**ئەو كۆمەڵە فەرموودە بوو ئاماژەی پێكردن، ئەمەش وەڵامەكەیانە:**

**فەرموودەی یەكەم:** ((فەرموودە بە دەم منەوە بڵاوە دەكات..هتد))

**"البیهقي"** لەسەری دەڵێت: فەرموودەكە پچڕاوە[1].

**شافیعیش** هەمان قسە دەكات.

**ئیبن حەزم** هەندێ لە راوییەكانی بە زەندەقە تۆمەتبار دەكات.

**قسەیەك لە رووی مەتنی فەرموودەكەوە:**

ئەهلی زانست كۆدەنگییان هەیە لەسەر ئەوەی سوننەی سەحیح پێچەوانەی كتێبەكەی خودا نییە، ئەو فەرموودانەی حوكمیان تێدایە پێچەوانە قورئان رەدكراوەن و فەرموودە نین.

[1] مفتاح الجنة ص١٥.

**ئیبن حەزم دەڵێت:** (لەو فەرموودەدا شتێك بوونی نییە پێچەوانەی قورئان بێت).

**محەمەدی کوڕی عەبدوڵای مەسەڕە دەڵێت:** (فەرموودە سێ بەشە: فەرموودەیەك تەبایە لەگەڵ ئەوەی لە قورئاندا هاتووە وەرگرتنی فەرزە، فەرموودەیەك زیاترە لەوەی لە قورئاندا هاتووە دیسان وەرگرتنی فەرزە، فەرموودەیەك پێچەوانەی ئەوەیە لە قورئاندا هاتووە وەرناگیرێت).

بۆیە ناتوانرێت مەتنی ئەو فەرموودەیە بە هەڵبەستن تۆمەتبار بکرێت گەر گوزارەکەی بەم جۆرە بێت: ((**فما لم يوافق أو ما خالف فمردود**))، ئیمامی **"الشاطبي"** دەڵێت: ((فەرموودە وەحییە لە خوداوە بۆیە نابێت دژایەتی هەبێت لەگەڵ کتێبەکەی خودا.. بەڵێ دەگونجێ سوننە شتێك بهێنێت کە نە پێچەوانە بێت نە لە قورئاندا هاتبێت، بەڵکو قورئان لێی بێدەنگ بوو بێت..))

**فەرموودەی دووەم:** ((گەر لە منەوە فەرموودەیەکیان بۆ باس کردن بە مەعرووفی بزانن و بە مونکەری نەزانن-من وتبێتم یان نەموتبێت- بەڕاستی بزانن..)) ریوایەتەکانی لاوازە.

**ئیبن حەزم دەڵێت:** فەرموودەیەکی مورسەلە.. حاشا پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگە بدات بە درۆکردن بە دەمییەوە لە کاتێکدا فەرموویەتی: "هەر کەس بەئەنقەست درۆ بە دەم منەوە بکات با شوێنی خۆی لە ئاگردا خۆشبکات"، **ئیبن حەزم دەڵێت:** یەکێك لە راوییەکانی(عبيدالله بن سعيد) درۆزنێکی بەناوبانگ بووە.

ئەم فەرموودەیە بە ڕێگەی قبوولکراو ریوایەت کراوە، بەڵام ئەم بەشەی تێدا نییە: "وتبێتم یان نەموتبێت" و هیچ بەڵگەیەکی تێدا نییە بۆ کەسی سەرپێچیکار.

**فەرموودەی سێیەم:** ((من ئەوە حەڵاڵ دەکەم خودا لە کتێبەکەیدا حەڵاڵی کردووە و ئەوە حەرام دەکەم خودا لە کتێبەکەیدا حەرامی کردووە)).

**"السيوطي" دەڵێت:** شافیعی و بەیهیقی لە ڕێگەی تاووسەوە ریوایەتیان کردووە.

**شافیعی دەڵێت:** (ئەم فەرموودە پچڕاوە، پێغەمبەر(ﷺ) هەر بەو جۆرەی کردووە و بەو کارە فەرمانی پێکراوە و لەسەری فەرزکراوە شوێنی ئەو وەحییە بکەوێت بۆی

ڕەوانە کراوە، ئێمە شایەتی دەدەین بۆی پێغەمبەر(ﷺ) شوێنی ئەو وەحییە کەوتووە و فەرزەکەی خودای(سبحانە وتعالی) قبووڵ کردووە.

پاشان **"البیهقي"** لەسەر وشەی"لە کتێبەکەیدا" دەڵێت: ئەوەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) وەحی کرا دوو جۆر بوو: وەحیەك دەخوێنرێتەوە لەگەڵ وەحیەك ناخوێنرێتەوە)[1]، تۆ دەبینی **"البیهقي"** وشەی **"کتێب"**ی گشتگیرتر لە قورئان لێکداوەتەوە، بەم مانایە فەرموودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) دەهێنێتەوە دەربارەی کێشەی نێوان دوو پیاو کە فەرمووی: ((بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە بە کتێبەکەی خودا حوکم لە نێوانتان دەکەم، مەڕ و خزمەتکارەکەت بۆ دەگەڕێتەوە و ژنەکەی ئەویش ڕەجم دەکرێت گەر دانی پیادا بنێت)).

بەمەش بۆمان ڕوون دەبێتەوە ئەو فەرموودانەی کەسی خاوەن شوبهە ئاماژەی پێ دەکەن جێگیر نەبوون، هەشیانە جێگیر بووە، بەڵام ئەو بەڵگەی تێدا نییە کەسی خاوەن شوبهە دەیەوێت، بەڵکو پێچەوانەی ئەو شوبهەیە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) جێگیر بووە و دەفەرموێت: ((یەکێك لە ئێوە لەسەر جێگەکەی پاڵ نەداتەوە و ئەمرێکی منی بۆ بێت لەوەی فەرمانم پێکردوە یان نەهیم لێکردووە و بڵێت: نازانم، ئەوەی لە کتێبەکەی خوادا بیبینینەوە شوێنی دەکەوین))[2].

**پوختەی قسان** ڕەد کردنەوەی حوججەتی سوننە و بانگەشەی ئەوەی ئیسلام تەنها بریتییە لە قورئان موسڵمانێك ئایینی خودا و حوکمەکانی شەریعەت بەتەواوی بناسێت و بزانێت قسەی لەو جۆرە ناکات، ئەو قسەیە پێچەوانەی واقیعە، چونکە حوکمەکانی شەریعەت زۆرینەی لە سوننە وەرگیراون، ئەوەی لە قورئاندا هاتووە بەزۆری پوختە و ڕێسای هەمووەکین، ئەگینا لە کوێی قورئان بزانین نوێژەکان پێنجن و لە کوێی قورئان ڕکاتەکانی نوێژ دەربهێنین و بڕی زەکات و درێژەی دروشمەکانی حەج و حوکمەکانی مامەڵە و عیبادەت بزانین؟

---

[1] الإحكام لإبن حزم ٧٨/٢.

[2] الرسالة ص٤٠٣.

# بەشی پێنجەم

## سوننە لای ئەوانەی هەواڵی ئاحاد ڕەد دەکەنەوە

**زانایانی فەرموودە هەواڵ بۆ دوو بەش دابەش دەکەن:**

متواتیر: ئەوەیە دەستەیەکی دادپەروەری متمانەدار لە دەستەیەکی دادپەروەری متمانەوەدارەوە دەیگوێزنەوە، بەو جۆرە تا دەگاتە پێغەمبەر(ﷺ).

ئاحاد: ئەوەیە یەك کەس یان دوو کەس لە یەك کەس یان دوو کەسەوە دەیگێڕێتەوە تا بە پێغەمبەر(ﷺ) دەگات، یان ئەو فەرموودەیە لە خوار متەواتیرەوە دەیگێڕنەوە.

حەنەفییەکان بەشی سێیەمیان هەیە پێی دەوترێت مەشهوور ئەوەیە کە ئەسڵەکەی(هاوەڵان) ئاحادە، بەڵام لە سەدەی دووەم و سێیەمدا متەواتیرە[1]، وەك فەرموودەی: ((إنما الأعمال بالنيات..))

زانایان کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی متەواتیر پێکەوە زانست و کار دەگەیەنێت، لەلای ئەوان حوججەیە و کێبەرکێی تێدا نییە، جگە لەوانەی حوجەتبوونی سوننەت ڕەد دەکەنەوە.

بەڵام هەواڵی ئاحاد جمهوور لەسەر ئەوەن حوججەیە و پێویستە کاری پێ بکرێت، با گومانیش بگەیەنێت، "الرازي" لە "المحصول"دا بانگەشەی ئەوە دەکات هاوەڵان کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوە، دەستەیەکیش وەك ئیمام ئەحمەد و حاریسی موحاسیبی و حوسەینی کوڕی عەلی کەرابیسی و ئەبو سولەیمانی خەتابی پێیانوایە بڕاوەیە و زانست و کارکردن پێکەوە پێویست دەکات، بۆ هەریەك لەو دوو دەستەیە بەڵگە بوونی هەیە و لە کتێبەکانی ئوسوڵدا ڕۆشنکراونەتەوە، گرنگ ئەوەیە هەردوو لا لەسەر بە حوجەتبوونی هەواڵی ئاحاد و پێویستبوونی کارکردن پێی کۆکن، ڕافیزە و قاسانی و ئیبن داود حوجەتبوونی ڕەد دەکەنەوە[2].

---

[1] التحرير وشرحه٢/٢٣٥.

[2] الإحكام للآمدي١/١٦٩.

به هەمان شێوە ئیبن حەزم ئاماژە بەوە دەکات موعتەزیلـە حوجـەتبوونی هـەواڵی ئاحاد ڕەد دەکاتەوە.

## شوبهەکانی ئەوانەی حوجەتبوونی هەواڵی ئاحاد ڕەد دەکەنەوە:

**یەکەم:** خودا(سبحانه وتعالی) دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾ ﴾ **الإسراء: ٣٦.**

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ ۖ وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ﴿٢٨﴾ ﴾ **النجم: ٢٨.**

ڕێگەی ئاحاد ڕێگەی گومانە، بە هۆی ئەگەری هەڵە و لەبیرچوونی ڕاویەکەوە، هـەر شتێکیش بەو جۆرە بێت بڕاوە نییە و ناتوانرێت بەڵگەی پێ بهێنرێتەوە.

**دووەم:** گەر کارکردن بە هەواڵی ئاحاد لە لقەکانـدا شـیاو بێـت ئـەوا لـە ئوسـوڵ و بیروباوەڕدا شیاو نییە، ناوکۆیی نێوانمان ئەوەیە هەواڵی ئاحاد لـەو مەیدانـەدا قبـووڵ ناکرێت، کەوابوو لە لقەکانیشدا نابێت قبووڵ بکرێت.

**سێیەم:** لە پێغەمبەرەوە بە دروستی هاتووە کە لە وەرگرتنی هەواڵی **"ذي اليـدين"** ڕاوەستا، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لە نوێژی مەغریب یـان عیشـادا لەسـەر دوو ڕکاتـدا سڵاوی نوێژی دایەوە، ئەویش پێی وت: ئایا نوێژەکەت کورت کردەوە یان لەبیرت چوو؟ پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵەکەی وەرنەگرت تا لە ئەبوبەکر و عومەر و ئەوانەی لە ڕیزەکـەدا بوون پرسیاری ڕاستی ئەو قسەی کرد، بۆیە نوێژەکەی تەواو کرد و سـوژدەی سـەهوی برد، گەر هەواڵی ئاحـاد حوججـەت بوایـە پێغەمبـەر(ﷺ) بـەبێ وەسـتان و پرسـیار نوێژەکەی تەواو دەکرد.

**چوارەم:** لە ژمارەیەك لە هاوەڵانەوە کارنەکردن بە هەواڵی ئاحـاد ڕیوایـەت کـراوە، ئەبوبەکر(خوا لێی ڕازی بێت) هەواڵی موغییرەی لە میراتـی داپـیردا ڕەد کـردەوە تـا هەواڵی محەمەدی کوڕی مەسلەمەی هاتە سەر، عومەر(خوا لێی ڕازی بێـت) هـەواڵی ئەبو موسای(خوا لێی ڕازی بێت) ڕەد کردەوە تا هەواڵی ئەبو سەعیدی(خوا لێی ڕازی

بێت) هاتە سەر، ئەبوبەکر و عومەر(خوایان لێ رازی بێت) هەواڵەکەی عوسمانیان رەدکردەوە گوایە پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی دابێت "الحكم بن أبی العاص" بگێڕێتەوە، عەلی(خوا لێی رازی بێت) هەواڵی ئەبی سنانی ئەشجەعی لە "المفوضة"دا رەد کردەوە، عائشە(خوا لێی رازی بێت) هەواڵی ئیبن عومەری(خوا لێی رازی بێت) رەد کردەوە بە سزادانی مردوو بە هۆی گریانی کەسوکارەکەیەوە[1].

**وەڵامی ئەم شوبهانە:**

**زانایان وەڵامی ئەم شوبهانەیان داوەتەوە، بەم جۆرە:**

**وەڵامی شوبهەی یەکەم:** لە لقەکانی ئایین و بەشەکییەکانیدا کارکردن بە گومان پێویستە و هیچ رێگەیەك بۆ گەیشتن پێی بوونی نییە جگە لە گومانێکی زاڵ، نابینی تێگەیشتنەکان لە دەقە قورئانییەکان جۆراوجۆرن و موجتهەیدان چەندین مەزهەبیان تیایدا گرتووەتە بەر، و هیچ کام لەوانە دروستی ئیجتیهادەکەی خۆی بە یەکلاکەرەوە نازانێت، لەگەڵ ئەوەش ئیجماع راستبووەتەوە لەسەر پێویستبوونی کارکردن بەوەی ئیجتیهادەکەی دەیگاتێ، چونکە بۆ ئەوە تەنها رێگەی گومانیان لەبەردەستدایە، بە هەمان شێوە حوجەتبوونی هەواڵی ئاحاد گومانئامێز نییە، بەڵکو یەکلاکەرەوەیە بە هۆی دامەزرانی ئیجماع لەسەر ئەوە لە نێوان زانایاندا لە چاخی هاوەڵانەوە تا ئەوانەی بەدوای ئەواندا هاتن، بۆیە کارکردن پێی بەڵگەیەکی گومانئامێز نەبووە، بەڵکو بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوە بووە و زانستی گەیاندووە کە بریتییە لە ئیجماع[2].

**وەڵامی شوبهەی دووەم:** ئەوەیە ئیجماع راستبووەتەوە لەسەر ئەوەی ئوسوڵی ئایین و بیروباوەڕ هەرگیز نابێت لە رێگەی گومانەوە وەربگیرێت، بەڵام لە لقەکاندا بەو جۆرە نییە، ئامیدی دەڵێت: ((ئەم شوبهەیە هەڵدەوەشێتەوە بە وەرگرتنی هەواڵی یەك کەس لە فتوا و شایەتیدا، چۆن جیاوازییەکە بەرهەم هاتووە(واتە لە نێوان ئوسوڵ و لقەکاندا)، ئەوەش لەبەرئەوەی بەمەرجگیراو لە سەلماندن و جێگیرکردنی پەیامی خودا

---

[1] الإحكام للآمدي١/٩٤و ١/١٧٥ و التقرير٢/٢٧٢-٢٧٣.

[2] ألإحكام لللآمدي ١/١٦٩والإحكام لإبن حزم١/١١٤.

بریتییه له بەڵگەی بڕاوە، و بەڵگەی گومانئامێز تیایدا بەهەند وەرناگیرێت بە پێچەوانەی لقەکانەوە))[1].

لەراستیدا پێوانەی لقەکان بۆ سەر ئوسوڵ لە پێویستبوونی بڕانەوەدا شتێکی محاڵە، چونکە لە لقەکاندا رێگەیەك بۆ ئەوە نییە، بەڵام لە ئوسوڵدا کارەکە پێچەوانەیە و تەنها کەسێکی لوتبەرز مشتومڕی لەسەر دەکات.

**وەڵامی شوبهەی سێیەم:** ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە وەرگرتنی هەواڵی **"ذي اليدين"** وەستابێت لەبەر بوونی ئەگەری هەڵە و تەنهاکەوتنەوەی بە زانینی ئەو کارە جیا لەو دەستە زۆرەی لە نوێژەکەدا ئامادە بوون، هەروەها لەگەڵ دەرکەوتنی نیشانەی وەهم لە هەواڵی یەك کەسدا پێویستە لەسەری بوەستی، کاتێك ئەوانی تر لەسەری تەبابوون نیشانەی وەهمەکەی **"ذي اليدين"** کۆتایی پێ دێت، ئەم قسەیە کەی بەو جۆرەیە لە کاتێکدا پێغەمبەر(ﷺ) بە هەواڵی ئەبوبەکر و عومەر(خوایان لێ رازی بێت) و کەسانی تر جگە لەو دوانە کاری کرد لە کاتێکدا ژمارەیان نەگەیشتبووە رادەی تەواتور.

**وەڵامی شوبهەی چوارەم:** ئەوەی جێگیرە و گومانی تێدا نییە هاوەڵان کاریان بە هەواڵی ئاحاد کردووە، ئەمەش لەوانەوە گەیشتووەتە رادەی تەواتور، هەندێك نموونە باس لێوە دەکەین دەربارەی ئەم راستییە، گەر وەستان لە هەندێ هەواڵی ئاحاد لە ئەوانەوە ریوایەت کرابێت ئەوە نابێتە بەڵگە لەسەر کارنەکردنیان بە هەواڵی ئاحاد، بەڵکو بەهۆی شك و گومان و وەهم و حەزێکەوە بووە لە جێگیرکردنیدا، بۆ نموونە ئەوەی سەرپێچیکەران بە بەڵگە دەیهێننەوە دەربارەی رەدکردنەوەی هەواڵی موغیيرە لەلایەن ئەبوبەکرەوە لەسەر میراتی داپیر، لە راستیدا ئەبوبەکر هەواڵەکەی موغیيرەی رەد نەکردەوە لەبەرئەوەی هەواڵی ئاحاد قبووڵ ناکات، بەڵکو وەستا تا کەسێکی تر بێت و پشتیوانی لێ بکات و بیروباوەڕ لەسەر ئەو تەشریعە لە ئیسلامدا زیاد بکات کە بریتییە لە پێدانی شەش یەك بە داپیر، لەبەرئەوەی تەشریعێك بوو قورئان بە دەق نەیهێنابوو بۆیە دەبوا بۆ کارکردن پێی زیادە وردەکاری بەکاربهێنرێت، کاتێك

[1] الإحكام للآمدي١/١٧٧.

محەمـەدی کـوڕی مەسـلەمە شـایەتی بـۆ دا ئـەوەی لـە پێغەمبـەر(ﷺ) بیسـتووە ئەبوبەکر(خوا لێی رازی بێت) دوودڵ نەبوو لە کارکردن بە هەواڵەکەی موغیرە، هـەر بەو جۆرە رەدکردنەوەی هەواڵەکەی ئەبو موسا لەلایـەن عومـەرەوە، ئەمانـە بوونـە وانەیەکی بەسوود بۆ هاوەڵان و ئەوانەی لەدوای ئەوان دێن تاکو وردەکاری بەکاربهێنن لە جێگیرکردن و وەرگرتنی فەرموودەی پێغەمبەردا(ﷺ).

بۆیە عومەر(خوا لێی رازی بێت) فەرمووی بە ئەبو موسا(خوا لێی رازی بێت): ((من تۆ تۆمەتبار ناکەم، بەڵام ئەمە فەرموودەی پێغەمبەری خودایە(ﷺ))).

هەمان شت بڵێ بۆ تەواوی نموونەکانی تر کە لەم بوارەدا ریوایەت کراون، چوونە پاڵی هاوەڵێك بۆ شاهیدی دان لەسەر هەواڵی هاوەڵەکەی تـر هەواڵەکـە لـە بـواری ئاحـاد دەرناکات، با دوان و سیانیشی بچێتە پاڵی.

## بەڵگەی حوجەتبوونی هەواڵی ئاحاد:

شافیعی(رەحمەتی خودای لێ بێت) لە **"الرسالة"**دا لەژێر ناونیشانی **"الحجة في تثبيت خبر الواحد"** دەڵێت: گەر یەکێك بڵێت: بەڵگە بهێنەوە بۆ جێگیرکردنی هەواڵی ئاحاد بە دەقێکی هەواڵ یان ئاماژە تیایدا یان ئیجماع، ئەوا دەڵێم:

١. پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((خودا رووی کەسێك سوور(سپی) بکات قسەکانی من دەبیستێ و لەبەریان دەکات و تێیان دەگات و دەیانگەیەنێت، لەوانەیە هەڵگری فیقهێك بۆخۆی فەقیە نەبێت، لەوانەیە هەڵگری فیقهێك بە کەسێکی بگەیەنێت لە خۆی فەقیەتر بێت، سێ شت دڵی موسڵمان تیایاندا بە هەڵەدا ناچێت: پاڵفتەکردنی زانست بۆ خودا، و ئامۆژگاری بۆ موسڵمانان و پەیوەستبوون بە دەستەی موسڵمانانەوە...))

کاتێـك پێغەمبـەر(ﷺ) بیسـتنی قسـەکانی و لەبـەرکردنیان و تێگەیشـتن لێیـان و گەیاندنیان بە باش دەبینێت بەڵگەی ئەوەیە فەرمان دەکات لە ئـەوەوە بگەیـەنرێت، کەوابوو حوجەجە لەسەر ئەو کەسە راست دەبێتەوە پێیگەیشتووە، چونکە ئەوەی پێی دەگات حەڵاڵێکە دەبێت ئەنجام بدرێت و حەرامێکە دەبێ خۆیانی لێ بەدوور بگـرن،

یــان حەددێکــە جێبــەجێ دەکرێــت و ماڵێکــە وەردەگیرێــت و دەدرێــت، یــاخود ئامۆژگارییەکە لە دین و دونیادا، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەسی نافەقیھ بۆی هەیە فیقھ هەڵبگرێت و بیگەیەنێت، ئەو کات ئەو دەبێت بە پارێزەری فیقهەکە نەك تیایدا فەقیھ بێت، فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) بە پابەندبوون بە دەستەی موســڵمانانەوە دەبێتە بەڵگەی ئەوەی ئیجماعی موسڵمانان-گەر خودا بیەوێت- پێویستە.

٢. پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((کەسێك لە جێگەکەی خۆیدا شان دانەدات و یەکێك لە فەرمانەکانی منی پێ بگات لەوانەی نەهیم لێکــردووە یــان فــەرمانم پێکــردووە و بڵێت: نایزانین! ئەوەی لە کتێبەکەی خودادا بینیمانەوە شوێنی دەکەوین)).

"ابن عیینة" دەڵێت: محەمەدی کوڕی مونکەدر هەمان فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە بــە مورسەلی بۆ باس کردووم، لەمەدا جێگیر کردنی هەواڵ لــە پێغەمبــەری خــوداوە(ﷺ) ساغ دەبێتــەوە و تێیاندەگەیــەنێت هــەواڵ بــۆ ئــەوان پێویســتە بــا دەقێکیشــیان لــە کتێبەکەی خودا بۆ نەدۆزییەوە.

٣. لە مالیکەوە لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە لە عەتای کوڕی یەسارەوە: پیاوێك بەڕۆژوو بوو ژنەکەی خۆی ماچ کرد، ئەوەی زۆر بەگران لەسەر خۆی تەماشا کرد، ژنەکەی نارد پرسیاری ئەوەی بۆ بکات، ئەویش چــوو بــۆ لای ئــوم ســەلەمە(دایکی بــاوەڕداران) و هەواڵەکەی پێدا، ئوم سەلەمە فەرمووی: پێغەمبەر(ﷺ) ماچی کردووە و بەڕۆژوو بووە، ژنەکە گەڕایەوە بۆ لای پیاوەکەی و هەواڵی پێدا، ئەوە شەڕی زۆرتری بۆ هێنا و وتی: ئێمە وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) نین، خودا ئەوەی بیەوێت بۆ پێغەمبەرەکەی حــەڵاڵی دەکات، ژنەکە گەڕایەوە بۆ لای ئوم سەلەمە بینینی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە لایەتی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەم ئافرەتە بۆچی هاتووە؟ ئوم سەلەمە هەواڵی پێدا، ئەویش فەرمووی: بۆچی هەواڵت پێ نەدا من ئەو کارەم کردووە؟ ئوم سەلەمە فەرمووی: هەواڵم پێدا و چوو بۆ لای هاوسەرەکەی و هەواڵەکەی پێدا، بەڵام ئەوە شەڕی بۆ زیاد کــرد و وتی: ئێمە وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) نین، خودا هەرچییەکی بوێت بۆ پێغەمبەرەکەی حەڵاڵ دەکات، پێغەمبەر(ﷺ) تووڕە بوو و پاشان فەرمووی: سوێند بە خودا، مــن لــە هەمووتان خۆپارێزترم و لە هەمووتان زاناترم بە سنوورەکانی خودا)).

شوێنی بەڵگەهێنانەوەکە لە فەرموودەکەدا ئەو جێگەیە پێغەمبەر(ﷺ) بە ئوم سەلەمە(خوا لێی رازی بێت) دەفەرموێت: ((بۆچی هەواڵت پێ نەدا من ئەو کارەم کردووە؟))

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەواڵی ئوم سەلەمە لە پێغەمبەری خوداوە وەرگرتنی شیاوە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێ ناکات لە ئەوەوە هەواڵەکە بگەیەنێت مەگەر هەواڵەکەی حوججە بێت بۆ ئەو کەسەی هەواڵی پێ دەدرێت، هەر بەو جۆرە ژنەکە هەواڵی بە مێردەکەی خۆی گەیاند.

٤. مالیك هەواڵی پێدابین لە عەبدولای کوڕی دینارەوە لە ئیبن عومەرەوە فەرمووی: خەڵکی بۆ نوێژی بەیانی لە قوبا بوون یەکێك هات بۆ لایان و وتی: پێغەمبەر(ﷺ) قورئانی بۆ سەر دابەزیوە، فەرمانی پێکراوە روو لە کەعبە بکەن ئەوانیش روویان لە کەعبە کرد، ئەوان روویان لە شام بوو بەرەو کەعبە روویان وەرگێڕا.

ئەهلی قوبا ئەهلی فیقه و ئەهلی پێشینەکانی ئیسلام بوون لە ئەنصار، ئەوان لەسەر قیبلەیەك بوون خودا فەرزی کرد بوو لەسەریان رووی لێ بکەن، کەچی بانگەشەی ئەوەیان نەکرد تەنها بە بینینی پێغەمبەر(ﷺ) حوجەیان لەسەر راست دەبێتەوە، هێشتا ئایەتەکانیان نەبیستبوو و سوننەتی پێغەمبەریشیان لە دەمی پێغەمبەر(ﷺ) نەبیست بوو و هەواڵەکەشیان لە خەڵکی بەگشتییەوە پێنەگەیشت بوو، بەڵکو تەنها بە هەواڵێکی ئاحاد -گەر لە لایان کەسەکە لە راستگۆیان بووبێت- فەرزێکیان واز لێ هێنا و بەپێی ئەو هەواڵە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) قیبلەی خۆیان گۆڕی.

٥. مالیك هەواڵی پێدابین لە ئیسحاقی کوڕی عەبدولاوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی رازی بێت) فەرمووی: ((شەرابێکی تری و خورمام دەرخواردی ئەبو تەلحە و ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراح و ئوبەی کوڕی کەعب دەدا، یەکێك هات بۆ لایان و وتی: شەراب حەرام کراوە، ئەبو تەلحە فەرمووی: هەستە ئەی ئەنەس ئەو گۆزە شەرابانە هەموو بشکێنە، منیش دەفرێکم لێ هەڵگرتن و بە ژێرەکەی لێمدان تا هەموویان شکان)) .

ئەوانە خاوەنی زانست و پلە و پایە بوون لای پێغەمبەر(ﷺ)، شەرابیش لەلایان حەڵاڵ بوو، یەکێك هات و هەواڵی حەرامبوونی شەرابی پێدان، یەکسەر ئەبو تەلحە بڕیاری شکاندنی گۆزەکانی دا، نەیانوت: ئێمە لەسەر حەڵاڵبوونی شەرابین تا نەگەین بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە حەرامی نازانین.

٦. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی بە ئونەیس کرد بچێت بۆ لای ئافرەتی پیاوێك باسی ئەوە دەکرا زینای کردووە، ((گەر دانی پیادا نا رەجم بکرێت)) ئافرەتەکە دانی پیادا نا.

٧. لە عەمری کوڕی سولەیمی زورقییەوە لە دایکییەوە فەرمووی: ئێمە لە "مینا" بووین، عەلی کوڕی ئەبی تالبمان بینی سواری حوشترێك بووبوو دەیفەرموو: ((ئەم رۆژانە بریتین لە خواردن و خواردنەوە، کەس تیایاندا بەڕۆژوو نەبێت، ئەو بە سواری حوشترەکەی شوێنی خەڵکی کەوتبوو و بەو هەواڵە بانگی بەسەریاندا دەکرد)) پێغەمبەر(ﷺ) کەسێکی راستگۆ بە نەهییەکەوە نانێرێت گەر نەهییەکەی بۆ ئەوان پابەند کردنی تێدا نەبێت.

٨. پێغەمبەر(ﷺ) دوازدە نێراوی خۆی بە نامەی خۆیەوە رەوانەی لای دوازدە مەلیك کرد.



# بەشی شەشەم

# سوننە لەگەڵ ڕۆژهەڵاتناسان

**خستنەڕوویەکی مێژووییانەوە بۆ مەرامی ڕۆژهەڵاتناسان:**

**کاتێک سوپای سەلیبییەکان هێرشیان کردە سەر وڵاتانی ئیسلام دوو پاڵنەر لە پشتییەوە بوو:**

**یەکەم:** پاڵنەری ئایین و دەمارگیری کوێرانە کە پیاوانی کەنیسە بۆ گەلانی ئەوروپا دروستیان کرد بوو و خراپترین درۆ و دەلەسەیان بە دەم موسڵمانانەوە هەڵبەست بوو، و مەسیحییەکانیان هاندەدا بۆ ڕزگارکردنی لانکە و زێدی مەسیح(فەلەستین)، بۆیە سوپا لەدوای سوپا ڕەوانەی سەر وڵاتانی ئیسلام دەکرا.

**دووەم:** پاڵنەرێکی سیاسی کۆلۆنیالیزمی، مەلیکەکانی ئەوروپا زۆریان بیست بوو دەربارەی وڵاتانی ئیسلام-بەتایبەت- شام لە ئارامی و خۆشگوزەرانی و شارستانی کە ئەوان لێی بێبەش بوون، هەروەها زۆریان بیست بوو دەربارەی سەروەت و سامان و کارگە و زەوی و زاری بەپیت و ڕازاوە، بۆیە بەناوی مەسیحەوە سوپایان جۆشدا، بەڵام لە ناخیاندا تەنها حەزی کۆلۆنیالیزمی بوونی هەبوو، دوای دووسەد ساڵ لە لەشکرکێشی و شکستخواردن بیریان لە ڕێگەیەکی تر کردەوە ئەوەش ئەوە بوو رووبکەنە لێکۆڵینەوە لە کاروبار و بیروباوەڕی موسڵمانان تاکو ڕێگەخۆشبکەن بۆ داگیرکردنی لەڕووی بیر و ڕۆشنبیرییەوە، لێرەوە ناوکی سەرەتایی بۆ کۆمەڵەی ڕۆژهەڵاتناسان دامەزرا و تاکو ئەمڕۆ کاردەکەن، ئەوان تا ئەم دواییانە لە پیاوانی مەسیحی یان یەهودی پێکهاتبوون و خراپترین ڕقیان بەرانبەر بە ئیسلام هەبوو، هەرچەند کۆمەڵێك زانای بە ویژدان کەوتنە ئەو ناوەندەوە و بەشێوەیەکی زانستیانە لێکۆڵینەوەی عەرەبی و ئیسلامیان کردووە، بەڵام زۆرینەیان کاریان شێواندنی ئیسلام بووە.

**خەسڵەتەکانی لێکۆڵینەوەی ئەوانە ئەم دەرکەوتانەی هەیە:**

١. گومانی خراپ و تێگەیشتن لە هەر شتێك پەیوەندی بە ئیسلام و ئامانجەکانی و مەرامەکانییەوە هەیە.

٢. گومانی خراپ بە پیاوانی موسڵمان و زانایان و مەزنانی ئیسلام.

٣. وێناکردنی کۆمەڵگەی ئیسلامی بەدرێژایی چاخەکان-بە تایبەت چاخی یەکەم- وەك کۆمەڵگەیەکی هەڵوەشاو کە خۆپەرستی مەزنەکان و پیاوەکانی دەکوژێت.

٤. وێناکردنی ژیاری ئیسلامی لەخوار واقیعەوە بە رادەیەکی زۆر، ئەمەش وەك سوکایەتی بەشانوشکۆی و سوك تەماشاکردنی بەرهەمەکانی.

٥. نەزانی بە سروشتی کۆمەڵگەی ئیسلامی وەکو خۆی، بڕیاردان لەسەری لە دیدی ئەوەی رۆژهەڵاتناسان دەیزانن دەربارەی ئەخلاق و نەریتی گەلانی خۆیان.

٦. هێنانەژێرباری دەق بۆ بیر کە بەپێی ئارەزووەکانیان دەیانسەپاند و بڕیاریان لێدەدا و قبووڵ و رەفزیان بۆ دەردەکرد.

٧. زۆر جار تەحریف کردنی دەقەکان بە تەحریفکردنێکی بەمەبەستگیراو، و خراپ بەکارهێنانی گوزارشت کاتێك رێگەی تەحریف کردنیان بۆ نییە.

٨. گواستنەوە لە هەندێ سەرچاوەوە کە خزمەت بە کارەکانی ئەوان دەکات، وەك گواستنەوە لە کتێبە ئەدەبییەکانەوە کە لە ئەمڕۆوە دادگایی مێژووی پێ دەکەن، هەروەها لە کتێبی مێژووییەوە دادگایی مێژووی فیقهیان دەکرد، ئەوەی **"الدميري"** لە کتێبی **"الحيوان"**دا باسی کردووە بەڕاستیان دەزانی و ئەوەی **"مالك"** لە کتێبی **"الموطأ"**دا هێناویەتی بە درۆیان دەزانی، ئەمەش وەك شوێنکەوتنی ئارەزوو و لادان لە حەق.

**پوختەی قسەکانی گوڵد تسیهر لەسەر سوننە و گومانەکانی تیایدا:**

خراپترین خۆرهەڵاتناس کە بە ناخێکی پیسەوە رووی لەم مەیدانە کردووە رۆژهەڵاتناسی یەهودی "گوڵد تسیهر"ە، لە هەموو رۆژهەڵاتناسی تر زیاتر پێداچوونەوەی بۆ سەرچاوە عەرەبییەکان کردووە و کتێبەکان و باسەکانی تاکو ئێستا زەمینەیەکی بە پیت و گرنگن

بۆ ڕۆژهەڵاتناسان لەم سەردەمەدا، مامۆستا أحمد ئەمین بە شێوەیەکی نافەرمی زۆربەی بۆچوونەکانی گواستووەتەوە لە **"فجر الإسلام"** و **"ضحى الإسلام"**دا، هەر بەو جۆرە چەندین نووسەری تر را و بۆچوونەکانیان گواستووەتەوە.

## پوختەی گومانەکانی:

١. بەشێکی زۆر لە فەرمووده سەحیح نییە، ئەوەی دەوترێت وەسیقەی ئیسلامە لە سەردەمی یەکەمیدا(سەردەمی منداڵی) لەڕاستیدا ئەسەرێکە لە ئاساری هەوڵ و کۆشانی موسڵمانان لە چاخی پێگەیشتندا(واتە ئەوان فەرموودەکانیان داناوە).

٢. دانانی فەرمووده بۆ سەرخستنی ئالوبەیت و دانانی فەرمووده لەلایەن ئەمەوییەکانەوە دژ بە عەلی و هاوەڵانی و لە بەرژەوەندی خۆیان و ڕەمزەکانیان.

٣. تۆمەتبارکردنی ئیمامی **"الزهري"** بە هەڵبەستنی فەرمووده بۆ ئەمەوییەکان لە عیبادەت و دروشمە ئاینییەکاندا.

## وەڵام:

گەر بە وردی بابەتەکانی ئەم کتێبەت سەرنج دابێت بۆت روون دەبێتەوە هاوەڵان و شوێنکەوتووان و شوێنکەوتەی شوێنکەوتووان و ئەوانەی دوای ئەوان چەندە سووربوون و لێبڕانیان هەبووە لە گواستنەوەی فەرموودەدا و پاککردنەوەی لە خەڵتەی لادان و زیادکردن و هەستانی زانای ئەهلی سوننە بە هەوڵی بێوچان لە شوێنکەوتوانی درۆزنان و فەرموودانەراندا و شەرمەزار کردنی نییەت و ناخیان و ڕۆشنکردنەوەی ئەوەی زیادیان کردووە لە بەناوفەرموودەی درۆ تا سوننە لە کتێبە سەحیحەکاندا کۆکرایەوە و بە لێکۆڵینەوە و پاڵفتەکردنی ڕەخنەگران تێرکرا.

**ئایا فەرمووده بەرهەمی پێشکەوتنی موسڵمانان بوو؟**

**گوڵد تسیهر دەڵێت: بەشێکی زۆری فەرمووده بەرهەمی گەشە و گۆڕانی ئایینی و سیاسی و کۆمەڵایەتی ئیسلام بووە لە سەدەی یەکەم و دووەمدا.**

ئێمە نازانین ناوبراو چۆن بوێری ئەم بانگەشەیە دەکات، لە کاتێکدا دەقە گوازراوە جێگیرەکان بەدرۆی دەخەنەوە، لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) هێشتا نەمردبوو بنچینەی کامڵ بۆ ئیسلامی مەزن دامەزرا، بەوەی خودا لە کتێبەکەیدا بۆ سەری دایبەزاند بوو و پێغەمبەر(ﷺ) رەنگرێژی بۆ کرد بوو بە کۆمەڵێك سونەن و شەرائیع و یاسای گشتگیر و تێر وتەواو، هەتا کەمێك پێش وەفاتکردنی فەرمووی: ((دوو ئەمرم لە نێوان ئێوەدا بەجێهێڵاوە گەر دەستیان پێوە بگرن گومڕا نابن کتێبەکەی خودا و سوننەتەکانم)).

هەروەها دەفەرموێت: ((لەسەر حەنەفییەتی پڕ لە لێبووردەیی ئێوەم بەجێهێڵاوە شەوەکەی وەك رۆژەکەی وایە))

ئەوەی ئاشکرایە ئەم ئایەتە لە کۆتا ئایەتەکانە بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ) دابەزیوە: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا﴾ **المائدة: ٣.**

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد ئیسلام تەواو و پێگەیشتوو بوو، نەك منداڵێك بێت وەك ئەو رۆژهەڵاتناسە دەیڵێت، راستە فوتوحاتی ئیسلامی یاسادارێژی موسڵمانی رووبەڕووی رووداوگەلێکی بەشەکی کردەوە کە هەندێکی لە قورئان و فەرموودەدا بە دەق قسەیان لەسەر نەکرا بوو، بۆیە هاتن و بۆچوونەکانی خۆیان تێدا بەگەڕخست بە پێوانە و هەڵهێنجان تا حوکمیان بۆ دانان، ئەوان لەو کارەیاندا لە بازنەی ئیسلام و رێنموونییەکانی دەرنەچووبوون، بۆ ئەوەی پێگەیشتنی ئیسلامت لە چاخی یەکەمدا بۆ ئاشکرا ببێت بەسە بزانیت عومەری کوڕی خەتاب(خوا لێی رازی بێت) چۆن زاڵ بوو بەسەر هەردوو مەملەکەتی کیسرا و قەیسەردا کە دوو شارستانی مەدەنی گەورە بوون، توانی کاروباری مەملەکەتەکانیان بەڕێوە ببات و گەلانی ئەو مەملەکەتانە بە کامڵترین و دادپەروەرترین شێوە ئیدارە بکات، باشە گەر ئیسلام منداڵێك بوایە چۆن دەیتوانی شان بداتە ژێر ئەو کۆڵە مەزنە؟

لێکۆڵەری بەویژدان دەزانێت لە هەر سەر زەویەك موسڵمانی پێگەیشتبێت یەك جۆر عیبادەتیان دەکرد و بە یەك جۆر حوکم مامەڵەیان دەکرد و خێزانەکانیان لەسەر یەك بنچینە پەروەردە دەکرد، بەم جۆرە ئەوان لە عیبادەت و مامەڵە و بیروباوەڕدا بەزۆری یەکگرتوو بوون، ئەوان نەیان دەتوانی بەو جۆرە بن گەر بەر لەوەی نیمچە دوورگەی

عەرەبی بەجێبهێڵن خاوەنی سیستمێکی تێروتەواوی پێگەیشتوو نەبووبن، گەر فەرموودە بەرهەمی پێشکەوتنی ئایینی بێت لە دوو سەدەی یەکەمدا ئەوا دەبوا عیبادەتی موسڵمانێك لە باکووری ئەفریقیا جیاواز بوایە لە عیبادەتی موسڵمانێك لە باشووری چین، چونکە ژینگەکەیان دوو ژینگەی جیاوازن، بەڵام چۆن ئەوان لە عیبادەت و تەشریع و ئادابدا یەکیانگرت لەگەڵ ئەوەی ئەو دوورییە زۆرە لە نێوانیاندا هەیە؟

گومانی تێدا نییە راستبوونەوەی مەزهەبەکان لەدوای سەدەی یەکەم و فرەییان ئەسەری قورئان و فەرموودە و ئەو قوتابخانانەن هاوەڵان لە تێگەیشتنی کیتاب و سوننەدا دایانمەزراندن، قورئان بە متەواتیری لە نێوانیان پارێزراو بوو، قسە و ئیجتیهادی ئیمامێك لە ئیمامی مەزهەبەکان -لە سەدەی دوو و سێدا- نابینیەوە فەرموودەیەك یان قسەی هاوەڵێك یان یەکێك لە شوێنکەوتووان پێشی نەکەوتبێت، ئەوەش بەر لەوەی ئایین گەشە و گۆڕان بەخۆیەوە ببینێت، ئەوەندە بەسە شوبهەکە لە بنچینەوە هەڵبوەشێتەوە.

### ١-هەڵوێستی ئەمەوییەکان لە ئایین:

رۆژهەڵاتناس گۆڵد تسیهر بیردۆزەکەی لەسەر رادەی ئەو جیاوازییە بیناکردووە لە نێوان ئەمەوییەکان و زانا و ئەتقیادا بوونی هەبووە، ئەیەوێت وامان بۆ وێنا بکات ئەمەوییەکان دەستەیەکی دونیایی بوون و گەورەترین خەم و پەژارەیان داگیرکاری وڵاتان بووە، هەروەها ئەوان لە ژیانی ئاساییاندا نەفام و نەزان بوون و پەیوەندییەکیان بە ئیسلام و ئادابی ئیسلامەوە نەبووە، ئەمە درۆیەکی شاخداری پێچەوانەیە بە واقیع و مێژوو، راستە دوژمنایەتی لە نێوان ئەمەوییەکان و خەواریج و عەلەوییەکاندا توند و بەهێز بوو، بەڵام ئەوانە بریتی نەبوون لە زانایان و ئەتقیا، زانایان و ئەتقیا ئەوانە بوون فەرموودەیان کۆکردەوە و تۆماریان کرد و پاڵفتەیان کرد، لەوانە: **"سعيد بن المسيب و أبي بكر بن عبدالرحمن بن الحارث و عبيدالله بن عبدالله بن عتبة و سالم مولى عبدالله بن عمر و نافع مولى ابن عمر و سليمان بن يسار و القاسم بن محمد بن أبي بكر و الإمام الزهري و عطاء و الشعبي و علقمة و الحسن البصري"** و هاوشێوەکانی

ئەمانــە لــە ئیمامــانی فــەرموودە، ئەمانــە لــە جەنگــدا رووبــەڕووی ئەمەوییــەکان نەبوونەتەوە، تەنها ئەوە نەبێت لە نێوان سەعیدی کوڕی موسەیب و عبدالملکی کــوڕی مەرواندا روودەدات، ئەوەش بە هۆی بەیعەت وەرگرتنەوە بۆ کوڕەکەی کە ناوی وەلیــد بوو، پاشــان بــۆ ســولەیمانی کــوڕی، ســەعیدی کــوڕی موســەیبیش ئــەوەی نــەکرد و فەرمووی: پێغەمبەر(ﷺ) نەهی لە دوو بەیعەت کردووە لە یەك کاتدا.

## ٢-ئایا زانایانی مەدینە فەرموودەهەڵبەست بوون؟

نامۆتر لەمە ئەوەیە لە دوو کتێبەکەیدا: (**دراسات إسلامیة**) و (**العقیدة والشریعة في الإسلام**)دا وامان بۆ وێنە دەکــات دوژمنایــەتی لــە نێــوان ئەمەوییــەکان و زانایــانی مەدینەدا هەبووە، بە قسەی ئەو زانایانی مەدینە ئەوانە بوون دەستیان بە هەڵبەستنی فەرموودە کرد بۆ ئەوەی رووبەڕووی ئەمەوییەکان ببنەوە، بەڵام درۆزن دەبێ زۆر شتی لەیاد بێت، باشە گەر زانایانی مەدینە ئەو کارەیان ئەنجام دا وەك بانگەشەی بۆ دەکات ئایا ئەوان بریتی بوون لە هەموو زانایانی ئیســلام لــەو چــاخەدا؟ ایــا لــە مەککــە و دیمەشق و کوفە و بەصرە و شارەکانی تری ئیسلام هاوەڵان و زانایان بوونیان نەبوو؟

**تەنها لە مەککەدا:**

"**عطاء و طاووس و مجاهد و عمرو بن دینار و ابن جریج و ابن عیینة**" هەبوون.

**لە بەصــرە** "**الحسن و ابن سیرین و مسلم بن یسار و أبو الشعثاء و أیوب السختیاني و مطرف بن عبدالله بن الشخیر**" هەبوون.

**لە کوفە** "**علقمة و الأسود و عمرو بن شــرحبیل و مســروق بــن الأجــدع و عبیــدة السلماني و سوید بن غفلة و عبیدالله بن عتبة بن مسعود و عمرو بن میمون و إبراهیم النخعي و عامر الشعبي و سعید بــن الجــبیر والقاســم بــن عبــدالرحمن بــن عبــدالله بــن مسعود**" هەبوون.

**لە شام** "**أبو إدریس الخولاني و قبیضة بن ذؤیب و ســایمان بــن حبیــب و خالــد بــن معدان و عبدالرحمن بن غنم الأشعري و عبدالرحمن بن الجبیر و مکحول**" هەبوون.

**له مصر "الليث بن سعد و عبيدالله بن أبي جعفر"** هەبوون.

**له یەمەنیش "مطرف"** و کەسانی تر بوونیان هەبوو.

ئایا ئەم زانایانەی چاخی ئەمەوی لەگەڵ زانایانی مەدینە لە هەڵبەستنی فەرموودەدا بەشدار بوون یان نە؟ چۆن ئەو ڕێکەوتنەیان کرد؟

ئەو کۆنگرەیە لە کوێ بەسترا هەموو ئەم زانایانەی لەخۆ گرت تاکو بڕیاری هەڵبەستنی فەرموودە بدەن، گەر بەشداری ئەو کارەی زانایانی مەدینەیان نەکرد ئەی چۆن لەو کارەیان بێدەنگ بوون و فەرموودەیان لێوە دەگوێزنەوە؟

ئێمە بە پێچەوانەوە زانایانی شارەکانی تر دەبینین دان بەوەدا دەنێن فەرموودەی زانایانی حیجاز دروستترین و بەهێزترین فەرموودەن، بەڵکو عبدالملك دان بە دروستی فەرموودەی زانایانی مەدینەدا دەنێت.

ئەم ڕۆژهەڵاتناسە لە دوژمنایەتی سەعیدی کوڕی موسەیب بۆ عبدالملك پاساوێك دروست دەکات بۆ تۆمەتبار کردنی زانایانی مەدینە بە فەرموودەهەڵبەستن، بەڵام ڕۆڵی سەعیدی کوڕی موسەیبمان لەو بزاڤەدا بۆ دیاری ناکات و ناوی ناهێنێت، بۆچی؟ ئایا سەعیدی کوڕی موسەیبیش بە دانانی فەرموودە تۆمەتبار دەکات وەك **"الزهري"** تۆمەتبار کرد، بەڵام وەك دەردەکەوێت بوێری ئەوەی نەبووە، چونکە هیچ جۆرە ریوایەتێکی هەڵبەستراو لەبەردەستیدا نەبووە پشتگیری بانگەشەکەی بکات وەك چۆن بەرانبەر **"الزهري"** ئەنجامیداوە

### ٣-ئایا زانایانی ئێمە درۆیان بە شیاو زانیوە بۆ بەرگری لە ئیسلام؟

پاشان ئەم ڕۆژهەڵاتناسە یەهودییە دەڵێت: ((بەسەرنجدان لەوەی لەسەر دەستیان(دەستی زانایان) ڕوویداوە وا دەردەکەوێ ئەوە بە فریان نەکەوتبێت بۆ دەستەبەرکردنی مەرامەکانیان، بۆیە لەلای خۆیانەوە دەستیان داوەتە داتاشینی فەرموودەگەلێك کە بە پەسەندیان بینیوە و لەگەڵ ڕۆحی ئیسلامدا پێچەوانە ناوەستنەوە، لە ویژدانی خۆیاندا وایان لێکداوەتەوە ئەو کارەیان بۆ دژایەتی توغیان و ئیلحاد و دوورکەوتنەوەیە لە سوننەنەکانی ئایین)).

گۆڵد تسیهر بەم جۆرە پاساو بۆ زانایانمان دەهێنێتــەوە بــۆ هەڵبەســتنی فــەرموودە، ئەمە قسەی کەسێکە شانوشکۆی ناگاتە شانوشکۆی زانایانمان لــە رادەی وردەکــاری و پشکنین و جێگیر کردن، هەندێ لە زانایانمان دەڵێن: ئەو کەسەی ئەو کارە دەکات کافر دەبێت و دەکوژرێت و تەوبەی لێ قبوولْ ناکرێت، ئــەم رۆژهەڵاتناســە پاســاوی خــۆی هەیە، چونکە کەسێك لەسەر درۆکردن راهاتبێت وا گومــان دەبــات هــەموو خــەڵکی درۆزنە، دز وا دەزانێت هەموو کەسێك وەك ئەو دزە، ئەگینا کەسێکی وەك ســەعیدی کوڕی موسەیب کە رووبەڕووی لێدان و سوکایەتی و ئازار بوویەوە تاکو لە یەك کاتــدا دوو بەیعەت نەدات چۆن بە خۆی رەوا دەبینێت درۆ بە دەم پێغەمبەرەوە(ﷺ) بکات؟!

## ٤-چۆن درۆکردن بە فەرموودە سەریهەڵدا؟

پاشان دەڵێت: ((لەبەر ئەوەی زانایان و ئەتقیا لە عەلەوییەکان دوژمنایەتیان لەگــەڵ ماڵی ئەمەویدا هەبوو لە سەرەتاوە داهێنانەکانیان ئاراســتەی بــۆ لای مــەدح کردنــی ئەهل و بەیت بوو، ئەمە هۆیەکی ناڕاستەوخۆ بوو بــۆ وەرگرتنــەوەی شــەرعییەت لــە ئەمەوییەکان و هێرشــکردنە ســەریان، بــەم جــۆرە فــەرموودە لــە ســەدەی یەکەمــدا سیرەیەکی بەرهەڵستکاری بێدەنگی هەبوو بە شێوەیەکی ئازاربــەخش دژ بــە ئەوانــەی سەرپێچیکاربوون بە سوننەنی فیقهی و یاسایی))

بەم جۆرە کارەکە وەرچەرخانی بە خۆوە بینی لــە دانــانی فــەرموودەوە وەك بــەرگری کردن لە ئایین بۆ دانانی فەرموودە بۆ هێرشکردنە سەر ئەمەوییەکان.. بەم جــۆرە ئــەم رۆژهەڵاتناسە رایدەگەیەنێت زانا ئەتقیاکانمان ئەوانە بوون فــەرموودەیان بــۆ مــەدحی ئەهلوبەیت هەڵبەست، خودا لە قورئاندا مەدحی هاوەڵانی کردووە، پێغەمبەریش(ﷺ) مەدحی عەلی کردووە وەك چۆن مەدحی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و تەلحە و زوبێر و عائشە و نموونەی ئەمانە لە هاوەڵانی مــەزنی کــردووە، بۆیــە گومــانی تێــدا نییــە بەشێك لە فەرموودە لە مەدحی هاوەڵاندا راست و دروستن، لەوانە فەرموودە دەربارەی ئالوبەیت، بەڵام شیعە هەندێکیان خستە سەری و دەستیان کرد بە دانــانی فــەرموودە دەربــارەی گــەورەیی و چــاکەی ئالوبــەیت وەك تۆڵەکردنــەوە لــە ئەمەوییــەکان و

شوێنکەوتوانیان، بۆیە ڕووبەڕووی زانایانی سوننە بوونەوە، چونکە زانایان ئەو بەناوفەرمووده دانراوانەیان ڕۆشن دەکردەوە، بۆیە ئەوانەی فەرموودەیان دەربارەی ئالوبەیت دادەنا زانایان و ئەتقیای شاری مەدینە نەبوون، بەڵکو زانایانی ئەتقیا ئەوانە بوون ڕووبەڕووی دانانی فەرمووده بوونەوە و بەرەنگاری ئەو بزاڤەیان کرد.

وەك ئیبن سیرین دەڵێت: پرسیاری ئیسنادیان نەدەکرد تا فیتنەکە ڕوویدا، کاتێك فیتنەکە ڕوویدا وتیان: ناوی پیاوەکانتان(ڕاوییەکان) بهێنن، بۆیە تەماشای ئەهلی سوننە دەکرا و فەرموودەکانیان لێ وەردەگیرا و تەماشای ئەهلی بیدعە دەکرا و فەرموودەکانیان لێ وەرنەدەگرتن.

## ٥-ئایا دەوڵەتی ئەمەوی دەستێوەردانی هەبوو بۆ دانانی فەرمووده؟

پاشان دەڵێت: ((کارەکە لەسەر ئەوانە(زانایان) کورتنەبوویەوە بەڵکو حکومەتیش بۆ خۆی بەرانبەر ئەوە بێدەنگ نەوەستا، کاتێك بویستبایە رایەك گشتگیر بکات یان ئەو زانانە بێدەنگ بکات ئەویش فەرموودەی دادەهێنا کە تەبابێت لەگەڵ دید و بۆچوونی خۆیان، ئەوەی نەیارەکانی دەیان کرد ئەویش ئەنجامی دەدا، بۆیە خۆی دایدەنا یان بانگی دەکرد بۆ دانانی))

ئەم بانگەشە نوێیە تەنها لە خەیاڵی نووسەرەکەیدا بوونی هەیە، مێژوو شتێکی لەو جۆرەمان دەربارەی دەوڵەتی ئەمەوی پێ ناڵێت، ئێمە دەپرسین ئەو فەرموودانە کامانەن کە حوکمی ئەمەوی هەڵیبەستووە؟

زانایانی ئێمە هەمیشە فەرمووده بە سەنەدەوە دەگوێزنەوە، ئەو سەنەدانە کامانەن بوون بە فەرموودەی سەحیح لە کتێبەکانی سوننەدا، ئێمە لە تەنها سەنەدی فەرموودەیەکدا عبدالملك یان یەزید یان وەلید یان یەکێك لە کاربەدەستەکانیان وەك حەجاج و خالیدی کوڕی عەبدوڵای قەسری نابینینەوە، باشە ئەو فەرموودانە کەوتنە کام گۆشەی مێژووەوە گەر بوونیان هەبوو؟ گەر حکومەتی ئەمەوی خۆی فەرموودەی دانەنا بەڵکو بانگی کرد بۆ دانانی فەرمووده چ بەڵگەیەك هەیە لەسەر ئەو بانگکردنەیان بۆ هەڵبەستنی فەرمووده؟

**٦-هۆیەکانی جیاوازی لە فەرموودەدا؟**

گۆڵد تسیهر دەڵێت: ((پرسێکی جیاوازی سیاسی یـا بیروبـاوەڕی نابینیتـەوە شـانی لەسەر کۆمەڵێك فەرموودەی بەهێز دانەدابێت)).

ئایا ئەمە ئەو بەڵگەیە حکومەتی ئەمــەوی بـانگی بـۆ هەڵبەسـتنی فـەرموودە کردووە؟ بۆچی دانانی ئەو فەرموودانە بۆ پرسی جیاوازی مەزهەبە جۆراوجۆرەکان نەگەڕێتەوە؟

بۆ دەبێ ئەو جۆرە فەرموودانە تەنها هۆی دانان(هەڵبەسـتن) لـە پشـتییانەوە بێـت، زانایان چەندین روویان بۆ جیاوازی و جۆراوجۆری فەرموودە باس کردووە.

لەوانە فرەیی رووداني فەرموودەکە کە هاوەڵەکە دوو جار ریوایەتی کـردووە لـە دوو رەوشی جیاوازدا، ئەمەیان بەپێی ئەو رەوشەی بینیویەتی ریوایەت دەکات و ئەوەشیان بەپێی ئەو رەوشەی تر، وەك "دەستنوێژگرتنەوە لە دەستدان لە ئەندامی زاوزێی خـۆ" لەگەڵ "ئەوە هیچی تر نییە جگە لە پارچەیەك لە تۆ".

هەیانە پێغەمبەر(ﷺ) لە دوو رووەوە ئەنجامیداوە وەك ئامـاژە بـۆ "گونجـاو(جواز)" بوونی، هاوەڵەکە لە حاڵەتی یەکەمدا ئەوە دەگێڕێتەوە و لە حاڵەتی دووەمـدا ئـەوەی تر دەگێڕێتەوە، وەك فەرموودەی نوێژی ویتر کە حەوت یان نۆ یان یازدە رکاتە.

هەیانە بۆ جیاوازی گێڕانەوەی حاڵەکە دەگەڕێتەوە لـە پێغەمبـەروە(ﷺ) بینیویانـە، وەك جیاوازیان لە حەجی پێغەمبەردا(ﷺ).

هەیانە بۆ جیاوازی تێگەیشـتنی هـاوەڵان دەگەڕێتـەوە لـە تێگەیشـتن لـە مـەرام و مەبەستی فەرموودەکـەی پێغەمبـەر(ﷺ)، ئـەم هاوەڵـەیان پێویسـتبوون تێـدەگات و ئەویتریان پەسەندبوون تێدەگات.

هەیانە هاوەڵەکە حوکمێکی نوێی بیستووە وەك نەسـخکەرەوەی ئـەوەی یەکـەم، بەڵام هاوەڵێکی تر نەیبیستووە و بەردەوام حوکمەکـەی یەکـەم کـە بیسـتوویەتی دەگێڕێتەوە.

## ٧-ئايا موعاويه دەچێتە ناو دەستەی دانەرانی فەرموودەوە؟

گوڵد تسیهر ئەوەی لەبیر نەچووە بەڵگەیەکی ترمان بۆ بهێنێت، لە موعاویەوە دەگێڕێتەوە بە موغییرەی کوڕی شوعبەی وتووە: ((ئەوە پشتگوێ نەخەی جنێو بە عەلی بدەی و داوای رەحمەت بۆ عوسمان بکەی و جنێو بە هاوەڵانی عەلی بدەی و خۆت لە قسە و باسیان بەدوور بگری(**تضطهد من أحاديثهم**)، بەرانبەر بەمە مەدحی عوسمان و خانەوادەی عوسمان بکەی و لە خۆتیان نزیکبکەیەوە و گوێیان بۆ بگریت)) پاشان گۆڵد تسیهر دەڵێت: ((لەسەر ئەم بنچینەیە بەناوفەرموودەی ئەمەوییەکان دژ بە عەلی سەریان هەڵدا)).

سەرنجی ئەم بەڵگەیە بدە! موعاویە بە یەکێك لە شوێنکەوتوانی یان یەکێك لە ئەمیرەکانی خۆی دەڵێت: خۆت لە قسە و باسی هاوەڵانی عەلی بەدوور بگرە و هاوەڵانی عوسمان لە خۆت نزیك بکەرەوە، چی لەم قسەیەدا بەڵگەیە لەسەر دانانی فەرموودە؟ ئایا ئەمە هەمیشە و لە هەموو حکومەتێکدا لە نێوان دەسەڵات و نەیارانیدا لە را و بۆچوون روونادات؟ ئەوە چ پەیوەندییەکی بە دانانی فەرموودەوە هەیە؟ لە کوێ موعاویە داوای لە موغییرە کرد فەرموودە دژ بە عەلی و لە بەرژەوەندی عوسمان دابنێ؟

ئەو قسەی موعاویە: ((**وأن تسب أصحاب علي وتضطهد من أحاديثهم**-جنێو بە هاوەڵانی عەلی بدەی و خۆت لە قسە و باسەکانیان بەدوور بگری))، دەقی گوزارشەکە **"الطبري"** بەم جۆرە هێناویەتی:

((**لا تحجم عن شتم علي وذريته...والعيب على أصحاب علي والإقصاء لهم**)) سەرنج بدە ئەم رۆژهەڵاتناسە چۆن گوزارەی **"الإقصاء لهم"**ی گۆڕیوە بە **"وتضطهد من أحاديثهم"**، ئەمەیە ئەمانەتی زانستی ئەم رۆژهەڵاتناسە.

## ٨-ئايا ئەمەوییەکان "الزهری"یان بۆ دانانی فەرموودە بەکارهێناوە؟

پاشان دەڵێ: ((ئەو ئەمەویانە بە فێڵبازی خۆیان نموونەی **"اللإمام الزهري"**یان بەکارهێناوە بۆ هەڵبەستنی فەرموودە..هتد))

## زانایانی جەرح و تەعدیل بەم جۆرە باسی "الزهری" دەکەن:

ئیبن سەعد لە "**الطبقات**"دا دەڵێت: "**الزهري**" پیاوێکی جێمتمانە بوو، زانستێکی زۆری هەبووە و فەرموودە و ریوایەتی زۆرە، کەسێکی فەقیهی بەرین بووە.

"**النسائي**" دەڵێت: باشترین سەنەدێك لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ریوایەت کرابێت چوارن: عەلی کوڕی حەسەن لە باوکییەوە لە باپیرییەوە، دووەم "**الزهري**" لە "عبیداللە"وە لە ئیبن عەباسەوە، هەر بەو جۆرە دوو رێگەی تر باس دەکات.

ئیمام ئەحمەد دەفەرموێت: "**الزهري**" فەرموودەکانی لە هەموو خەڵکی باشترە و سەنەدی فەرموودەکانی بەهێزترینە.

ئیبن ئەبی حاتەم دەڵێت: پرسیار لە "**أبو زرعة**" کرا چ سەنەدێك باشترینە؟ وتی: چوار، یەکەمیان: "**الزهري**" لە سالمەوە لە باوکییەوە.

ئیبن حیبان لە کتێبی "**الثقات**"دا دەڵێت: "**محمد بن مسلم بن شهاب الزهري القرشي**" کونیەکەی بریتییە لە ئەبوبەکر، دە لە هاوەڵانی بینیوە، دەرخکردنی لە هەموان زیاتر بووە و باشترین هێنانی هەبووە بۆ مەتنی فەرموودە، کەسێکی فەقیهی گەورە بووە و خەڵکی لە ئەوەوە ریوایەتیان کردووە.

"مسلم" لە پێشەکی سەحیحەکەیدا باسی کردووە و دەڵێت: بەڵام ئەوانەی روو لە "**الزهري**" دەکەن بە هۆی مەزنی و زۆری هاوەڵانی لەبەرکەری ورد بۆ فەرموودەکانی..(گوزارەی قسەکەی نەهێناوە)

"**الذهبي**" لە "**تذكرة الحفاظ**"دا دەڵێت: ئەو کەڵەپیاوی لەبەرکەران(**الحفاظ**)ی فەرموودەیە، ئیمامێکی لەبەرکەر(**الحافظ**)ی فەرموودەیە و حوجەیە.

ئیبن حەجەر لە "**تهذيب التهذيب**"دا دەڵێت: ئەو فەقیهێکی لەبەرکەرە و ناوی ئەبوبەکرە و مەدینەییە و یەکێکە لە ئیمامە مەزنەکانی حیجاز و شام.

هەروەها ئیبن حەجەر لە "التقريب"دا دەڵێت: فەقیهێکی لەبەرکەر کە لەسەر گەورەیی و شکۆمەندی و وردەکری ئەو کۆدەنگی هەیە.

### ئەوانە كێن لە ئەوەوە ریوایەتیان كردووە؟

بەناوبانگترینیان بریتین لە "**مالك و أبو حنيفة وعطاء بن أبي رباح وعمر بن عبدالعزيز وابن عيينة والليث بن سعد والأوزاعي وابن جريج**" هەروەها بوخاری و مسلم فەرموودەیان لێوە دەرهێناوە، هەر بەو جۆرە هەر چوار كتێبەكەی "السنن"، بە هەمان شێوە مالیك لە كتێبی "**المطأ**" و شافیعی و ئەحمەد لە مەسنەدەكەیاندا.

### ڕەدكردنەوەی ئەو شوبهە هاتووە لەسەر "الزهری"

ئەمەی باسكرا بریتییە لە شوێن و پێگەی ئیمامی "**الزهري**" لە زانستدا و را و بۆچوونی زانایانی موسڵمان لەسەری، هیچ كام لەو زانانە "**الزهري**"یان تۆمەتبار نەكردووە بەوەی دەدرێتە پاڵی و هیچ كەسێكیان كەمترین گومانیان نەبووە لەسەر ئەمانەت و متمانە و ئایینی، هیچ كەس لە دونیادا نەبووە "**الزهري**" تۆمەتبار بكات لە ئەمانەت و راستگۆیی ئەو لە فەرموودەدا جگە لەم رۆژهەڵاتناسە یەهودییە دەمارگیرە(گۆڵد تسیهر).

### پەیوەندی "الزهری" بە ئەمەوییەكانەوە

گۆڵد تسیهر پێیوایە پەیوەندی "**الزهري**" بە ئەمەوییەكانەوە وایكرد خەلیفە ئەمەوییەكان بەكاریبهێنن لە دانانی فەرموودەدا كە تەبابێت لەگەڵ ئارەزووەكانی ئەوان، ئێمە نازانین چۆن پەیوەندی "**الزهري**" كە كەسێكی دامەزراو و حوججە و متمانەدارە لەگەڵ خەلیفە ئەمەوییەكان دەبێتە نیشانەی هەڵبەستنی فەرموودە؟! هەر لە كۆنەوە زانایان پەیوەندییان بە خەلیفە و مەلیكەكانەوە هەبووە بەبێ ئەوەی ئەو پەیوەندییە شتێك لە ئەمانەتی ئەوان لەكەدار بكات.

لە "العقد الفريد"[1]دا هاتووە: "الزهری" رۆیشت بۆ لای وەلیدی كوڕی عەبدولمەلیك (خەلیفەی ئەمەوی)، وەلید پێی وت: ئەو فەرموودەیە چییە ئەهلی شام بۆ ئێمەی دەگێڕنەوە؟ وتی: ئەو فەرموودەیە كامەیە ئەمیری باوەڕداران؟ وتی: بۆمان باس دەكەن

---

[1] الجزء الأول ص٦٠.

گەر بەندەیەك رەعییەتەكانی خۆی بە باشی بەڕێوە برد خودا تەنها چاكەكانی بۆ دەنووسێت و خراپەكانی بۆ نانوسێت، "الزهری" وتی: پووچ و بێبنەمایە، ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئایا پێغەمبەرێكی خەلیفە بەرێزترە لە لای خودا، یان خەلیفەیەك پێغەمبەر نەبێت؟ وتی: پێغەمبەرێك خەلیفە بێت بەڕێزترە، "الزهری" وتی: خودا بە پێغەمبەر داود دەفەرموێت: ﴿ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٦﴾ ﴾ **ص: ٢٦**، ئەمە هەڕەشەیە بۆ پێغەمبەرێكی خەلیفە ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەی دەبێ هەڕەشە چۆن بێت بۆ خەلیفەیەك كە پێغەمبەر نەبێت؟! وەلید وتی: خەڵكی لە دینەكەمان فریومان دەدەن.

سەرنج بدە ئەو پەیوەندییە چەندە بە سوود و قازانج بەسەر ئومەتدا دەشكێتەوە، هەروەها سەرنج بدە ئایا هەڵوێستی **"الزهري"** هەڵوێستی زانایەكە دەكەوێتە ژێر كاریگەری بنەماڵەی مەلەكی و وەڵامی حەزەكانیان دەداتەوە لە دانانی فەرموودە بۆیان، یان هەڵوێستی زانایەكی ئامۆژگاریكەر كە بۆ ئایینی خودا و موسڵمانان ئامۆژگاری دەكات و بەرگری دەكات لە فەرموودەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە پووچەڵكردنەوەی درۆی دانەرانی بەناوفەرموودە؟

## چیرۆكی "الصخرة" و فەرموودەی ((لا تشد الرحال..))

ئەو رۆژهەڵاتناسە پێیوایە عبدالملك **"قبة الصخرة"**ی دروست كرد بۆ ئەوەی خەڵكی شام و عێراق لا بدات لە چوون بۆ حەجی كەعبە، ئەو ویستی پۆشاكێكی ئایینی بە بەر كارەكەیدا بكات، بۆیە هاوڕێكەی(**الزهري**) فەرموودەیەكی بۆ دانا، ئەویش:: ((لا تشد الرحال...الخ))

**یەكەم:** مێژوونووسان جیاوازیان لەوەدا نییە ئەو كەسەی **"قبة الصخرة"**ی بینا كردووە بریتییە لە وەلیدی كوڕی عبدالملك، **"ابن عساكر و الطبري وابن الأثير و ابن خلدون و ابن كثير"** و كەسانی تر ئەمە بۆچوونیانە، تەنها یەك ریوایەتیش لەوانەوە بوونی نییە دروستكردنەكەی بدرێتە پاڵ عبدالملك، جگە لەوەی لە كتێبی **"الحيوان"**ی

دومەیریدا هاتووە کە لە ئیبن خەلەکانەوە ریوایەتی کردووە، وتویەتی: ((عبدالملك ئەو کەسە بوو قوبەکەی دروست کرد، خەڵکی لە رۆژی عەرەفەدا لەلای دەوەستان))، سەرەڕای لاوازی ئەو دانەپاڵە، لەگەڵ ئەوەش هیچ بەڵگەیەکی تێدا نییە ئاماژە بکات بۆ ئەوەی ئەو بینای کردووە تاکو خەڵکی بۆ حەج لە جێگەی کەعبە رووی لێ بکەن، ئەوە عادەتێك بووە خەڵکی ساڵانە لە رۆژی عەرەفەدا پێیهەستاون و زانایان بە کارێکی ناپەسەندی دەزانن، جیاوازی زۆرە لە نێوان رووتێکردنی ئەو شوێنە بۆ حەج لەگەڵ وەستان لەو شوێنە لە رۆژی عەرەفەدا.

**دووەم:** دەقی رووداوەکە وەك گۆڵد تسیهر بۆمان دەگوێزێتەوە بەئاشکرا پووچ و بێبنەمایە، چونکە بینا کردنی شتێك بۆ ئەوەی خەڵکی حەجی لێ بکات کوفرێکی ئاشکرایە، ئیتر عبدالملك چۆن دەتوانێ کارێکی لەو جۆرە ئەنجام بدات؟ نەیارەکانی تانەی زۆریان لێداوە بەڵام هەرگیز تۆمەتباریان نەکردووە بە کوفر.

**سێیەم:** وەك دەردەکەوێت **"الزهري"** ساڵی پەنجا و یەك یان پەنجا و هەشت لەدایك بووە، شەهیدکردنی عبدالله بن الزبیر ساڵی حەفتا و سێیی کۆچی بووە، کەوابوو لەو کاتەدا تەمەنی بیست و دوو ساڵ بووە، بەپێی ریوایەتی دووەم تەمەنی پازدە ساڵ بووە، ئایا ئەقڵ دەیگرێ **"الزهري"** لەو تەمەندا ناوبانگی دەرکردبێت لە ناو ئومەتی ئیسلامدا بە جۆرێك بەناوفەرموودەیەکی لێ قبووڵ بکەن خەڵکی لە جێگەی کەعبە روو لە **"قبة الصخرة"** بکەن بۆ حەج؟!

**چوارەم:** دەقی بڕاوە هەیە پێمان دەڵێت لە کاتی کوشتنی ئیبن زوبەیردا **"الزهري"** خەلیفەی ئەمەوی عبدالملکی نەناسی بوو، بەڵکو چاوی پێینەکەوتبوو، **"الزهري"** بۆمان باس دەکات یەکەم جار لە ساڵی هەشتادا بووە بە وەفدێك سەردانی عبدالملکی کردووە

**پێنجەم:** فەرموودەی ((لا تشد الرحال..)) هەموو کتێبەکانی سوننەت ریوایەتیان کردووە و جگە لە رێگەی "الزهری" بە چەندین سەنەدی تر ریوایەت کراوە، بوخاری لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە(خوا لێی رازی بێت) کە ناچێتەوە سەر **"الزهري"** ئەو فەرموودەی هێناوە، هەر بەو جۆرە مسلم بە سێ رێگە یەکێك لە رێگەکان دەچێتەوە سەر **"الزهري"** ئەو فەرموودەی هێناوە..

**شەشەم:** ئەو فەرموودەیە کە "الزهري" لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە ریوایەتی کردووە، ئاشکرایە سەعیدی کوڕی موسەیب لە "الزهري" بێدەنگ نەدەبوو گەر بیزانیبایە فەرموودەیەکی بە دەم ئەوەوە بۆ رازیکردنی ئارەزووی ئەمەوییەکان داناوە، چونکە ئەو لەلایەن ئەمەوییەکانەوە ئازار درابوو، ئاشکرایە سەعیدی کوڕی موسەیب ساڵی (٩٣ك) کۆچی دوایی کردووە، دوای شەهیدبوونی ئیبن زوبەیر بە بیست ساڵ، دەپرسین: چۆن سەعید ئەو هەموو ماوەیە بێدەنگ بوو لەو فەرموودە؟

**حەوتەم:** گەر وا دابنێین "الزهري" ئەم فەرموودەی بۆ رازیکردنی عبدالملك داتاشی ئەی بۆ راشکاوانە باسی گەورەیی "قبە الصخرە"ی نەکرد لە کاتێکدا عبدالملك دەیەوێت خەڵکی بچن حەجی بکەن و روو لە کەعبە وەربچەرخێنن؟

**هەشتەم:** فەرموودەی ((لا تشد الرحال..)) کە زانایان بە سەحیحی دادەنێن پەیوەندی بەو فەرموودە هەڵبەستراوانەوە نییە لەسەر فەزڵ و گەورەیی "بيت المقدس" و سەخرەوە هاتوون، چونکە ئەوانە هەڵبەستراون و ئیمامی "الزهري" لە سەنەدەکانیاندا بوونی نییە، هەتا زانایان دەڵێن: هەرچی فەرموودەیە لەسەر "الصخرە" درۆیە، هەروەها دەڵێن تەنها سێ فەرموودە لەسەر گەورەیی بيت المقدس دروستە: یەکێك لەوانە فەرموودەی ((لا تشد الرحال..))ە.

## چیرۆکی ئیبراهیمی کوڕی وەلیدی ئەمەوی:

گۆڵد تسیهر وا بانگەشە دەکات ئیبراهیمی کوڕی وەلیدی ئەمەوی بە لاپەڕەیەکەوە هات بۆ لای "الزهري"، داوای لێکرد مۆڵەتی بدات ئەو فەرموودانە بە ناوی ئەوەوە(واتە لەوی بیستبێت) بڵاو بکاتەوە، "الزهري" بەبێ هیچ دوودڵییەك مۆڵەتی دا و پێی وت: کێ دەتوانێ تیایاندا مۆڵەت بدات بە تۆ؟ بەم جۆرە ئەو کابرا ئەمەوییە توانی ئەوەی لەو لاپەڕەدا بوو بەناوی "الزهري"ەوە بڵاوی بکاتەوە.

**لێرەدا چەندین هەڵە و تێکەوتن سەریهەڵداوە:**

**یەکەم:** ئیبن عەساکر رایگەیاندووە ئیبراهیم لە "الزهري"ەوە بیستوویەتی، ئیبراهیم لاپەڕەیەکی نیشانی "الزهري" داوە کە لە ئەوەوە بیستوویەتی، ئەمە بە زاراوەی ئەهلی

فەرمووده پێی دەوترێت: **"عرض المناولة**-واته ئەوەی بەدەستی هێناوه و لێی وەرگرتووه بۆی والاّ بکەیەوه و جارێکی تر بۆی بخەیە روو"، ئەیوب دەڵێت: ئێمه ئەو زانستەی وەرمان دەگرت بۆ**"الزهري"**مان دەوتەوه، "عبیدالله بن عمر" دەڵێت: نووسراوێك هێنا بۆ **"الزهري"** لێی وردبوویەوه، پاشان وتی: مۆڵەتت دەدەم لەسەری، هاوشێوەی ئەمانه زۆرینەی قوتابییەکانی **"الزهري"** ئەو فەرموودانەی وەریان دەگرت لە **"الزهري"** جارێکی تر بۆ دڵنیابوونەوه بۆیان والاّ دەکردەوه، بۆیه ئەوەی ئیبراهیمی کوڕی وەلید ئەنجامی داوه هەروەك کاری هاوەڵەکانی تری بووه -گەر ریوایەتەکه راست بێت-

**دووەم:** قسەکەی **"الزهري"**: کێ دەتوانێ مۆڵەتی ئەو فەرموودانەت پێ بدات؟ ئیبن عەساکر دەقەکەی بەم جۆره هێناوه: جگە لە من کێتر مۆڵەتت پێ دەدات؟ لەم قسەدا هیچ شتێك بوونی نییه، چونکه جگه له **"الزهري"** هیچ کەسێکی تر ناتوانێ مۆڵەت بە قوتابییەکانی بدات، ئەو زاناترین ئەهلی سەردەمی خۆی بووه و کەس ناتوانێت فەرموودەیەك بە ناوی ئەوەوە رابگەیەنێت گەر لە ئەوی نەبیستبێت، "مسلم" دانی بەوەدا ناوه نەوەد فەرموودەی ریوایەت کردووه لای هیچ کەسێکی تر بەردەست نەدەکەوتن و گەر ئەو نەبوایه ئەو کۆمەڵە فەرموودەیه تیاچووبوون.

**سێیەم:** ئەم ئیبراهیمه کتێبی سوننه هیچ شتێکیان لێوە باس نەکردووه و کتێبی "جەرح و تەعدیل"یش هیچیان دەربارەی ئەو کەسە نەوتووه، نە لە متمانەدارەکان نە لە لاوازەکان، ئەو فەرموودانه لە کوێن کە بە مۆڵەتی **"الزهري"** و بە ناوی ئەوەوە بەناو خەڵکیدا بڵاوەی پێکردن؟ ئەوانە جێگە و شوێنیان لەناو کتێبی سوننەدا لە کوێدایه؟ کێ لە ئیبراهیمەوە ریوایەتی کردووه؟ بۆ ئەو لاپەڕانە بزربوون و شوێنێکیان لە کتێبی مێژوودا بۆ نەمایەوه؟

## قسەکەی "الزهری": ناچاریان کردین لەسەر نووسینی فەرمووده:

گۆڵد تسیهر پێیوایه **"الزهري"** بۆ خۆی دانپیادانانێکی ترسناکی کردووه لەو قسەی کە مەعمەر لێیەوە دەگوێزێتەوە: ((ئەم دەسەڵاتدارانه(ئەم ئەمیرانه) ناچاریان کردین لەسەر نووسینەوەی فەرمووده)) لەمەوە تێدەگەین **"الزهري"** ئامادەیی هەبووه

حەزەکانی حکومەت پەردەپۆش بکات بە ناوی خۆیەوە کە لەلای ئومەتی ئیسلام دانپیادا نرابوو.

دەقی ئەمەی گۆلد تسیهر هێناویەتی لەلای ئیبن عەساکر و ئیبن سەعد بەم جۆریە: **"الزهري"** نەیدەویست فەرموودە بۆ خەڵکی بنووسێتەوە و خۆی لەو کارە دەبوارد، وا دەردەکەوێت بۆیە ئەو کارەی دەکرد خەڵکی شان لەسەر زاکیرەی خۆیان دابدەن و شان لەسەر کتێب دانەدەن، بەڵام کاتێك هیشام داوای لێکرد و پێداگری کرد لەسەری بۆ ئەوەی بۆ کوڕەکەی بنووسێتەوە و ئەویش چوارسەد فەرموودەی بۆ نووسییەوە و لەلای هیشام هاتە دەرەوە و بە دەنگی بەرز وتی: ((خەڵکینە، ئێمە کاتی خۆی ڕێگەم لێگرتن لە کارێك، بەڵام ئێستا ڕێگەمان بەمانە داوە، ئەم ئەمیرانە ناچاریان کردووین لەسەر نووسینەوەی فەرموودە وەرن با بۆ ئێوەشی باس بکەم، بۆیە چوارسەد فەرمووودەشی بۆ ئەوان باس کرد)) ئەمە دەقە مێژووییەکەی قسەکەی **"الزهري"**یە، **"الخطيب"** بە گوزارەیەکی تر گواستوویەتەوە کە بریتییە لە: ((ئێمە کاتی خۆی نووسینەوەی زانستمان بە پەسەند نەدەبینی تا ئەو ئەمیرانە ئێمەیان ناچار کرد لەسەری، بۆیە پێمان باش بوو ڕێگری نەکەین لە هیچ موسڵمانێك[1].

بزانە چ جیاوازییەکی گەورە هەیە لە نێوان لێکدانەوەی قسەکەی **"الزهري"**: ناچاریان کردین لەسەر نووسینەوەی فەرموودە، لەلای گۆلد تسیهر و لەلای مێژوونووسان!

## ڕۆیشتنی بۆ کۆشك و کار و جووڵەی لە پەراوێزی سوڵتاندا:

گۆلد تسیهر دەڵێت: ((**"الزهري"** لەو کەسانە نەبوو نەتوانی لەگەڵی ڕێکبکەوی، بەڵکو لەوانە بوو کارکردنی لەگەڵ حکومەت لا پەسەند بوو، بۆیە خۆی لە ڕۆیشتن بۆ کۆشك بەدوور نەدەگرت، بەڵکو زۆر بە دەوری سوڵتاندا هەڵدەهات))

پێشتر -بە نموونەیەك- باسی هەڵوێستی زانایانمان کرد لە مەجلیسی خەلیفەکاندا و دەرکەوت نەبوونەتە کۆیلەی حەز و دەسەڵاتیان، باسی پەیوەندی **"الزهري"**مان کرد بە خەلیفە ئەمەوییەکانەوە و روونبوویەوە پەیوەندی زانایەکی مەزنی فەخرکار بووە بە

[1] تقييد العلم.

ئایین و زانستەکەیەوە، پێشتریش هاوەڵان سەردانی موعاویەیان کردووە و بەدوایاندا شوێنکەوتوان و شوێنکەوتووی شوێنکەوتوان سەردانیان هەبووە، ئەبو حەنیفە سەردانی مەنصووری کردووە، ئەبو یوسف لە هەموو لە کەس زیاتر پەیوەست بووە بە هاروونە رەشیدەوە، لەگەڵ ئەوەش کەس تانەی لێنەداون و لە پلەی عەدالەت بەرنەبوونەتەوە.

## حەجکردنی لەگەڵ حەجاج:

ئەمە بانگەشەیەکی پووچە و **"الزهري"** لەگەڵ حەجاجدا نەبووە کاتێك رۆیشتووە بۆ حەج، بەڵکو**"الزهري"** لەگەڵ عەبدوڵای کوڕی عومەر بووە کاتێك حەجاج لەگەڵ خەڵکی کۆبوویەوە، ئەمەش دەقەکەیەتی لە کتێبی **"تهذیب التهذیب"**ی ئیبن حەجەردا هاتووە: ((عبدالرزاق لە **"الزهري"**ەوە تەخریجی کردووە و دەڵێت: عبدالملك بۆ حەجاجی نووسی لە حەجدا شوێنی ئیبن عومەر بکەوێت(ئەو چۆن حەجی کرد حەجاجیش وا حەج بکات)، بۆیە رۆژی عەرەفە حەجاج ناردی لەدوای.. عەبدوڵا و سالم رۆیشتن بۆ لای حەجاج و منیان لەگەڵ بووم، ئیبن شیهاب دەڵێت: من بەڕۆژوو بووم بەهۆی گەرماوە زۆر نارەحەت بووم)) بۆیە **"الزهري"** لەگەڵ عەبدوڵای کوڕی عومەر بووە کاتێك لەگەڵ حەجاج کۆبوونەوە لە حەجدا نەك لەگەڵ حەجاج بێت)).

## پەروەردەکردنی منداڵەکانی خەلیفەی ئەمەوی هیشام:

گۆڵد تسیهر وا بانگەشە دەکات ئەوەی دەبێتە تانە لەسەر**"الزهري"** ئەوەیە هیشام کردوویەتی بە پەروەردەکەری کوڕە جێنشینەکەی.

ئەمە لەپاڵ ئەوەدا کە هەڵەی مێژوویی تێدایە جێنشینی هیشام بریتی بوو لە برازاکەی خۆی(وەلیدی کوڕی یەزید)، ئەوەش وەك جێبەجێ کردنی وەسێتی براکەی یەزیدی کوڕی عبدالملك، ئەم وەلیدە کەسێکی کەمئابڕووی ئارەزووباز بوو، لەنێوان ئەو و **"الزهري"**دا دوژمنایەتی و پشتهەڵکردن هەبوو، بەڵکو **"الزهري"** پەروەردەکەری منداڵەکانی هیشام بوو کاتێك لە ساڵی سەد و شەشی کۆچی حەجی لەگەڵ کرد، لەگەڵ ئەو هەڵە مێژووییەدا ئێمە نازانین چ گومان و شکێك دەکەوێتە سەر **"الزهري"** گەر پەروەردەکەری منداڵی هیشام بێت؟ ئایا ئەمە باشتر نییە لەوەی خەلیفەکە بۆ

خۆی یان خەڵکانی بەرژەوەندییەرست و دوژمنانی خودا و پێغەمبەر(ﷺ) پـەروەردەیان بگرنە دەست؟ مێژوو پێمان دەڵێت منداڵەکانی هیشام چەندین غەزای سـەرکەوتوویان لە وڵاتی رۆم ئەنجام داوە و دەستی سپییان هەیـە لـە بڵاوەپێکردنـی ئیسـلام لـە زۆر شوێندا، ئایا ئەمە بۆ بەشێك لە پەروەردەی مامۆستاکەیان **"الزهري"** ناگەڕێتەوە؟.

## گرتنەدەستی قەزا:

دواجار گۆڵد تسیهر تانە لە **"الزهري"** دەدا بەوەی بۆ یەزیـدی دووەم کـاری قـەزای گرتووەتە دەست، ئەو گەر کەسێکی خۆپارێز بوایە چـۆن **"الشـعبي"** و صـاڵحانی تـر خۆیان لەو کارە بوارد ئەویش خۆی لادەدا.

### ئایا ئەم رەخنەیە رەوایە؟

وەرگرتنی قەزا هیچ کەس لە زانایان بـە برینـداربوونی کەسـەکە و تانـە لـە عەدالـەتی سەرژمێری نەکردووە، پێغەمبەر(ﷺ) قەزای داوەتە دەسـت عـەلی کـوڕی ئـەبی تالـب و مەعازی کوڕی جەبەل و مەعقـەلی کـوڕی یەسـار(خوایان لـیٚ رازی بێـت)، زۆرێـك لـە شوێنکەوتووان قەزایان بۆ بەنی ئومەیە بەڕێوە بـردووە، ئـەوە شـورەیح و ئـەبو ئیدریسـی خەوەلانی و عبدالرحمانی کوڕی ئەبی لەیلا، و قاسمی کوڕی عبدالرحمنی کـوڕی عەبـدوڵای کوڕی مەسعوود، کەسێك نەهاتووە ئەوانە بریندار بکات بە هۆی کارەکەیانەوە.

ئەو بانگەشەیەی گۆڵد تسـیهر گوایـە خۆپـارێزان خۆیـان لـە گرتنـە دەسـتی قـەزا بەدوورگرتووە بە هۆی ئەو فەرموودەوە: ((هەر کەس قەزا بگرێتە دەست یان بکرێت بە قازی ئەوا بەبیٚ چەقۆ سەربڕاوە))[1]، ئەم فەرموودەیە هانی قازی دەدات لە بڕیاردانـدا وردەکاری بەکاربهێنێت و عەدالەتی تێدا ئەنجام بدات.

شێخولئیسلام مورغینانی لە کتێبی **"الهدایـة"**دا دەڵێت: وەرگرتنی کار(لەناو ئەوانەشـدا قەزا) لە دەستی دەسەڵاتداری ستەمکار دروستە، چونکە هاوەڵان(خوایان لـیٚ رازی بێـت) لە موعاویە(خوا لێی رازی بێت) کاریان گرتووەتە دەست، حەقیش لەلای عەلی بوو..))[2].

---

[1] أخرجه أبو داود والترمذي وقال حسن غريب.

[2] فتح القدير ٥/٣٦٤.

**٩-گۆڕانی ژیانی ئایینی لە لایەن ئەمەوییەکانەوە:**

گۆڵد تسیهر دەڵێت: ((کارەکە بەوەوە نەوەستا فەرموودە بۆ ژیانی سیاسی یان بۆ بەرژەوەندی بنەماڵەی فەرمانڕەوای ئەمەوی دابنێن، بەڵکو سەریکێشا بۆ ژیانی ئایینی لە بوارەکانی عیبادەتدا کە لەگەڵ ئەوەدا پێکنەدەهاتەوە ئەهلی مەدینە لەسەری بوون، وەك ئەوەی زانراوە وتاری رۆژی جومعە دوو وتار بووە و خەلیفەکان بەپێوە وتارەکانیان دەخوێندەوە، وتاری جەژن بەدوای نوێژی جەژندا دەهات، ئەمەویەکان ئەمەیان گۆڕی، خەلیفە وتاری دووەمی رۆژی هەینی بە دانیشتنانەوە دەدا و وتاری جەژنیان خستە پێش نوێژی جەژنەوە و بەڵگەیان بەوە هێنایەوە رەجای کوڕی حەیات ریوایەتی کردووە گوایە پێغەمبەر(ﷺ) و خەلیفەکانی بە دانیشتنەوە وتاریان دەخوێندەوە، لە کاتێکدا جابر بن سەمرە دەڵێت: هەر کەس بۆتان باس دەکات پێغەمبەر(ﷺ) بە دانیشتنەوە وتاری داوە درۆ دەکات..))

دانیشتن لە وتاری دووەمدا ئێمە دان بەوەدا دەنێین گۆڕان بووە لە ژیانی ئایینیدا و لە موعاویەوە دەستی پێکرد، بەڵام ئەو کارەی بەئەنقەست نەبووە، بەڵکو بەهۆی ناچارییەوە بووە کاتێك بە هۆی بەز و گۆشتەوە جەستەی قورس بوو بۆیە نەیدەتوانی زۆر بەپێوە بوەستێت، لەگەڵ ئەوەش لەو رۆژگارەدا زانایان رووبەڕووی بوونەوە، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی زانایانی ئێمە لە حەقدا موجامەلەیان نەکردووە و ئەوەی بە ناڕەوایان زانیبێت رووبەڕووی بوونەتەوە."البیهقی" لە کەعبی کوڕی عوجرەوە تەخریجی کردووە، کەعب لە رۆژی هەینییدا رۆیشتووە بۆ مزگەوت و "عبدالرحمن بن الحکم"ی بینیوە بە دانیشتنەوە وتاری داوە، ئەویش وتوویەتی: تەماشای ئەم پیسە بکە بە دانیشتنەوە وتار دەخوێنێت، خودا(سبحانه وتعالی) دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا ﴾ الجمعة: ١١، لەگەڵ ئەوەش "عبدالرحمن بن الحکم" بەڵگەی بە فەرموودەکە نەهێنایەوە و کارەکەی خۆی بە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) باس نەکرد.

ئەو بانگەشەی گولّد تسیهر گوایە رەجای کوڕی حەیات فەرموودەی بۆ ریوایەت کردوون(بۆ داناون) بەوەی پێغەمبەر(ﷺ) و خەلیفەکانی بە دانیشتنەوە وتاری هەینییان خوێندووەتەوە، ئەمە درۆیەکە بە دەم "رەجا"وە و بوختانێکە بۆ ئیمامێکی متمانەدار لە ئیمامەکانی موسڵمانان، رەجا ناتوانێت ئەو قسەیە بکات لە سەردەمێکدا کە زۆرێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) لە ژیاندان و بەرگری لە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) دەکەن، لە هیچ سەرچاوەیەکی سوننەتی باوەڕپێکراودا ئەو فەرموودەیەمان نەبینییەوە کە دەدرێتە پاڵ رەجای کوڕی حەیات، لەوانەیە لە کتێبی **"ألف ليلة وليلة"**دا چاوی پێیکەوتبێت کە زۆرجار لە گواستنەوەدا شانی لەسەر داداوە، یان لە کتێبی **"حياة الحيوان"**ی دومەیریدا بینیبێتی، ئیمامی زەهەبی لەسەر رەجای کوڕی حەیات دەڵێت: ئیبن سەعد دەڵێت پیاوێکی گەورەی متمانەداری زانست زۆر بوو.

ئیبن عەون دەڵێت: نموونەی رەجام لە شامدا نەبینیوە، نموونەی ئیبن سیرینیم لە عێراقدا نەبینیوە، نموونەی قاسمیشم لە حیجازدا نەبینیوە.

قسەکەی جابری کوڕی سەمرەش: ((هەرکەس باسی ئەوەتان بۆ دەکات پێغەمبەر(ﷺ) بە دانیشتنەوە وتاری خوێندووە درۆ دەکات)) لە رەدی فەرموودەیەکی دانراودا نەهاتووە، بەڵکو ئەگەری ئەوەیە رەدی ئەوە بێت بە زەینی خەڵکیدا گوزەری کردبێت ئەو کارە کارێکی دروستە، ئەویش رێگەی لێ بڕوینەتەوە و رایگەیاندووە ئەو کارە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خودایە.

پێشخستنی وتاری جەژن لە نوێژی جەژن مەروان پاساو بەوە دەهێنێتەوە کە ناچاربووە، چونکە دوای ئەنجامدانی نوێژی جەژن خەڵکی گوێیان بۆ وتارەکانیان نەدەگرت، لە ئەوەوە باسی ئەوە نەکراوە شوێنکەوتوانی هاندابێت بۆ دانانی فەرموودەیەك لەسەر پێشخستنی وتار بەسەر نوێژی جەژندا، لەگەڵ ئەوەش هاوەڵان و شوێنکەوتوان کارەکەیان بەناڕەوا لەقەڵەمدا.

ئەو قسەش کە دەڵێت: کۆمەڵێك فەرموودە هەبوون لە سەردەمی ئەمەوییەکاندا و لە بەرژەوەندی ئەوان کاتێك عەباسییەکان هاتن بزربوون، ئێمە لێی دەپرسین: ئەو

فەرموودانە لە کـوێن و کامانــەن؟ چـۆن بزربــوون؟ چـۆن عـەباسـییەکان کاریـان بـۆ شاردنەوەیان کرد؟ ئایا ڕێگریان کـرد لــە زانایـانی فـەرموودە لــە مەسـانیدەکانیاندا بینووسن؟ لەوانەیە بەناوفەرموودە لە چاخێکەوە بۆ چاخێکی تر بـزر ببێـت، ئـەوەش بەهۆی دەرکـەوتنی درۆ و پووچـییەوە، ئەوانــە لــە مەیـدانی کتێبـە سـەحیحەکان و مەسانیدە باوەڕپێکراوەکاندا بزر دەبن.

## ١٠-درۆی صالّحان و شێواندنی ئەهلی فەرمووده:

پاشان ئەم ڕۆژهەڵاتناسە بەڵگە بۆ قسەکەی خـۆی دەهێنێتــەوە بــەوەی هەنـدێ لــە زانایانی پێ لەکەدار کردووە و دەڵێت: ((لەوانە: قسەکەی ئەبی عاصمی نەبیل: هـیچ صالّحێکم نەبینیوە لە شتێکدا درۆ بکات زۆرتر لە درۆکردنی لە فەرموودەدا، هــەمان قسە یەحیای کوڕی سەعیدی قەتان دەیکات، وەکیع دەربارەی زیادی کوڕی عەبدوڵای بوکائی دەڵێت: ئەو-لەگەڵ پلە و پایــەی لــە فــەرموودەدا-پیــاوێکی درۆزن بــوو(ئیبن حەجەر وتنی ئەو قسەیە لەسەری ڕەد دەکاتەوە).

یەزیدی کوڕی هاروون دەڵێت: ئەهلی فەرموودە لە کوفە لە سەردەمی ئەودا-جگە لە یەك دانەیان- هەموویان تەدلیسیان هەبووە، تەنانەت هــەردوو "سـوفیان"ەکە لــەناو ئەوانەدا ناویانهێنراوە))

"الشعراني" لە "العهود الكبرى"دا دەڵێـت: (گـوێم لــە مامۆسـتامان شێخولئیسـلام زەکەریا بوو(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەیوت: ئەو قسەی هەنـدێ لــە ئــەهلی فــەرموودە دەیلێن "درۆزنترین کەس صالّحەکانن" بــەهۆی زاڵبــوونی پاکوخـاوێنی ناخیانــەوە بــووە، گومانی باشیان بە خەڵکی دەبرد، ئەوان درۆیان بەدەم پێغەمبەری خـوداوە(ﷺ) نــەدەکرد، مەبەست بە "صالّحان" بریتی بوون لە "عابیدان" کە نەچـووبوونە نــاو قــوڵایی زانسـتی ڕەوانبێژییەوە و نەیان دەتوانی جیاکاری بکەن لە نێـوان قسـەی پێغەمبــەر(ﷺ) و قســەی کەسانی تر، بەپێچەوانەی عاریفانەوە ئەوان ئەو جیاکارییەیان لا شاراوە نەبوو)[١].

---

[١] قواعد التحديث للقاسمي ص١٤٧.

قسەکەی وەکیعیش لەسەر زیادی کوڕی عەبدوڵای بوکائی "لەگەڵ مەزنی و پلە و پایەی لە فەرموودەدا کەسێکی درۆزن بوو" ئەمە یەکێکە لە شێواندنەکانی ئەم رۆژهەڵاتناسە پیسە، بنچینەی گوزارەکە وەك لە "التأريخ الكبير"ی ئیمامی بوخاریدا هاتووە بەم جۆرەیە: (ئیبن عوقبەی سدوسی لە وەکیعەوە دەڵێت: ئەو(واتە زیادی کوڕی عەبدوڵا) مەزنتربووە لەوەی درۆ بکات)[1].

دەبینیت وەکیع نەرێی درۆ دەکات لە زیاد بەڵام ئەم رۆژهەڵاتناسە دەڵێت وەکیع دەڵێت ئەو درۆزن بووە.

**ئەوەش کە باسی "تەدلیس"ی ئەهلی کوفە دەکات:**

مانای تەدلیس لە زانستی فەرموودەدا ئەوە نییە مانا زمانەوانییەکە دەیگەیەنێت کە بە مانای غەش و تەزویر دێت و خاوەنەکەی دەبێت بە درۆزن و تەزویرچی.

**بەڵکو زاراوەیەکی تایبەتە بە ئەهلی فەرمووده و دوو بەشە:** با گوزارشتەکەی ئیبن صلاحی شارەزووری بگوێزینەوە: ((تەدلیس دوو بەشە:

**یەکەم: تەدلیسی ئیسناد:** ئەوەیە لە کەسێکەوە ریوایەتی فەرموودەیەك بکەی چاوت پێی نەکەوتبێت(هاوچەرخ نەبن)، وا ئەندێشە بکات پێیگەیشتووە و لە ئەوی بیستووە، یان ریوایەتێك لە کەسێکی هاوچەرخی خۆیەوە باس بکات، بەڵام چاویان بەیەکتر نەکەوتبێت و پێیوابێت یەکتریان بینیوە.

**دووەم: تەدلیسی مامۆستایان،** ئەوەیە لە مامۆستایەکەوە فەرموودەیەك بگێڕێتەوە کە لێی بیستووە بۆیە ناوی دەهێنێت و کونیەی باس دەکات و نەسەبی ئاماژە پێ دەدات یان وەسفی دەکات بە شتێك کە بەوە نەناسراوە بۆ ئەوەی نەناسرێتەوە، بەشی یەکەمیان زۆر ناپەسەندە و هەندێ لە زانایان بەخراپ باسیان لەبارەوە کردووە، -پاشان دەڵێت- دروست درێژەپێدانە لەسەر ئەم بابەتە، ئەوەش: ئەوەی کەسە مودەلیسەکە بە گوزارەیەکی تایبەت ریوایەتی کردووە و بیستن و پەیوەستبوونی رۆشن نەکردووەتەوە حوکمەکەی وەك حوکمی فەرموودەی مورسەل و جۆرەکانی وایە، ئەوەش بە

---

[1] اه من القسم الأول الجزء الثاني ص٣٢٠.

گوزارەیەکی ئاشکرا وەك لێم بیست یان بۆی باس کردین یان هەواڵی پێدایین و هاوشێوەکانیان باسی ریوایەتەکە دەکات ئەوە قبوولکراوە و بەڵگەی پێ دەهێنرێتەوە.. ئەمەش لەبەر ئەوەی تەدلیس درۆ نییە، بەڵکو جۆرێکە لە ناڕوونی بە گوزارەیەکی تایبەت-پاشان دەڵێت- بەڵام بەشی دووەم کارەکەی ئاسانترە)).

لێرەوە دەردەکەوێت هەردوو سوفیانەکە و ئەوانیتریش تەدلیسەکەیان بریندار یان ناکات و ریوایەتەکانیان لە کتێبەکانی فەرموودەی سەحیحدا قبوولکراون.

**زانایانی فەرمووده پاساویان بۆ دوو "سوفیان"ەکە هێناوەتەوە:** لەسەر سوفیانی کوڕی عویینە دەڵێن: تەدلیسی لەسەر متمانەدارەکان بوو، بۆیە تەدلیسەکەی قبوولکراوە، چونکە کاتێك دەوەستا هەڵیدەدایە سەر ئیبن جورەیج و مەعمەر و هاوشێوەکانیان، ئەمە ئەوەیە ئیبن حیبان پارسەنگی داوە، و دەڵێت: ئەمە شتێکە لە دونیادا بۆ هیچ کەسێك نییە جگە لە ئیبن عویینە[1].

**دەربارەی سوفیانی سەوریش: دەڵێن:** تەدلیسەکەی تەنها لە گۆڕینەوەی ناوی راوییەکە بوو بە کونیە یان پێچەوانەکەی، ئەمە بریتییە لە جوانکردن نەك تەدلیس، ئەم قسەیە **"البيهقي"** لە "المدخل"دا لە ئەبی عامیرەوە هێناویەتی.

**١١-داننان بە دروستی فەرموودەدا(شێوەیی)**

پاشان گوڵد تسیهر دەڵێت: ((موسڵمانان لە سەدەی دووەمدا هەستیان بەوە کرد داننان بە دروستی فەرموودەدا پێویستە تەنها بگەڕێتەوە بۆ شێوەیی، چونکە لەنێوان ئەو فەرموودانەی سەنەدەکانیان زۆر باش و بەهێزە زۆرێك لە فەرموودەی هەڵبەستراو بوونیان هەیە، ئەوەی یارمەتیدان لەم کارەدا ئەوە بوو لەم فەرموودەوە راگەیەنرا بوو: ((قسەکردن بە دەم منەوە زۆر دەبێت، هەر کەس فەرموودەیەکی بۆ باس کردن بەراوردی پێ بکەن لەگەڵ کتێبەکەی خودا، هەرچی لەگەڵ ئەو تەبا بوو ئەوە هی منە، وتبێتم یان نەموتبێت)) ئەمە ئەو بنەمایە بوو دوای کەمێك لە بڵاوبوونەوەی دانانی فەرموودە باس دەکرا))

---

[1] شرح ألفية العراقي ١/٨٤.

**لەم شوێنەدا ئەم رۆژهەڵاتناسە درۆی بەدەم زانایانی ئیسلامەوە لە دوو جێگەدا کردووە:**

**یەکەم:** ئەو بانگەشەی گوایە داننان بە دروستی فەرموودەدا تەنها شێوەیی بووە، و لە نێوان ئەو فەرموودانەی سەنەدەکانیان بەهێزە بەناوفەرموودەی هەڵبەستراو بوونیان هەیە، ئەمە درۆیەکی گەورەیە لەو رۆژهەڵاتناسەوە، زانایان هەرگیز قسەی لەو جۆرەیان نەکردووە، ئەوان چۆن دەڵێن زۆرێك لە فەرموودە هەیە سەنەدەکانیان بەهێزن بەڵام فەرموودەی هەڵبەستراون؟

ئەوەی زانایان فەرموویانە کاتێك پرسی کارکردن بە فەرموودەی ئاحاد هاتە بەرەوە: ئایا فەرموودەی ئاحاد یەقین دەبەخشێت یان گومان دەبەخشێت؟

هەندێکیان پێیانوایە یەقین دەبەخشێت و جمهووریش پێیوایە گومان دەبەخشێت، چونکە هەرچەند بەپێی مەرج و رێسای گشتی دروستە لەگەڵ ئەوەش ئەگەری ئەوەی تێدا دەمێنێتەوە لە واقیعدا دروست نەبێت، ئەمە لەلایان تەنها ئەگەرێکی ئەقڵی بووە و وەك زیاتر وردبوونەوە و پارێزگاری بۆ ئایینی خودا و جێگیرکردنی حوکمەکان دەستیان بۆ بردووە، ئەو قسەیە لە کوێیە ئەم رۆژهەڵاتناسە لە ئەوانەوە دەیگوێزێتەوە؟

**دووەم:** ئەو بنەمایەی-بەپێی بۆچوونی گۆڵد تسیهر- ئەهلی فەرموودە کاریان پێکردووە: ((قسەکردن بە دەم منەوە زۆر دەبێت...)) ئەمەش درۆیەکی رووتە، ئیمامان رەخنەیان لێگرتووە و بڕیاری ئەوەیان داوە بەناوفەرموودەیەکی هەڵبەستراوە.

**١٢-رەخنەی ئیبن عومەر لە ئەبو هورەیرە:**

ئەوەی گۆڵد تسیهر دەیڵێت بەوەی زانایان باسی ئەوەیان کردووە ئیبن عومەر رەخنەی لە ئەبو هورەیرە گرتووە لە فەرموودەکەی: (سەگی پاسەوانی کشتوکاڵ).

ئەو فەرموودەیە وەك پێشتر ئاماژەی پێکرا لە رێگەی ترەوە جگە لە رێگەی -ئیبن هورەیرە ریوایەت کراوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بوونی ئەو بەشەی فەرموودەکە(واتە "سەگی پاسەوانی کشتوکاڵ")

### ١٣-لاپەڕە نووسراوەکان:

ئەم رۆژهەڵاتناسە باسەکەی بەوە کۆتایی پێ دەهێنێت گوایە زانایان بۆ جێگیرکردنی ڕێسا فیقهییەکانیان تەنها بە ریوایەتی دەماودەمەوە نەوەستاون، بەڵکو لاپەڕەی نووسراویان داهێناوە و بانگەشەی ئەوەیان کردووە کە ویستی پێغەمبەر(ﷺ) رۆشن دەکاتەوە، مەبەستی بەوە "پێناسەی صەدەقە"یە، دەست بۆ ئەو ریوایەتانە دەبات کە بە دەق ئاماژە دەکەن بە بوونی چەندین لاپەڕە کە رێکخستنی دوورودرێژی صەدەقەی تێدایە، پاشان بۆ ئاسانی قبوولّ کردنی خەڵکی بۆ ئەم جۆرە لاپەڕانە نموونەی هێناوەتەوە بە "سوێندی نووسراو" ئەو دەمەی راگەیەنرا کێبەرکێ لە نێوان عەرەبی باکوور و عەرەبی باشوور هاتە ئاراوە کە چاخەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی "تبع معد یکرب"، خەڵکی باوەڕی بەوە کرد سەرەڕای درێرینییەکەی، ئیتر چۆن خەڵکی باوەڕ بە شتێك ناکەن لەوە نوێتر بێت؟!

گومانی تێدا نییە ئەمە هێرشێکی ترە بۆ سەر موسڵمانان و زانایانی کە هیچ پاڵپشتێکی لە مێژوودا بۆ نییە، ئەو لاپەڕە نووسراوانە کە لە سەدەی یەکەم و دووەمدا دەرکەوتن-وەك گۆڵد تسیهر بانگەشەی دەکات- زانایان وەریان نەگرتووە گەر لە دروستییەکەی نەکۆڵابنەوە، بەڵکو رەخنەیان لێگرتوون و بەراوردیان کردوون بە کۆمەڵێك رێسای ورد، بۆیە بڕیاری هەڵبەستراویان دا بەسەر لاپەڕەکانی ئیبن هەدبە و دینار و ئەبی دونیا ئەشج و کەسانی تر.

بەڵام ئەو نووسراوانەی کاروباری زەکات و رێژەی زەکات لە حوشتر و رەشەوڵاخ و مەڕ و ماڵاتدا دیاری دەکەن زانایان زۆرترین رەخنە و وردەکاریان بۆ بەکارهێناون، زانایان کۆدەنگیان هەیە لەسەر نووسراوەکەی ئەبوبەکر بۆ ئەنەس(خوایان لێ رازی بێت) و **"البخاري و النسائي و أبو داود والدار القطني والشافعي والحاكم والبيهقي"** تەخرجیان کردووە، لەسەر ئەوانی تر جیاوازیان هەیە لە نێوان سەحیح و حەسەن و مورسەلدا، هەشیانە پچڕاوە، قسەکە هەرچییەك بێت زانایان ئەو نووسراوانەیان بەبێ رەخنە و پاڵفتەکردن قبوولّ نەکردووە.

هێنانەوەی نموونەش بە ناکۆکی نێوان عەرەبی باکوور و عەرەبی باشوور و باوەڕبوون بە دەقێکی نووسراو لە چاخی **"تبع"** یەکێکی ترە لە کارە سەرسوڕهێنەرەکانی ئەم ڕۆژهەڵاتناسە، چونکە خەڵکی لە هەرچی شتدایە ئاسانکاریان دەنواند و لەوانەشە باوەڕیان بە هەموو شتێك کردبێت جگە لە شتێك پەیوەندی بە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) هەبێت و بدرێتە پاڵ ئەو، لەم شوێنەدا چاویان دەکردەوە و باس و لێکۆڵینەوە ڕاست دەبوویەوە، چونکە ئەمەیان ئایینە و بۆ هیچ کەسێك نییە ئایینی خودا بە ئەندێشە و گومان و ئارەزوو وەربگرێت، پاشان ئەوانەی ئەو دەقە نووسراوەیان دەربارەی ناکۆکی عەرەبی باکوور و باشوور قبووڵ کرد خۆ ئەوانە ئەهلی فەرموودە نەبوون، ئەوە چ پەیوەندییەکی بەم بابەتەوە هەیە؟!

لەڕاستیدا ئەم ڕۆژهەڵاتناسە لە مەیدانی زانستدا خاوەنی کەمترین ئابڕووە، ئەو وەك دەبینی درۆ دادەتاشێ و ئەندێشەی درۆینە دروست دەکات و پەیکەرێکی لێ ڕاست دەکاتەوە، پاشان لێرە و لەوێ شتێك وەردەگرێت و دەیکاتە بەڵگەی درۆکانی، ئەو ناچێت لەو سەرچاوانە وەربگرێت کە ئەهلی زانست لەسەریان کۆك و تەبان، بەڵکو کۆمەڵێك دەقی هەڵبەستراو لە کتێبی **"الحيوان"**ی دومەیری و **"ألف ليلة وليلة"** و **"العقد الفريد"** و **"الأغاني"** کتێبە ئەدەبییەکانی تر وەردەگرێت



# بەشی حەوتەم

## سوننە لای هەندێ لە نووسەرانی هاوچەرخ

لە دیارترین نووسەرانی هاوچەرخ کە ئەم ڕێگەی گرتووەتە بەر خودا لێــی خۆشــبێت ئەحمەد ئەمین بوو کە دەرچووی قەزای شەرعی و راگری کۆلێژی ئاداب بــوو، دانــەری کتێبی **"فجر الإسلام"** و "ضحى الإسلام" و "ظهر الإسلام"ە.

لە **"فجر الإسلام"**دا باسی فەرموودە دەکات، لەو جێگەدا ژەهری بە چەوری و حەقی بە باتڵ تێکەڵ کردووە، من لێرەدا پوختەی ئــەو شــێواندنانە بــاس لێــوە دەکــەم کــە پێموایە لادانە لە حەقیقەتی ئیسلام و راستە شەقامی دروست:

### پوختەی بەشەکە لە "فجر الإسلام"دا:

مامۆستا ئەحمەد ئــەمین لــە کتێبــە ناوبراوەکەیــدا بەشــێکی تایبــەت کــردووە بــە فەرموودە، هەوڵیداوە مێژووی فەرموودە و تۆمارکردنی بخاتــە روو، مانــای ســوننە و بەهای سوننەی لە شەرعدا رۆشن کردووەتەوە، پاشان باسی ئەوە دەکات فەرموودە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) تۆمار نــەکراوە، بــەڵکو هەنــدێ لــە هــاوەڵان بــۆ خۆیــان دەنووسییەوە، هاوەڵان(خوایان لێ رازی بێت) لەدوای مردنی پێغەمبەر(ﷺ) دوو دەستە بوون، **هەنــدێکیان** زۆر فــەرموودە گێڕانــەوەیان لــە پێغەمبــەرەوە (ﷺ) بــە پەســەند نەدەبینی و داوایان لە کەسەکە دەکرد بەڵگەیەك لەسەر ئەوەی ریوایەتی دەکات بخاتــە روو، **دەستەیەکی تر** لە هاوەڵان فەرموودەی زۆریان دەگێڕایەوە، بەهۆی تۆمارنەکردنی فەرموودە لە کتێبێکی تایبەتدا و شانداداان لەسەر یــادەوەری هەڵبەســتن و درۆ بــەدەم پێغەمبەرەوە(ﷺ) هاتە ئاراوە، وا دەردەکەوێ درۆکردن بە دەم پێغەمبەرەوە(ﷺ) بەر لە مردنی دەستی پێکردبێت.

ئاماژە بەوە دەکات هاتنە ناوەوەی گەلان بۆ ناو ئیسلام کاریگەری گەورەی هەبوو لە هەڵبەستنی فەرموودەدا کە بە ئەندازەیەك زیادی کرد ئیمامی بوخاری لــە شەشســەد

هەزار فەرموودە کە لە چاخی ئەودا باو بوو سەحیحەکەی خۆی دانا، پاشان گرنگترین ئەو هۆیانەی کە وایکردووە فەرموودە دابنرێت باس لێوە دەکات، باسی زیادەڕەوی خەڵکی دەکات لە پشتهەڵکردن لە زانست جگە لەوەی پەیوەندی بە کیتاب و سوننەتەوە هەبێت بە پەیوەندییەکی توندوتۆڵ.

دواتر باسی تێکۆشانی زانایان دەکات لە قەلاچۆکردنی فەرموودەی دانراو، باسی ئەوە دەکات دەیەکی ئەوەی کاریان بۆ سەنەد کردووە دەستیان بۆ رەخنەگرتن لە مەتنی فەرموودە نەبردووە.

پاشان قسەی لەسەر ئەو هاوەڵانە کردووە زۆرترین فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، لەوانە **ئەبو هورەیرە**، دەربارەی دەڵێت: ئەو خوێندەوار نەبوو، بەڵکو لەسەر یادەوەری خۆی فەرموودەی دەگێڕایەوە، ئەو فەرموودەی دەگێڕایەوە بەبێ ئەوەی راستەوخۆ لە دەمی پێغەمبەری خودای(ﷺ) بیستبێت، هەندێك لە هاوەڵان شکیان لە فەرموودەکانی بۆ دروست بوو و بەتوندی رەخنەیان لێگرت، پاشان ئەم بەشە بەو قۆناغانە کۆتایی پێ دەهێنێت کە تۆمارکردنی سوننە پیایاندا گوزەری کردووە تا سەردەمی بوخاری و مسلم و خاوەنانی شەش کتێبەکە))[1].

## ئایا لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) فەرموودە هەڵبەستن دەستی پێکرد بوو؟

خاوەنی **"فجر الإسلام"** دەڵێت: ئەم فەرموودە: ((هەر کەس بەئەنقەست درۆ بە دەم منەوە بکات با شوێنی خۆی لە ئاگردا خۆش بکات))

گومانی زاڵ(**الظن الغالب**) ئەوە دەگەیەنێت دەربارەی رووداوێکی درۆ فەرموویەتی کە بەدەم پێغەمبەرەوە(ﷺ) وترابێت، ئەوەی ئەو بە گومانی زاڵی دەزانێت هیچ پاڵپشتێکی لە مێژوودا نییە، و لە کتێبە باوەڕپێکراوەکاندا هۆیەك بۆ ئەو فەرموودە نەهاتووە.

مێژووش یەکلای کردووەتەوە لە ژیانی پێغەمبەردا(ﷺ) تۆمار نەکراوە کەسێك موسڵمان بووبێت قسەی پێغەمبەری(ﷺ) تەزویر کردبێت و ئەو فەرموودەیە لە پای

[1] انظر: فجر الإسلام ص٢٥٥-٢٧٤.

ئەوەدا هاتبێت، گەر ئەوە روویبدایە هاوەڵان بۆیان باس دەکردین بەهۆی خراپــی ئــەو رەفتــارەوە، ئــەوان تەنانــەت رۆیشــتن و شــێوەی جلوبــەرگی پێغەمبــەریان بــۆ ئێمــە گواستووەتەوە ئیتر چۆن رووداوێکی لەو جۆرەیان بۆ ئێمە نەدەگواستەوە؟!

کتێبە سەحیحەکانی فەرمووده لەسەر ئەوە تەبان پێغەمبەر(ﷺ) ئــەو فەرموودەیــەی فەرمووە بۆ گەیاندنی فەرموودەکانی بەوانەی دوای هاوەڵان، ئیمامی بوخاری تەخریجی کردووە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەگەر ئایەتێکیش بێت لــە منــەوە بیگەیەنــە، بەبێ حەرەج دەربارەی بەنی ئیسرائیل قسە بکەن، هەر کەس بەئەنقەســت درۆ بــە دەم منەوە بکات با شوێنی خۆی لە ئاگردا خۆشبکات)).

ئیمام ئەحمەد لە ئەبی موسای غافیقییەوە تەخریجی کردووە فەرمووی: دوایین شــتێك پێغەمبەر(ﷺ) بە ئێمەی راگەیاند فەرمووی: ((دەست بە کتێبەکــەی خــوداوە بگــرن، ئێوە دەچنەوە بۆ لای خەڵکانێك پێیان خۆشە فــەرموودەی مــن ببیســتن، هــەر کــەس شتێك بە دەم منەوە بڵێت کە نەموتبێت با شوێنی خۆی لە ئاگردا خۆشــبکات، هــەر کەس شتێکی لەبەربوو با بیگێڕێتەوە)).

ئاشکرایە ئەم دوو ریوایەتە و چەندین ریوایەتی تری هاوشێوەی ئەمانــە ئامــاژە بــۆ ئەوە دەکەن کەسانێك دوای مردنی پێغەمبەر(ﷺ) دێنە ناو ئیســلامەوە و دەیانــەوێت بەدوای فەرموودەکانیدا بگەڕێن، پێغەمبەر(ﷺ) رووی گوتاری لە هاوەڵانــە تــاکو بــە دروستی پەیامەکەی ئەو بەوانەی دوای خۆیان بگەیەنن.

**دوو ریوایەتی تر بۆ هۆی وتنی ئەو فەرموودە هاتوون جیاواز لەوەی ئاماژەمان پێکرد:**

**یەکەم:** ئەوەی **"الطحاوي"** تەخریجی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی بورەیدەوە لە باوکییەوە، فەرمووی: پیاوێك لە دەوروبەری مەدینەوە هات بۆ لامان و وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فــەرمانی پێکردووم بە رای خۆم حوکم بەسەر ئێوەدا بکەم بەو جۆرە و بــەو جــۆرە.. لــە ســەردەمی نەفامیدا ژنێکی لێ مارە کردبوون ئەوانیش نەیاندەویست ژنەکەی پێ بــدەن، رۆیشــت تــا گەیشتە لای ژنەکە، خەڵکەکە پیاوێکیان نارد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) بــۆ پرســیاکردن لــەو بارەیەوە، فەرمووی: ((ئەو دوژمنەی خودا درۆ دەکات، پاشان پیاوێکی نارد و فــەرمووی:

گەر بە زیندووی بینیت لە گەردنی بدە، پێموانییە بە زیندووی بیبینیت، گەر بە مــردووی بینیت بیسووتێنە، بینی گەزراوە و مردووە بۆیە سووتاندی، ئا لەو کاتەدا پێغەمبــەر(ﷺ) فەرمووی: ((هەر کەس درۆ بە دەم منەوە بکات...))[1].

**دووەم:** ئەوەیە کە **"الطبراني"** لە **"الأوسـط"** تەخریجی کردووە، لە عەبدوڵانی کـوڕی عەمری کوڕی عاسەوە(خوا لێی رازی بێـت)، پیاوێـك پۆشـاکێکی وەك پۆشـاکەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لەبــەرکرد، پاشــان هــات بـۆ لای خانەوادەیــەك لــە مەدینــە و وتــی: پێغەمبــەر(ﷺ) فــەرمانی پێکــردووم هــەر خانەوادەیــەك بمــەوێت تەماشــا بکــەم(بۆ هەڵبژاردنی هاوسەرێك)، ئەوانیش ژوورێکیان بۆ ئامادە کـرد و نێراوێکیــان رەوانــەی لای پێغەمبەر(ﷺ) کرد و هەواڵیان پێدا، ئەویش فەرمووی بە ئەبوبەکر و عومەر: بڕۆن بۆ لای گەر بە زیندووی بینیتان بیکوژن و پاشان بیسووتێنن، گەر بە مردووی بینیتان ئەوا لە کۆڵتان کەوتووە، وا دەبینم لە کۆڵتان بووبێتــەوە و لــەو بــارەدا بیســووتێنن، کاتێك هاتن بینییــان شــەو چــووەتە دەرەوە بــۆ میزکــردن و مارێــك گەزتوویــەتی و مردووە، بۆیە سووتاندیان و هاتنــەوە بــۆ لای پێغەمبــەر(ﷺ) و هەواڵەکــەیان پێــدا، ئەویش فەرمووی: ((هەر کەس بە ئەنقەست درۆم بە دەمەوە بکات...))

**قسە لەسەر ئەم دوو ریوایەتە لە چەند روویەکەوە:**

(**یەکەم**) مەتنی دوو ریوایەتەکە نیشانەی هەڵبەستنی بەئاشکرا پێوە دیــارە، لــە ژیــانی پێغەمبەر(ﷺ) نەمان بینیوە فەرمان بە سووتاندنی مردوو بکــات، کتێبــەکانی ســوننەتی باوەڕپێکراویش شتێکی لەو جۆرەیان بۆ نەگواستووینەتەوە با تەنها یەك جاریش بێت.

(**دووەم**) ســەنەدی دوو فەرموودەکــە لاوازە و کەســانێکی تێدایــە فــەرموودەیان لــێ وەرناگیرێت، بۆیە **"السخاوي"** ئەم چیرۆکە بە هەڵبەستراو دەزانێت.

(**سێیەم**) لە ئەگەری دروست بوونیــدا دوو ریوایەتەکــە ئاشــکران کــە پەیوەنــدی بــە بارێکی دونیایی تایبەت بە کەسێکی فریودەر و تەزویرکەرەوە هەیە، ئەمەش جیایە لە گێڕانەوەی فەرموودەی ئایینی گشتی کە بۆ موسڵمان دەگێڕرێتەوە گوایە فــەرموودەی

[1] مشكل الآثار ١/١٦٤.

پێغەمبەرەکەیانە، چۆن ڕووداوێکی دونیایی دەکرێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی هەڵبەستن بە دەم پێغەمبەرەوە(ﷺ) لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) دەستی پێکردووە؟

(**چوارەم**) لەم دوو ریوایەتەوە دەردەکەوێت ئەو کەسەی ئەو کارەی کردووە کەسێکی نەناسراو بووە و هاتووە بۆ لای خەڵکانێك لە دەرەوەی مەدینـە، گومـانی زاڵ ئەوەیـە ئەو کەسە بە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) نەگەیشتبێت، یان لەوانەیە موسڵمان بووبێـت و لە هاوەڵان نەبووبێت، بۆیە ناکرێتە بەڵگە بۆ گومانخستنە سەر هاوەڵان.

بەمەدا دەزانین هۆی فەرموودەکە کە کتێبی سوننەی باوەڕپێکراو باسی دەکـەن یـان لەو دوو ریوایەتەدا کە ئەهلی فەرموودە رەخنەیان لێیان هەیـە بەڵگەیـە نابینرێتـەوە بکرێتە بەڵگەی هەڵبەستنی فەرموودە لـە سـەردەمی پێغەمبـەردا(ﷺ) یـان بکرێتـە بەڵگە بۆ تانەدان لە هاوەڵان.

## فەرموودەکانی تەفسیر:

لە لاپەڕەی ٥٢٩دا دەڵێت: ((ئەوەندە بەڵگە بەسە فـەرموودەکانی تەفسـیر کـە لـە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەوە دەگێڕنـەوە فەرموویـەتی لەسـەریان: لـە لای مـن هیچـی سەحیح نییە، هەزاران فەرموودەی لەوانە کـۆکردەوە، هـەر بـەو جـۆرە بوخـاری کـە کتێبەکەی حەوت هەزار فەرموودەیە سێ هەزاری دووبارەیـە، دەڵـێن: ئـەو بـڕەی لـە نزیکەی شەشسەد هەزار فەرموودە هەڵبژاردووە کە لە سەردەمی خۆیدا باوبوون)).

زۆری دانان لە فەرموودەدا کەس نـەرێی ناکـات، بـۆ ئـەوەش بـە دوو شـت بەڵگـە دەهێنێتەوە: فەرموودەکانی تەفسیر و فەرموودەکانی بوخاری.

**فەرموودەکانی تەفسیر:** هەر کەس تەماشای کتێبـەکانی سـوننەت بکـات دەبینێـت بەشێکی زۆر لەو فەرموودانە سەحیحن و تەمومژیان لەسەر نییە.

**ئیمامی تەبەری دەڵێت:** لەو قورئانەی بۆ سەر پێغەمبەرەکەی(ﷺ) دابەزاندووە تەئویل کردنەکەی بە رۆشنکردنەوەی پێغەمبەرە(ﷺ).

**ئەبو حەیانی ئەندەلوسی دەربارەی ئەوەی موفەسـیر پێویسـتییەتی دەڵێـت:** رووی چوارەم: دیاریکردنی نادیار و شاراوە و رۆشنکردنەوەی پوختە و هـۆی دابـەزین و

نەسخ کردنەوە، هەموو ئەمانەش لە گواستنەوەیەکی سەحیحەوە لـە پێغەمبـەری خوداوە(ﷺ) دێنە دی.

**لە کتێبی "الإتقان"ی"السیوطي"دا ئیبن تەیمیە دەڵێت:** پێویستە بزانرێت پێغەمبەر(ﷺ) مانای قورئانی بۆ هاوەڵانی ڕۆشن کردووەتەوە، وەك چۆن وشە و گوزارەکانی بۆ لێکداونەتەوە، ئایەتی: ﴿**لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ**﴾ **النحل: ٤٤** هەردوو بەشەکە دەگرێتەوە.

**زەرکەشی قورئانی بۆ دوو بەش دابەش کردووە:**

**بەشێکیان** تەفسیرەکەی لـە گواستنەوە(فەرموودە)دا هـاتووە، ئـەوەش یـان لـە پێغەمبەرەوە(ﷺ) یان لە هاوەڵانەوە یان لە شوێنکەوتوانەوە، **بەشێکیش** تەفسیرەکەی لە گواستنەوەدا نەهاتووە.

تۆ دەبینیت تەفسیریان گەڕاندەوە بۆ گوازراوە(هەواڵ و فەرموودە) لەگەڵ نـەگوازراوە و پێویستیان کرد لەسەر موفەسیر بگەڕێتەوە بۆ یەکەمیان و بیزانێت، گـەر بەشـێکی زۆری ئەو گوازراوانە ڕاست نەبوایە نەدەگەڕانەوە بۆ لای، بـەڵکو هەنـدێ لـە زانایـان پێیانوایە تەفسیر تەنها بە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) دروستە.

ئەوەی لە ئیمام ئەحمەدەوە گوازراوەتەوە لە فەرموودەکانی تەفسیر کە فەرموویـەتی: ((سێ شت ئەسڵیان نییە: تەفسیر و مەلحەمەکان و غەزاکان)).

**قسەکردن لەسەر ئەم قسەیە لە چەند ڕوویەکەوە:**

**یەکـەم:** ئیمـام ئەحمـەد لـە مەسـنەدەکەیدا فـەرموودەی زۆری لەسـەر تەفسـیر گواستووەتەوە، ئیتر چۆن ئەقڵ دەیگرێت ئەو فەرموودانەی لە مەسـنەدەکەیدا جـێگیر کردبێت و پاشان بڕیار بدات ئەو فەرموودانە هیچیان دروست نین.

**دووەم:** نەرێکردنی دروستی ئەو گوازراوانە هەڵبەستن یان لاوازی لـەخۆ دەگـرن، لـە تەئویلی ئەوەدا دەڵێن: ئەمـە زاراوەی تایبەتـە بـە ئەو(ئەحمـەد)، لەکنـەوی دەڵێـت: زۆرجار دەڵێن: "دروست نییە" یـان "جـێگیر نـەکراوە" کەسـێك زانسـتی نـەبێت وا گومان دەبات ئەو ڕیوایەتە هەڵبەستراوە یا لاوازە، ئەوەش لەسەر نەزانییان بیناکراوە.

**سێیەم:** ئیمام ئەحمەد نافەرموێت: لە تەفسیردا هیچ شتێك راست نییە، بەڵكو دەڵێت: سیان ئەسڵیان نییە، ئەوەی ئاشكرایە ئەوەیە قسەكە نەریّ كردنی بوونی كتێبێكی سەحیح لەو بارەیەوە دەگەیەنێت، ئەمەش ئەو مانایە خەتیبی بەغدادی بۆی دەچێت، و دەڵێت: ئەمە هەڵدەدرێتە سەر كتێبی تایبەت بۆ ئەو سیّ زانستە.

**چوارەم:** ئەگەری ئەوە هەیە قسەكەی ئیمام ئەحمەد ئەوە بێت هەر شتێك لە تەفسیردا گوازراوەتەوە و دروستە بەراورد بەوەی نادروستە زۆر كەمە، لە **"الإتقان"دا** هاتووە: ئیبن تەیمیە دەڵێت: ئەو بەشەی كە دەتوانریّ سەحیحی لێوە بناسرێتەوە زۆرن حەمد و سەنا بۆ خودا، هەرچەند ئیمام ئەحمەد دەڵێت: سیان ئەسڵیان نییە..هتد، چونكە زاڵ لەو ریوایەتانەدا بریتییە لە فەرموودەی مورسەل.

## ئایا بوخاری هەموو سەحیحەكانی لە "جامع"ەكەیدا كۆكردووەتەوە؟

مامۆستا ئەحمەد ئەمین پێیوایە بوخاری فەرموودە سەحیحەكانی لە شەشسەد هەزار فەرموودە هەڵبژاردووە، لێرەدا قسە لەسەر دوو بابەتە:

**یەكەم:** ژمارەی ئەو فەرموودانەی لەبەردەست بوون لە چاخی بوخاریدا، گومانی تێدا نییە ژمارەی ئەو فەرموودانە لەو چاخەدا زۆربوون تا گەیشتوونەتە شەشسەد هەزار یان زیاتر، لە ئیمام ئەحمەدەوە گوازراوەتەوە فەرموویەتی: فەرموودەی سەحیح تا حەوتسەد هەزار دەڕۆن، ئەم گەنجە(أبو زرعة) حەوتسەد هەزاری لەبەر كردووە.

**دووەم:** ئەو قسەیەی نووسەر كە دەڵێت ئەوەی بوخاری لە فەرموودەكانی كۆیكردوونەتەوە بەبیّ دووبارەبوونەوە تەنها چوار هەزاری سەحیح بووە لە شەشسەد هەزار فەرموودە كە لە چاخی ئەودا لەبەردەستدا بوون، ئەمە ئەو بانگەشەیە نووسەر رایدەگەیەنێت و لەلای زانایان زانراو نییە، بەڵكو زانراو لەلایان ئەوەیە ئیمامی بوخاری لە كتێبەكەیدا هەموو سەحیحەكانی كۆنەكردووەتەوە.

**ئیبن صەلاح لە "مقدمە"كەیدا دەڵێت:** بوخاری و مسلم لە سەحیحەكەیاندا هەموو سەحیحەكانیان كۆنەكردووەتەوە و خۆیشیان بەوە پابەند نەكردووە، لە بوخارییەوە ریوایەتمان كردووە وتوویەتی: تەنها سەحیحم لە "جامع"ەكەمدا داناوە و زۆرێك لە

سەحیحی ترم بەهۆی مەلەلی زۆرەوە بۆ ساغکردنەوەی تێدا دانـەناوە، هـەروەها لـە "مسـلم"ەوە ریوایـەتمان کـردووە هـەموو سـەحیحێکم لێرەدا (مەبەسـتی کتێبـە سەحیحەکەیەتی) کۆنەکردووەتەوە.

## ئایا عەبدوڵای کوڕی موبارەك بێئاگا بووە؟

نووسەر لە لاپەڕەی ٢٦٠دا قسـە لـە ئەوانـە دەکـات فـەرموودەیان هەڵبەسـتووە و دەڵێت: ((هەندێکیان نییەتیان باش بوو و هەموو ئەوەی پێیان دەگەیشت وەك سەحیح کۆیاندەکردەوە، ئەوان لە خودی خۆیاندا راستگۆ بوون و هـەموو ئـەوەی دەیانبیسـت وەك فەرموودە دەیانگێڕایەوە، خەڵکیش بە هۆی راستگۆیی ئەوانەوە فریویان دەخوارد و لێیان وەردەگرت، وەك ئەوەی دەربارەی عەبدڵای کـوڕی موبـارەك وتـراوە، وتـراوە: پیاوێکی جێمتمانەی زمان راست بوو، بەڵام لە هەموو کەس فەرموودەی وەردەگرت)) لە پەراوێزی کتێبەکەیدا ئامـاژەی بـەوە داوە ئـەم قسـەیە لەسـەر عەبـدوڵای کـوڕی موبارەك لە سەحیحی "مسلم"دا هاتووە.

دانانی عەبدوڵای کوڕی موبارەك لە ریزی دانەرانی فەرموودە هەڵەیەکی رۆشنە و لە نەبوونی وردەکارییەوە لە دەربڕین و گـوزارە بەرهـەم هـاتووە، چـونکە قسـەکردن لـە عەبدوڵای کوڕی موبارەك لەو میانەدا وەهمی ئەوە دروست دەکات یـەکێك بێـت لـە دانەرانی فەرموودە، ئەمە رەخنەی رووالەتی لە قسـەکەی، بـەڵام رەخنـەی بابەتیانـە پوختەی ئەوەی باسی کردووە لە سێ خاڵدا کۆدەکەینەوە:

**یەکەم:** عەبدوڵای کوڕی موبارەك نییەتی سەلامەت بووە و هەموو ئەوەی دەیبیسـت دەیگێڕایەوە بەبێ رەخنەگرتن لە پیاوان.

**دووەم:** خەڵکی بە راستگۆییەکەی فریویان خواردووە بۆیە هەموو ئـەو فەرموودانـەی لە ئەوەوە دەیانبیست بە سەحیحیان دادەنا.

**سێیەم:** ئەو گوزارەیەی لە سەحیحی "مسلم"ەوە گواسـتوویەتەوە لەسـەر عەبـدوڵای کوڕی موبارەك بووە.

**مامۆستای دانەر لەم سێ خاڵەدا بەتەواوی بەهەڵەدا چووە:**

١. ئەوەی عەبدوڵای کوڕی موبارەك نییەتی سەلیم بووبێت و هەموو ئەوەی بیستوویەتی گێڕاویەتەوە ئەمە لە حەق و راستییەوە دوورە، ئیبن موبارەك لە بەناوبانگەکانی ئیمامانی چاخی خۆی بووە و زۆر بەتوندی گرنگی بە رەخنەگرتن لە پیاوان داوە.

ئەوە "مسلم" لە پێشەکی سەحیحەکەیدا چەند نموویەکمان بۆ دەگێڕێتەوە تیایدا عەبدوڵا رەخنەی لە پیاوان گرتووە، لە ئەبی ئیسحاق ئیبراهیمی کوڕی عیسای تاڵەقانییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: ((وتم بە عەبدوڵای کوڕی موبارەك: ئەی باوکی عبدالرحمن ئەو فەرموودەی کە دەڵێت: چاکەی دوای چاکە ئەوەیە بۆ باوك و دایکت نوێژ بکەیت لەگەڵ رۆژووەکەی خۆتدا بۆیان بەرۆژوو ببیت؟

دەڵێت: عەبدوڵا وتی: ئەو فەرموودە لە کێوەیە؟

دەڵێت: پێم وت: ئەمە لە فەرموودەی شیهابی کوڕی خیراشە، وتی: ئەوە جێمتمانەیە، ئەو لە کێوە؟

دەڵێت: وتم: لە حەجاجی کوڕی دینارەوە، وتی: جێمتمانەیە، ئەو لە کێوە؟

دەڵێت: وتم: دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی، دەڵێت: عەبدوڵا وتی: ئەی باوکی ئیسحاق لە نێوان حەجاجی کوڕی دینار و پێغەمبەردا ماوەیەکی ئەوەندە دوور هەیە گەردنی وڵاخ دەبڕێت، بەڵام لە صەدەقە کردن بۆ دایك و باوك ناکۆکی نییە)).

**هەروەها "مسلم" بە سەنەدی خۆی دەڵێت:** عەبدوڵای کوڕی موبارەك وتوویەتی: لە نێوان ئێمە و ئەم خەڵکەدا "قوائم" هەیە، واتە ئیسنادی فەرموودە.

٢. ئەو بانگەشەی گوایە بە راستگۆییەکەی فریویان خواردووە و فەرموودەیان لێ وەرگرتووە، گەر کەسێك بەو جۆرە رەخنەی لە پیاوان گرتبێت و راستگۆیی و عەدالەتی تێدا کۆبووبێتەوە وەرگرتن لێی پێویست دەبێت.

ئیبن مەهدی دەڵێت: ئیمامان چوارن: سەوری، و مالیك و حەمادی کوڕی زەید و ئیبن موبارەك.

**ئیمام ئەحمەد دەفەرموێت:** لە سەردەمی خۆیدا هیچ کەس نەبووە لە ئەو زۆرتر و زیاتر بەدوای زانستدا بگەڕێت، کارێکی مەزنی کۆکردووەتەوە، هیچ کەس نییە بە ئەندازەی ئەو هەڵەی کەمتر بێت، پیاوێك بوو خاوەنی فەرموودە، لە کتێبەوە قسەی دەکرد.

**"ابن معین" دەڵێت:** پیاوێکی ژیری هۆشمەندی دانا بوو، زۆر دامەزراو بوو، باوەڕپێکراو و جێمتمانە بوو، کەسێکی زانا بوو، فەرموودەکانی سەحیح بوون.

**"الحاکم" دەڵێت:** ئیمامی چاخی خۆی بوو، لە هەموویان لەپێشتر بوو لە زانست و زوهد و ئازایەتی و بەخشندەیی.

**"النسائی" دەڵێت:** لە چاخی ئیبن موبارەکدا هیچ کەسێك وەك ئیبن موبارەك مەزن بەرچاومان ناکەوێت، هەر بەو جۆرە زاناتر لە ئەو بەرچاو ناکەوێت، کەسێك نابینرێت خەسڵەتە پەسەندەکانی بە ئەندازەی ئەو لە خۆیدا کۆکردبێتەوە.

**ئیمامی نەوەوی لە شەرحی سەحیحی "مسلم"دا دەڵێت:** زانایان کۆدەنگیان هەیە لەسەر مەزنی و شکۆمەندی و ئیمامەت و گەورەیی جێگە و بەرزی پلە و پایەی.

٣. ئەو گوزارەیەی لە سەحیحی "مسلم"ەوە دەیگوێزێتەوە دەربارەی عەبدولای کوڕی موبارەك، مرۆڤ سەریسوڕ دەمێنێت، چونکە گوزارەکەی ئیمام "مسلم" بەم جۆرەیە: ((ئیبن قوهزاز بۆی باس کردم وتی: گوێم لە وەهب بوو دەیوت لە سوفیانەوە لە ئیبن موبارەکەوە وتی: **"بقیة"** کەسێکی زمان راست بوو، بەڵام لە هەموو کەسێك(ئەوەی دێت و ئەوەی دەڕوات) فەرموودەی وەردەگرت)).

تۆ کاتێك ئەمە دەبینی گومانت نامێنێت لەوەی ئەم قسەیە قسەی عەبدولای کوڕی موبارەك خۆیەتی دەربارەی **"بقیة"(بقیة بن الولید)** کە یەکێکە لە ئەهلی فەرموودەی سەردەمی عەبدولا، بەڵام نووسەر وا تێگەیشتووە ئەمە قسەکردنە لەسەر عەبدولای کوڕی موبارەك و ئەو بەو وەسفە ناوبراوە.

**فەرموودەی داخستنی دەرگاكانی مزگەوتی پێغەمبەر**(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)**:**

له لاپــەڕە ٢٦٠دا دانــەری ئــەو كتێبــە باســی گــرنگترین ئــەو مەیدانانــە دەكـات فەرموودەی تێدا دانراوە، پێش هەموویان ناكۆكی نێوان عــەلی و ئەبوبــەكر و عــەلی موعاویە و عەبدوڵای كوڕی زوبەیر و عبدالملك و پاشان ئەمەوییەكان و عەباسییەكان.

پاشان قسەیەكی "ابن أبی الحدید" دەگوێزێتــەوە كــە دەڵێـت: ((بنچـینەی درۆ لــە فــــەرموودەكانی "**الفضــائل**"دا لـــەلای شـــیعەوە دەســـتی پێكـــردووە، كاتێـــك بەكرییەكان(سەرخەرانی ئەبو بەكر) بینییان شیعە فەرموودە بــۆ هاوەڵەكەیان(عــەلی) دادەنێن بەرانبەر بەوە فەرموودەیان بۆ ئەبوبەكر دانا، وەك ئەو فەرموودەی كە دەڵێت: ((گەر خەلیلێكم ببوایە ئەبوبەكرم دەكرد بە خەلیل)) ئەوان ئەم فەرموودەیان بەرانبەر برایەتی پێغەمبەر(ﷺ) بــۆ عــەلی دانــا، هــەروەها وەك نموونــەی داخســتنی هــەموو دەرگاكانی سەر مزگەوتی پێغەمبــەر(ﷺ) لەلایــەن پێغەمبــەرەوە جگــە لــە دەرگــای ئەبوبەكر، ئەو دانەخستنە بۆ دەرگــای عــەلی بــوو، بــەڵام بەكرییــەكان وەریــانگێڕاوە كردوویانە بە دەرگای ئەبوبەكر..هتد))

گومانی تێدا نییە "ابن أبی الحدید" پاساوی خۆیی هەیە كاتێك ئەو دوو فەرموودەیە بە هەڵبەستراو لە قەڵــەم دەدات، چـونكە ئــەو كەســێكی موعتــەزیلی شــیعی بــوو، دەمارگیری بۆ دەستەكەی خۆی هەبوو، بەڵام مامۆستا ئەحمەد ئــەمین پاســاوێكی بــە دەستەوە نییە لە بەدوادانەچوونی ئەوەی "ابن أبی الحدید" بۆی دەچێت.

**فەرموودەی یەكەم** ئیمامی بوخاری لە ڕێگەی ئیبن عــەباس و ئــیبن زوبــەیرەوە تــەخریجی كردووە، ئیمامی "مسلم"یش لە ڕێگەی "**أبي سعيد و ابن مسعود**"ەوە ریوایەتی كردووە.

**فەرموودەی دووەم** كە بریتییە لە داخستنی هەموو دەرگاكان جگە لەوەی ئــەبو بــەكر(خوا لێی ڕازی بێت) ئیمامی بوخاری لە ڕێگەی ئەبی ســەعید و ئــیبن عەباســەوە(خوایان لــێ ڕازی بێت) ریوایەتی كردووە، هەروەها "مسلم" لە ڕێگــەی ئــەبی ســەعید و جەنــدەب و ئوبەی كوڕی كەعبەوە ریوایەتی كردووە، جگە لەو دوانەش كەسانی تر ریوایەتیان كــردووە وەك "**الترمذي والطبراني و أحمد وابن عساكر و ابن حبان**" و كەسانی تر.

**فەرمووده‌كانی "الفضائل"(چاكه‌ و گه‌وره‌یی هاوه‌ڵان و تیره‌ و شوێن و شار)**

له‌ لاپه‌ڕه‌ ٢٦١دا ده‌ڵێت: ((فـه‌رمووده‌ی زۆر هـه‌ن كاتێـك ده‌یانخوێنیتـه‌وه‌ ئامـاژه‌ به‌وه‌ ده‌كه‌ن بۆ پشتیوانی و پشتگیری ئه‌مه‌وییه‌كان و عه‌به‌سییه‌كان و عه‌له‌وییـه‌كان دانـراون یـاخود بـۆ كه‌مكردنـه‌وه‌ی شانوشـكۆی ئه‌مانـه‌.. هـه‌ر بـه‌و جـۆره‌ ئـه‌و فه‌رموودانه‌ی باسی گـه‌وره‌یی و چـاكه‌ی هـۆز و تیره‌كـان ده‌كـه‌ن.. فـه‌رمووده‌ی زۆر دانراون له‌ فـه‌زڵ و چـاكه‌ی قـوره‌یش و ئه‌نصـار و "**جهینـة و مزینـة**".. هاوشـێوه‌ی ئه‌مانـه‌ ده‌مـارگیری بـۆ شـار، شـارێكی گـه‌وره‌ نابینیتـه‌وه‌ فـه‌رمووده‌ی له‌سـه‌ر دانه‌نرابێت، به‌ڵكو فه‌رمووده‌ له‌سه‌ر خێر و چاكه‌ی ئـه‌و شـاره‌، مه‌ككـه‌ و مه‌دینـه‌ و شاخی ئوحود و حیجاز و یه‌مه‌ن و شام و "بیـت المقـدس" و "مصـر" و "فـارس" و شوێنانی تر، هه‌موو ئه‌مانه‌ فه‌رمووده‌ له‌سه‌ر چاكه‌یان هاتووه‌..))

هاوه‌ڵان به‌ ڕۆح و ماڵیان خۆیان فیدای پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) كرد بـوو، لـه‌و فیداكردنه‌شـدا جۆراوجۆر بوون، وه‌ك چۆن له‌ پێشكه‌وتن له‌ موسڵمانبووندا جۆراوجۆر بوون، بۆیه‌ نامۆ نییه‌ پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) هه‌ندێكیان به‌ سه‌نا له‌سه‌ركردن و په‌سـه‌ندزانین یـان پـه‌رده‌ لادان له‌سه‌ر به‌هره‌یه‌كیان ته‌نها كردبێته‌وه‌، هه‌مان شت بڵێ ده‌رباره‌ی مه‌ككه‌ كه‌ سـه‌ره‌تای بانگه‌وازی تێدا بووه‌ و مه‌دینـه‌ كـه‌ ده‌وڵـه‌تی ئیسـلامی تێـدا راگه‌یـه‌نراوه‌، "بیـت المقدس" كه‌ خودا سه‌نای كردووه‌ له‌ قورئاندا.

هـه‌روه‌ك چـۆن ده‌گـونجێ -بـه‌ڵكو لـه‌ واقیعـدا روویـداوه‌- ده‌مـارگیران و نـه‌زانان فه‌رمووده‌یان ده‌ربـاره‌ی سـه‌ركرده‌كانیان و شـاره‌كانیان و هۆزه‌كانیـان دانابێـت، بـۆ فه‌رمووده‌یان زیاد كردبێت یان فه‌رمووده‌یان هه‌ڵبه‌ستبێت.

ئه‌مه‌ش دوو باره‌ هیچ كه‌س حاشای لێی نییه‌، بوونی فه‌رمووده‌ی سـه‌حیح و جـێگیر له‌سـه‌ر هه‌نـدێ كـه‌س و شـار و هـۆز رێگـری نـه‌كردووه‌ لـه‌ بـوونی كۆمـه‌ڵێك به‌ناوفه‌رمووده‌ی هه‌ڵبه‌ستراو له‌ هه‌مان زه‌مینه‌دا، كه‌سی زانای به‌ویژدان ئه‌و كه‌سـه‌یه‌ له‌و باره‌دا په‌له‌ نه‌كات بۆ به‌ڕاسـتزانینی هـه‌موو فـه‌رمووده‌كان و لـه‌ هـه‌مان كاتـدا هه‌مووشیان به‌درۆ نه‌زانێت، زانایان رێگه‌ی تایبه‌ت به‌ خۆیان هه‌یه‌ لـه‌ جیاكردنـه‌وه‌ی راست له‌ درۆ كه‌ بریتییه‌ له‌ ره‌خنه‌گرتن له‌ سه‌نه‌د و مه‌تن پێكه‌وه‌.

**فەرموودەکانی ئەبو حەنیفە:**

پاشان لە لاپەڕەی ٢٦٢دا دەربارەی پاڵنەری دووەم لـە هەڵبەسـتنی فـەرموودە کـە بریتییە لە جیاوازییە کەلامی و فیقهیەکان دەڵێت: ((هــەر بـەو جـۆرە لـە مەیـدانی فیقهدا، هەر لقێکی فیقهیت بەرچاو بکەوێت فەرموودەیەك بوونی هەیە پشتگیری لـیّ دەکات، تەنانەت مەزهەبی ئەبو حەنیفە زانایان قسەی لەسەر دەکەن و دەڵـێن تـەنها کەمێك فەرموودە لەلای سەحیح بووە، ئـیبن خەلـدون دەڵێـت: حەڤـدە فەرموودەیـە، کتێبەکانی پڕکراون بـە فـەرموودە و لەهــەژمار نایـەن، بـەڵکو پڕکـراون لـە دەقـی جۆراوجۆر کە وەك مەتنی فیقهی وان..)).

جیاوازی کەلامی و فیقهی کاریگەری هەبووە لەسەر دانان و ئێمە رەدی ناکەینــەوە، بەڵام ئەو بانگەشەی گوایە ئەبو حەنیفە تەنها حەڤدە فەرموودە لەلای سەحیح بــووە و دانەپاڵی ئەو قسەیە بۆ لای زانایان ئەمە ئەوەیە دانەری کتێبەکە هەڵەی تێدا کردووە و حەقی وازلێهێناوە و رێگەیەکی تری گرتووەتە بەر کە رێگەی زانایان نییە.

مەزهــەبی ئــەبو حەنیفــە بــەرینترین مەزهــەبێکی فیقهییــە لــە لــق لێکردنــەوە و هەڵهێنجاندا، تا ئەو پرس و بابەتانەی قسەیان لەسەر دەکرێت گەیشتوونەتە  ســەدان هەزار، بۆیە ماقووڵ نییە ئەبو حەنیفە ئەو هەموو بابەتانەی بەتــەنها لــە ئایەتــەکانی ئەحکام دەرهێنابێت، گەر بوترێت ئەو فیقهەی لە پێوانــە(قیاس)ەوە وەرگرتــووە ئــەوا دەڵێین: ئەوەی کۆکراونەتەوە لە فەرموودەکانی ئەبی حەنیفە لــە مەسـنەدەکانیدا کـە هاوەڵان و قوتابییەکانی لێیەوە ریوایەتیان کردووە گەیشتووەتە چەندین مەسنەد ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەشێکی زۆر لە فیقهی خۆی لە سوننەتەوە وەرگرتووە، دروست نییە بوترێت: ئەوەی ئەبو حەنیفە بە سەحیحی داناوە حەڤدە فەرموودە بووە، چۆن لەلای دروست نەبووە لە کاتێکدا بەڵگەی پێهێناونەتەوە و هەڵهێنجانی لێوە کردوون؟!

**قسەکەی ئیبن خەلدون:** ئاماژەی تێدایە بۆ ئەوەی سوور و پێداگر نەبووە لەسەر ئــەو قسەیە، پێش ئیبن خەلدونیش کەسێك نابینینەوە ئەو قســەی کردبێــت، بــەڵکو دەقــە گوازراوەکان لە  زانایانەوە ئاماژە بەوە دەکەن ژمارەیەکی زۆر لە ئەبی حەنیفــەوە بــە سەحیح زانراون.

**زیادەڕەوی خەڵکی لە شانداداندان لەسەر سوننەت:**

دانەر لە لاپەڕە **٢٦٣**دا قسە لە هۆیەکانی هەڵبەستنی فەرموودە دەکـات و دەڵێـت: ((وا ئەندێشە دەکەم لە گـرنگترین هۆیـەکانی دانان(هەڵبەسـتن) زیـادەڕەوی خـەڵکی بووبێت، چونکە ئەوان هیچ زانستێکیان قبووڵ نەدەکرد پەیوەست نەبێت بە کیتـاب و سوننەتەوە بە پەیوەستبوونێکی توندوتۆڵ، جگە لەمـە هـیچ شـتێکی تـر بەهایـەکی گــەورەی نــەبووە، حوکمــەکانی حــەڵاڵ و حــەرام گــەر تــەنها لەســەر ئیجتیهــاد بینابکرابانایە بەهای ئەوەیان نەبوو لەسەر فەرموودە بینا دەکرا و شـانیان لـە شـانی نەدەدا، زۆربەی زانایانیش لـەو چـاخەدا رەدیـان دەکـردەوە و هـیچ بەهایـەکیان بـۆ دانەدەنا، بەڵکو هەندێکیان بە خراپـی هێرشـیان دەکـردە سـەر ئـەو کەسـانەی ئـەو ئاراستەیان دەگرتە بەر(ئاراستەی ئیجتیهاد)، حیکمەت و ئامۆژگاری بـاش گـەر لـە بنەڕەتێکی هنـدی یـان یۆنـانی یـان فارسـییەوە بوایـە یـان لـە شـەرحی تـەورات و ئینجیلەوە بوایە کەس لای بەلادا نەدەکردەوە ئەمەش وای لە زۆرینـەی خـەڵکی کـرد بۆیاخێکی ئایینی لە هەموو ئەو شتانە(ئەو قسانە) بدەن تا خەڵکی رووی لێ بکـەن، فەرموودەیان بینیوە وەك دەروازەیەکی والاّ و کـراوە تـاکو لێیــەوە بچـنە ژوورەوە بـۆ لای خەڵکی، ئەوان لەو کارەیاندا لـە خـودا نەترسـان، لـە کاریگـەری ئـەوەوە ئێمـە حوکمی فیقهی دروستکراو و حیکمەتی هندی و فەلسەفەی زەردەشـتی و ئامۆژگـاری ئیسرائیلی و نەصرانی دەبینینەوە)).

موسڵمانانی پێشین و پاشین لەسەر ئەوە کۆدەنگیـان هەیـە کیتـاب و سـوننەت دوو بنچینەی تەشریعی ئیسلامین، بۆیە بۆ هیچ کـەس رەوا نییـە لـە قـەزای ئیسـلامیدا پێچەوانەی ئەوانە بڕیار دەربکات، موجتەهیدان لە هەر پرسێکدا پێویستە بگەڕێنـەوە سەر ئەو دوو بنچینەیە، پاشان بوون بە دوو بەشەوە:

**بەشێك پێیوایە** دەبێـت دەسـت بـۆ ئاشـکرای دەق ببرێـت بـەبێ شـیکردنەوە و هۆهێنانەوە و فراوانخـوازی لـە پێوانـەدا، ئەمانـە ئـەهلی زاهیر(زاهیرییـەکان) و زۆرینەی ئەهلی فەرموودەن.

**بەشێکیش پێیوایە** دەبێت بیر لە دەقەکاندا بۆ هەڵهێنجانی حوکمەکان بەکاربهێنرێت، بۆیە لەگەڵ کیتاب و سوننەدا کاریان بە پێوانە(قیاس) کرد، بەدوای هۆدا گەڕان و گشتگیریان تایبەت کرد و ڕەهایان کۆتوبەند کرد و نەسخکەر و نەسخکراویان جیاکردەوە، ئەمانە برینین لە جمهووری موجتەهیدان و هەڵگرانی زانست لە چاخی هاوەڵانەوە تا ئەمڕۆ.

ڕاستە جیاوازی هەیە لە دەستبردن بۆ پێوانە و شیکردنەوە و هۆهێنانەوە، هەروەها جیاوازی لە ئابلۆقەدان بە سوننەت و مەرجی دروستی و کارپێکردنی، لێرەوە جیاوازی لە نێوان قوتابخانەی ڕا و قوتابخانەی فەرمووده هاتووەتە ئاراوە، بەڵام هەموویان هاوڕان لەسەر ئەوەی ئیجتیهاد لە فیقهدا دروست نییە تا سەرنجی فەرمووده نەدرێت، بەڵکو پێویستیان کردووە لەسەر موجتەهید ئابلۆقەدانی بە فەرموودەی ئەحکام هەبێت و لەو مەیدانەدا کۆشانێك نەمێنێتەوە بەختی نەکردبێت.

**"ابن عبد البر" لە کتێبەکەیدا "جامع بیان العلم" تەخریجی کردووە لە شافیعیەوە(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) وتوویەتی:** ((بۆ هیچ کەس نییە بە شتێك بڵێت حەڵاڵ یان بە شتێك بڵێت حەرام مەگەر لەڕووی زانستەوە، ڕووی زانستیش ئەوەیە کیتاب یان سوننەت یان ئیجماع یان پێوانە لەسەر ئەو سێ ئەسڵە لە ماناکانیدا بە دەق هێناویەتی)).

ئەوەی لەلای ئیمامانی موجتەهیدان کۆدەنگی لەسەر هەیە ئەوەیە موجتەهید یەکەمجار تەماشای کتێبەکەی خودا دەکات، پاشان تەماشای سوننەتی پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، هەروەها قسەی هاوەڵان، پاشان دەچێت بۆ هەڵهێنجان و پێوانە گەر ئیجماع بوونی نەبوو.

ئیمامێك لە ئیمامان نابینینەوە کاریان بە حیکمەت و ئامۆژگاری باش نەکردبێت تەنها لەبەر ئەوەی لە قورئان و فەرموودەدا نەهاتوون، هەڵبەت گەر نەیکێشابێت بە دەقەکانی شەریعەت و ڕۆح و ئامانج و ئادابی شەریعەتدا، ئەوەی لەلایان مەئسوورە ئەوەیە "حیکمەت بزربووی کەسی باوەڕدارە.."[1].

[1] هذا نص حديث أخرجه الترمذي وابن ماجة بسند حسن.

هەروەها خودا لە باسی بەندە باوەڕدارەکانیدا دەفەرمویت: ﴿فَبَشِّرۡ عِبَادِ ١٧ ٱلَّذِينَ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓ﴾الزمر: ١٧– ١٨.

**ئیمامی بوخاری لە سەحیحەکەیدا لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە(خوا لێی رازی بێت) لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی:** ((گەر تەنها ئایەتێکیش بێت لە منەوە بیگەیەنە، دەربارەی بەنی ئیسرائیلیش قسە بکەن و حەرەجتان نەبێت)).

**ئیبن حەجەر دەڵێت:** واتە هیچ تەنگەلانی و گرانییەکتان لەسەر نییە گەر قسە دەربارەی بەنی ئیسرائیل بکەن، چونکە پێشتر دەمکوتی ئەوانەی کرد بوو لەوانیان وەردەگرت و تەماشای کتێبەکانی ئەوانیان دەکرد، پاشان بەرفراوانی لەوەدا روویدا، بەڵام نەهییەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بەر لە چەسپانی حوکمە ئیسلامییەکان و رێسا ئاینییەکان بوو لە ترسی سەرهەڵدان و تووشبوونی فیتنە[1]..

**عەدالەتی هاوەڵان:**

لە لاپەڕە ٢٦٥دا دەڵێت: ((زۆرینەی ئەو رەخنەگرانە-رەخنەگران لە فەرموودە- هەموو هاوەڵانیان بەگشتی بە دادپەروەر زانیوە، بۆیە بەخراپە ناوی هیچ کام لەوانیان نەبردووە و درۆیان نەداوەتە پاڵ هیچ کام لە ئەوان، کەمێکی زۆر کەمیان ئەوەی بەسەر کەسانی تردا تێیانپەڕاندووە بەسەر هاوەڵاندا تێیانپەڕاندووە... تا لە لاپەڕەی دوای ئەودا دەڵێت: ئەوەی کاری بەسەردا گوزەرکراوە لەلایەن زۆرینەی رەخنەگرانی فەرموودەوە-بەتایبەت پاشینەکان- هەموو هاوەڵانیان بە خاوەن عەدالەت داناوە و تۆمەتی درۆ و هەڵبەستنیان نەداوەتە پاڵ هیچ کام لە ئەوان بەڵکو تانەیان داوە لە ئەوانەی دوای ئەوان)).

ئەوەی شوێنکەوتوان و جمهووری موسڵمانان لە ئەهلی سوننە و جەماعە و رەخنەگرانی زانستی فەرموودە لەسەری کۆك و هاوڕان ئەوەیە هاوەڵان خاوەنی عەدالەتن و لە درۆ و هەڵبەستن دوورن، لەم کۆدەنگییە خەواریج و موعتەزیلە و شیعە

[1] فتح الباري.

دەرچوون، بەڵام نووسەر دەیەوێت ئێمە لەم راستییە بخاتە گومانەوە، یەکەمجار دەڵێت زۆربەی رەخنەگران هاوەڵانیان بە راستڕەو و دادپەروەر دانـاوە، بـەڵام کـەمێك لـەو رەخنەگرانە ئەوەی بەسەر کەسانی تردا تێیانپەڕاندووە بەسەر هاوەڵاندا تێیانپەڕاندووە، ئاماژەی بە گوزارشتێکی غەزالی کردووە لەگەڵ ئەوەی ئەوانەی قسـەیان لـە هـاوەڵان کردووە لە رەخنەگرانی فەرموودە نەبوون، بەڵکو لەوانە بوون خاوەنی مەیلێکی ناسراو و دەمارگیری بوون بۆ هەندێ لە هاوەڵان بەسەر هەندێ لە هاوەڵانی تردا.

**ئیمامی زەهەبی دەڵێت:** ((هاوەڵان راخەریان پێچـراوەتەوە بـا ئـەوەی کـە روویـداوە روویدابێت، چونکە لەسەر عەدالەتیان و قبووڵ کردنی ئەوەی بۆ ئێمەیان گواستووەتەوە کار دەکرێت و ئایینی ئێمەی لەسەر دامەزراوە))[1].

**"ابن کثیر" دەڵێت:** ((هاوەڵان هەر هەموویان خاوەنی عەدالەتن لەلای ئەهلی سوننە و جەماعە، پاشان دەڵێت: ئەو قسـەی موعتەزیلـە "هـاوەڵان هـەر هـەموو خـاوەنی عەدالەتن جگە لەوانەی دژ بە عەلی جەنگان" قسەیەکی پووچ و رەدکراوەیە)).

**پاشان دەڵێت:** ((دەستەکانی رافیزە و نـەزانینیان و کـەمی ئـەقڵیان و بانگەشـەیان گوایە هەموو هاوەڵان کافربوون جگە لە حەڤـدە کـەس لـەوان-حەڤـدە کەسـەکە نـاو دەهێنن- ئەمە وڕێنەیەکە بەبێ بەڵگە))[2].

## ئایا هاوەڵان هەندێکیان هەندێکی تریان بەدرۆ دەخستەوە؟

پاشان دانەری ئەو کتێبە دەڵێت: ((وا دەردەکەوێت هاوەڵان بۆخۆشیان لە سـەردەمی خۆیاندا هەندێکیان رەخنەیان ئاراستەی هەندێکی تر کردبێت و هەندێکیان لـە پلـە و پایەیەکی بەرزتر لە هەندێکی تر دانرابن))

بەم قسەیە دەیەوێت بەرهەڵستی هەڵوێستی زۆرینـەی رەخنـەگران بکـات دەربـارەی عەدالەتی هاوەڵان و رۆشنی بکاتەوە هیچ بوارێك بـۆ ئـەوە نەماوەتـەوە هـاوەڵان بـە خاوەنی عەدالەت بزانرێت، گوایە هاوەڵان هەنـدێکیان گومانیـان لەسـەر راسـتگۆیی

---

[1] رسالته في رواة الثقات. ص٤.
[2] إختصار علوم الحديث. ص٢٢٠-٢٢٢.

هەندێکی تریان هەبووە و هەندێکیان هەندێکی تریانی خستووەتە ژێر رەخنەوە، سێ بەڵگەشی بۆ ئەمە هێناوەتەوە:

١. ئەوەی لە رەخنەی ئیبن عەباس و عائشەوە گوازراوەتەوە لەسەر ئەبو هورەیرە(خوایان لێ رازی بێت).

٢. ئەوەی لە هەندێ لە هاوەڵانەوە دەگێڕنەوە گەر یەکێك فەرموودەیەکی بۆ ریوایەت بکردبایە داوای بەڵگەی راستگۆیی لێ دەکرد.

٣. ئەوەی لە نێوان عومەر و فاتیمەی کچی قەیسدا روویدا.

ئەوەی هاوەڵان گومانیان لە راستگۆیی یەکتر هەبووبێت ئەمە بانگەشەیەکە بەڵگەی بۆ نییە مەگەر لە کتێبەکانی رافیزە و شیعە توندڕەوەکاندا ببینرێتەوە کە لە عەلییەوە(خوا لێی رازی بێت) بەدرۆزانینی ئەوانەی سەرپێچیان لێ کردووە لە هاوەڵان گوازراوەتەوە، بەڵام گواستنەوەی دروست و مێژوویی پاك لە ئارەزوو و مەرامی تێکچوو بە رۆشنی دەیسەلمێنن هاوەڵان دوورترین کەس بوون لە جنێودان بە یەکتری، یان گومان دروستکردن لەسەر راستگۆیی یەکتری، بەڵگە لەسەر ئەمە زۆرە.

**ئەنەس دەفەرموێت:** ((ئێمە هەندێکمان هەندێکی ترمان بەدرۆنەدەخستەوە)).

**هەروەها "البراء" دەڵێت:** هەموو ئەو فەرموودانەی لە پێغەمبەرەوە بیستوومانەوە لە خودی خۆیەوە نەبوو، بەڵکو هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆیان دەگێڕاینەوە))

بەرپەرچدانەوەی عائشە و ئیبن عەباس(خوایان لێ رازی بێت) بۆ ئەبو هورەیرە(خوا لێی رازی بێت) بۆ قسەکردن لەسەر ئەبو هورەیرە دوادەخەین.

داوای هەندێ لە هاوەڵان بۆ راستگۆیی کەسەکە لەسەر دروستی فەرموودەکە، وەك داوای ئەبوبەکر لە موغیرە و داوای عومەر لە ئەبو موسا(خوایان لێ رازی بێت) پێشتر قسەمان لەسەر کردووە.

**هەڵوێستی عومەریش لە فاتیمەی کچی قەیس، دانەری کتێبەکە دەڵێت:** ((وەك ئەوەی ریوایەت کراوە فاتیمەی کچی قەیس باسی ئەوە دەکات مێردەکەی بە سێ(سێ بە سێ) تەڵاقی خوارد، پێغەمبەر(ﷺ) خەرجی و جێگەی بۆ دانەنا، بەڵکو پێی فەرموو: ((لە ماڵی ئیبن ئوم مەکتوم عیدەی خۆت بەسەر ببە ئەو پیاوێکی کوێرە)).

**ئەمیری باوەڕداران عومەر وتی:** کتێبەکەی پەروەردگارمان وازلێناهێنین بۆ قسەی ئافرەتێك نازانین راستی کردووە یان درۆ، شتەکەی لەبیر ماوە یان لەبیری چووە، عائشە بە عومەری فەرموو: تۆ لە خودا ناترسیت...هتد؟))

ئەم فەرموودە لە زۆربەی کتێبی سوننەدا ریوایەت کراوە و لەلای فەقیهان ناسراوە، لە چەند روویەکەوە لێی ورد دەبینەوە:

**یەکەم:** هاوەڵان لە تێگەیشتن و وردەکاری هەڵهێنجاندا جۆراوجۆر بوون، وەك چۆن هەندێکیان رەوشی تایبەتیان بوو، لەو رەوشەوە پێغەمبەر(ﷺ) مامەڵەی کەسەکەی دەکرد، ئەویش دواتر حوکمەکەی پێغەمبەری(ﷺ) وەك حوکمێکی گشتی دەگێڕایەوە، ئەوەش وایدەکرد گفتوگۆیەکی زانستی رووت لە نێوانیاندا سەرهەڵبدات، ئەوەش پەیوەندی بە شك و گومانەوە نەبوو لەسەر راستگۆیی کەسی بەرانبەر.

**دووەم:** قسەکەی عومەر(خوا لێی رازی بێت): (نازانین راست دەکات یان درۆ دەکات) لە هیچ کتێبێکی فەرموودەدا نەهاتووە، لە هەرچی سەرچاوەیە وردبوومەوە بەم گوزارشتە نەگەیشتم، بەڵکو تەنها بەمە گەیشتم: (لەبیری ماوە یان لەبیری چووە) تەنها لە هەندێ کتێبی "أصول"دا هاتووە وەك "**مسلم الثبوت**" کە دەیداتە پاڵ سەحیحی "مسلم" بەڵام لە سەحیحی "مسلم"دا تەنها ئەو گوزارشتەی سەرەوە هاتووە: (لەبیری ماوە یان لەبیری چووە)، ئەو کەسەی شەرحی "**مسلم الثبوت**"ی کردووە بەم هەڵەیەی زانیوە و دەڵێت: "ئەوەی لە سەحیحی مسلمدا هاتووە ئەمەیە: (لەبیری ماوە یان لەبیری چووە)"

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە خاوەنی "**فجر الإسلام**" لە پەراوێزی کتێبەکەیدا لەسەر ئەم فەرموودەیە نووسیویەتی "**انظر شرح النووي على مسلم و شرح مسلم الثبوت**" گەڕامەوە بۆ "**شرح النووي**" ئەم گوزارشتەم تێدا نەبینییەوە: "درۆ دەکات یان راست دەکات"

**سێیەم:** لە ئەگەری دروستی ئەم گوزارشتەدا -کە تاکو ئێستا ساغ نەبووەتەوە- پێویستە وشەی "درۆ دەکات" بە "هەڵە دەکات" لێکبدەینەوە، وەك چۆن دەبێت

وشەی "ڕاست دەكات" بە مانای "پێكاویەتی و هەڵـە ناكـات" لێكبدەینـەوە، ئـیبن حەجەر دەڵێت: ئەهلی مەدینە وشەی "درۆ"یان بۆ "هەڵە" بەكاردەهێنا.

**چوارەم:** بەرپەرچدانەوەی عومەر بۆ فاتیمە لەبەر ئەوە بوو قسـەكەی فاتیمـە لەگـەڵ ئەوەی لە قورئان و فەرموودەدا هاتبوو پێچەوانە بوو، ئەوەی ئاشكرایە گەر دوو هەواڵ پێچەوانەی یەكتر بـوون بـەهێزترینیان وەردەگیرێـت، ئامـاژەی قورئـان بـەهێزترە لـە ئاماژەی سوننە، بۆیە عومەر تاوانێكی نەكردووە گەر هەواڵەكەی ئـەو وەرنـەگرێت و ئەوەی لەلای خۆی ڕاستبووەتەوە وەربگرێت.

**پێنجـەم:** قسەكەی عائشە(خوا لێی ڕازی بێت): "تـۆ لـە خـودا ناترسـی..؟" بینـا لەسەر ئەوە بووە لەلای ڕوون و ئاشكرا بووە پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاری خەرجی و جێگـەی بۆ نەدا ئەوەش بە هۆی بوونی بەرهەڵستییەكی تایبەت لەو كێشـەیەدا، نـەك ئـەوەی حوكمێكی گشتی بێت بۆ هەموو تەڵاقدراوێك بە تەڵاقی كۆتایی، كاتێك بینی خەڵكی لەو بارەیەوە قسە دەكەن وەك ئەوەی حوكمێكی گشتی بێت لەو ڕاستییە تێیگەیانـد و فاتیمەی حاڵی كرد ئەو حوكمە تایبەت بووە بە ئەو.

### جیاوازی زانایان لە تەعدیل و تەجریحدا:

دانەری كتێبەكە لە لاپەڕە ٢٦٦دا دەڵێت: ((جیاوازی مەزهـەبی كاریگـەری هـەبوو لەسەر تەعدیل و تەجریح، ئەهلی سوننە زۆرینەی ئەهلی شیعە تـەجریح دەكـەن، تـا وایان لێهاتووە بـە دەق هێناویانـە دروسـت نییـە ئـەوەی هـاوەڵان و شـیعەی عـەلی ریوایەتی دەكەن لە عەلییەوە وەربگیرێت، بەڵكو تەنها ئەوانـە وەردەگیرێـن هـاوەڵانی عەبدوڵای كوڕی مەسعوود(خوا لێی ڕازی بێت) ریوایەتیان كردووە، هـەر بـەو جـۆرە هەڵوێستی شیعە لە ئەهلی سوننە، زۆرینـەیان تـەنها متمانـەیان بەوەیـە شـیعە لـە ئەهلوبەیتەوە ریوایـەتیان كـردووە، لەمـەوە ئـەوەی دەسـتەیەك تەعـدیلیان دەكـردن دەستەیەكی تر تەجریحیان دەكردن.

زەهەبی دەڵێت: ((دوو زانـای ئـەم زانسـتە كۆنەبوونەتـەوە لەسـەر متمانـەدان بـە لاوازێك، یان لاواز كردنی جێمتمانەیەك))

لەگەڵ ئەوەی ئەم قسەیە زیادەڕەوی تێدایە بەڵام ئاماژە بە دیدی جۆراوجۆر دەکات لە تەجریح و تەعدیلدا، با نموونەیەکت بۆ بهێنمەوە: محەمەدی کوڕی ئیسحاق مەزنترین مێژوونووس لە ڕووداوەکانی ئیسلامی بەراییدا.

قەتادە دەربارەی دەڵێت: هەتا محەمەدی کوڕی ئیسحاق مابێت زانست لەناو خەڵکیدا ماوە، بەڵام **"النسائي"** لەسەری دەڵێت: پیاوێکی بەهێز نەبووە.

هەروەها سوفیان دەڵێت: گوێم لە کەس نەبووە محەمەدی کوڕی ئیسحاق تۆمەتبار بکات، کەچی **"الدار قطني"** نە بە خۆی و نە بە باوکی بەڵگە ناهێنرێتەوە، مالك دەڵێت: شایەتی دەدەم ئەو درۆزنە..)).

**لێرەدا قسە لەسەر دوو شوێنە:**

**یەکەم:** لە ڕێساکانی عەدل و تەجریح.

**دووەم:** لەسەر گوزارشتەکەی زەهەبی و بۆچوونەکان لەسەر محەمەدی کوڕی ئیسحاق.

**شوێنی یەکەم:** لەلای دانەر سەرهەڵدانی زانستی جەرح و تەعدیل بۆ جیاوازی مەزهەبی دەگەڕێتەوە، بۆجیاوازی لە تەجریح و تەعدیلدا یان بۆ جیاوازی سوننە و شیعە دەگەڕێتەوە یان بۆ جیاوازی مەزهەبەکانی سوننە لەناو خۆیاندا.

جیاوازی لەناو مەزهەبەکانی ئەهلی سوننەدا سەرچاوەکەی بۆ جیاوازی تێڕوانین لە ڕاستگۆیی و درۆزنی و عەدالەت و فیسق و لەبەرکردن و لەبیرچوونی ڕاویەکە دەگەڕێتەوە.

جیاوازی ئەهلی سوننەش لەگەڵ کەسانی تر بۆ جیاوازی مەزهەبی ناگەڕێتەوە، چونکە ئەهلی سوننە تەجریحی سەرپێچیکەرانی خۆیان ناکەن مەگەر بیدعەکە سەری لە بێباوەڕییەوە دەرکردبێت، جیاوازی تەجریح لە نێوان ئەهلی سوننە و کەسانی تردا لە ڕاستیدا دەگەڕێتەوە بۆ شك لە ڕاستگۆیی ڕاویەکە یان متمانە پێی نەك تەنها جیاوازی مەزهەبی، بۆیە کتێبی سوننە پێش هەموویان دوو سەحیحەکە فەرموودەیان لە دەستەیەك کەسی بیدعەکەر وەرگرتووە کە ژیانیان شایەت بووە لەسەر ئەوەی هەرگیز درۆیان نەکردووە وەك **"عمران بن حطان الخارجي و أبان بن تغلب الشيعي"**.

زەهەبی لەسەر "ابان بن تغلب الكوفي" دەڵێت: ((شێعییەکی توند بوو، بەڵام راستگۆ بوو، صدقەکەی بۆ ئێمەیە و بیدعەکەی بۆ خۆیەتی)).

ئەو قسەیەش ئـەهلی سـوننە ریوایـەتی هـاوەڵانی عـەلی وەرنـاگرن لەبـەر ئەوەیـە زانستەکەی ئەویان شێواندووە و کۆمەڵێك بیروڕایان بەدەمەوە هەڵبەستووە کـە ئـەو نەیوتووە، لە ئیبن ئیسحاقەوە دەگێڕنـەوە وتوویـەتی: ((کاتێـك لـەدوای عـەلی ئـەو شتانەیان هێنا ئاراوە یەکێك لە هاوەڵانی عەلی وتی: خودا بیانکوژێت چ زانستێکیان تێکدا؟ کاتێك لە نێوان هاوەڵانیدا درۆیان بە دەم عەلییەوە بڵاوکردەوە ریوایەتـەکانی ئەویان وازلێهێنا ئەمەش وەك وردەکاری و خۆپارێزی)).

**شوێنی دووەم** ئەو قسەی کە دەڵێت: ((لەمەوە ئەوەی دەسـتەیەك تەعـدیلیان دەکـرد دەستەیەکی تر تەجریحیان دەکرد)) بەڵگە بە گوزارەیـەکی زەهـەبی دەهێنێتـەوە وەك جیاوازیان لەسەر **محەمەدی** کوڕی ئیسحاق.

**یەکەم:** نموونە هێنانەوە بـۆ کاریگـەری جیـاوازی مەزهـەبی بـە جیاوازیـان لەسـەر **محەمەدی** کوڕی ئیسحاق دروست نییە، چونکە جیاوازیان لەسەر نـاوبراو بـۆ جیـاوازی مەزهەبی ناگەڕێتەوە، هەموو ئەوانەی لەسەری جیاوازن لە ئەهلی سوننەن، بۆیە ئـەو نموونە بۆ ئەم شوێنە شیاو نییە.

**دووەم:** ئەو لە تێگەیشتنی گوزارشتەکەی زەهەبی بە هەڵەدا چووە و ئەو مەبەسـتەی نەبووە ئەو لێی حاڵی دەبێت، ئەو وا تێدەگات بەڵگەیە لەسەر جیاوازی دید و تێڕوانین، ماناکەی ئەوەیە دوو کەس نە لەسەر متمانەدان بە پیاوێك و نە لەسـەر بـەلاوازدانانی رێکنەکەوتوون، بەڵکو ئەوەی ئەمەیان متمانەی پێ دەدات ئەوی دووەمیان تـەجریحی دەکات، ئەو کەسەی تێڕامان بۆ گوزارەکەی زەهەبی بکات بە تەواوی پێچەوانەی ئەوەی دانەر تێدەگات، زەهەبی دەیەوێت بڵێت: زانایانی ئەم زانسـتە لـە رەخنـەی پیاوانـدا دامەزراون، رووینەداوە متمانە بدەن بە کەسێك بە لاواز بەناوبانگ بووبێت، یان پیاوێك بە لاواز دابنێن بە متمانە و صدق بەناوبانگ بووبێت، بەڵکو جیاوازیـان لەسـەر ئـەو کەسانەیە بە لاوازی یان بە دامەزران(متمانە) بەناوبانگ نـەبووبێت، پوختـەی قسـان ئەوەیە ئەوان تەنها بە راستی و دروستی باسی پیاوان دەکەن.

**سێیەم:** جیاوازی لە محەمەدی کوڕی ئیسحاقدا پشتیوانی گوزارەکەی زەهەبی ناکات، بەڵکو لە میانەی بەرهەڵستیدا خراوەتە روو، بنەڕەتی بابەتەکە، خاوەنی **"مسلم الثبوت"** لەدوای ئەوەی گوزارەکەی زەهەبی باس دەکات "شارح"ەکەی بەرهەڵستی ئەو قسەیە دەکات و دەڵێت ئەم گشتاندنە دروست نییە، رووماڵی بۆ راستی تەواو نییە، بۆ نموونە لە محەمەدی کوڕی ئیسحاقدا جیاوازیان هەیە، قسەی زانایانی لە نێوان تەعدیل و تەجریحدا لەسەر ناوبراو هێناوە، پاشان دەڵێ: ((تەماشا بکە گەر ئەو جێمتمانە بوایە زیاتر لە دوو کەس لەسەر لاوازییەکەی کۆنەدەبوونەوە، گەر لاوازیش بوایە زیاتر لە دوو کەس لەسەر متمانەپێدانی کۆنەدەبوونەوە)).

**رێساکانی رەخنە لە سەنەد و مەتن:**

دانەری **"فجر الإسلام"** لە لاپەڕەی ٢٦٦دا دەڵێت:

((زانایان کۆمەڵێك رێسایان بۆ جەرح و تەعدیل داناوە، ئێرە جێگەی باسکردنیان نییە، بەڵام گەر حەق بوترێت ئەوان گرنگیان بە رەخنە داوە لەسەر سەنەد زیاتر لەوەی رەخنە لە مەتن بگرن، زۆر کەم دەبینین رەخنە ئاراستەی مەتنێك کرابێت و وترابێت ئەم مەتنە لەگەڵ ئەو رەوشەدا پێکنایەتەوە کە تیایدا وتراوە و رووداوە مێژووییە جێگیرەکان دژایەتی دەکەن، هەروەها وترابێت گوزارەی فەرموودەکە گوزارەیەکی فەلسەفیانەیە و پێچەوانەی ئەوەیە کە لە گوزارەی پێغەمبەرەوە(ﷺ) پێی ئاشنابووین، یان فەرموودەکە لە مەرج و کۆتوبەندەکانیدا زیاتر لە مەتنی فیقهی دەچێت و بەم جۆرە، لەم دەروازەیەوە یەك لەسەر سەدی ئەو گرنگییەی بە جەرح و تەعدیلی ی پیاوان دراوە بە مەتن نەدراوە، تەنانەت خودی بوخاری-لەگەڵ مەزنی پلە و پایە و وردی باس و لێکۆڵینەوەی- دەبینین چەندین فەرموودەی جێگیر کردووە رووداوەکانی ناو زەمەن و بینینی ئەزموونی دەیسەلمێنن دروست نین، ئەوەش بە هۆی خۆکورتکردنەوە لەسەر رەخنە لە پیاوان وەك فەرموودەی: ((هەر کەس بەیانیان حەوت دەنك خورما بخوات نە ژەهر و نە سیحری ئەو رۆژە تا شەو زیانی پێ ناگەیەنن))

**ئەم قسانەی دانەر دوو شت لەخۆ دەگرن:**

**یەکەم:** رەخنە لەو رێسانەی زانایان بۆ رەخنە لە فەرموودە دایانناوە.

**دووەم:** رەخنە لە دوو فەرموودە لــە ســەحیحی بوخاریــدا هــاتوون، وەك رۆیشــتنێك لەگەڵ کۆمەڵێك رێسای نویٚ کە بۆ رەخنە داینا‌ون.

**یەکەم: رێساکانی زانایان بۆ رەخنە لە فەرموودە:**

گەر کەسێك لە کەسێکی ترەوە هەواڵێکت پیٚ بدات یەکەمین شتێك دێت بــە بیرتــدا ئەوەیە لە راســتگۆیی ئــەم کەســەی هەواڵەکــەی داوە دڵنیــا ببینــەوە، و لــە حــاڵ و ئەمانەت و مامەڵەی کەسەکە ورد ببینەوە، گەر لەوانەدا متمانــەدار بــوو ئــەوجا لــە هەواڵەکە ورد دەبینەوە، گەر لەگەڵ گوفتار و حاڵی کەسەکە پێکهاتەوە گومانمــان لــە راستێتی هەواڵەکە نامێنێت و لێی دڵنیا دەبینەوە، ئەگــەر نــە، بــۆت هەیــە لەســەر قسەی هەواڵدەرەکە بوەستیت ئەوەش بە هۆی بوونی گومانێك لە هەواڵەکــەدا لەگــەڵ دڵنیابوونت لە راستگۆیی هەواڵدەرەکە، دەشگونجیٚ سەرچــاوەی ئــەو گومانــە لەســەر هەواڵەکە بۆ وەهم و لەبیرچوونێکی کەســی هەواڵــدەر بگەڕێتــەوە، یــان دەگــونجیٚ بــۆ نهێنییەك بگەڕێتەوە کە ئاشکرا نەبووە، لەوانەیە لــە داهــاتوودا نهێنییەکــە ئاشــکرا ببێت و ئەوەی شاراوەیە رۆشن ببێتەوە.

ئەمە نموونەی هەڵوێســتی زانایانــە لــەوەی بــە دەســتیان گەیشــت لــە فــەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ)، رەخنەی ئەوان لە سوننەت بە دوو هەنگاو بوو: یەکەمیان رەخنــە لــە سەنەد، دووەمیان رەخنە لە مەتن.

**رەخنە لە سەنەد** پێشتر ئاماژەمان بە بەشێکی کردووە لە مەرجی راوی و عەدالەت و دەرخکردن و لەبەرکردن و وردەکاری و بیستن لە هــەر راوییــەکــدا لــە زنجیرەیەکــدا تــا دەچێتەوە سەر هاوەڵان، پێموایە نە دانەر و نە رۆژهەڵاتناســان نــاتوانن زانایانمــان بــە کەمتەرخەمی لە رەخنەی حــاڵی راوییــەکان تۆمــەتبار بکــەن، هــەروەها لــە دانــانی مەرجی ورد بۆ قبووڵکردنی هەواڵەکانیان.

**رەخنە لە مەتنیش: کۆمەڵێك ڕێسایان داناوە بۆ رەخنەگرتن لێی، گرنگترینیان:**

١. لەڕووی دەربڕین و گوزارەوە وشك و ناڕەوان(ركيك) نەبێت، بە جۆرێك کەسی زمانپاراو و رەوانبێژ ئەو جۆرە گوزارەی نەبێت.

٢. پێچەوانەی بەڵگەنەویستە ئەقڵییەکان نەبێت، بە جۆرێك جێگەی تەئویل نەبێت.

٣. پێچەوانە نەبێت بە رێسا گشتییەکان لە حیکمەتەکان و ئەخلاق.

٤. پێچەوانە نەبێت بە هەست و بینین.

٥. پێچەوانە نەبێت بە بەڵگەنەویست لە کاری پزیشکی و حیکمەت.

٦. بانگ بۆ کارێکی پەست و خراپ و ناباش نەکات کە شەریعەت لێی بەرییە.

٧. پێچەوانە نەبێت بە ماقووڵ لە ئوسوڵی بیروباوەڕ لە سیفەتەکانی خودا و پێغەمبەرانی.

٨. پێچەوانە نەبێت بۆ سوننەتەکانی خودا لە گەردوون و مرۆڤدا.

٩. وڕێنە و شتی بێمانا نەبێت کە کەسی ژیر و هۆشمەند بە دەمیدا نایەت.

١٠. پێچەوانە نەبێت بە قورئان یان سوننەتێکی چەسپاو یان ئەوەی کۆدەنگی لەسەر هەیە یان بە زەروورەت لە ئاییندا ئاشکرایە و جێگەی تەئویل کردن نەبێت.

١١. پێچەوانە نەبێت بەو راستەقینە مێژووییە ناسراو و زانراوانەی سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ).

١٢. تەبا نەبێت لەگەڵ مەزهەبی راوییەکە کە بانگ بۆ مەزهەبەکەی دەکات.

١٣. هەواڵ نەدات دەربارەی رووداوێت خەڵکانێکی زۆر بینیبێتی کەچی تەنها یەك راوی بیگێڕێتەوە.

١٤. هەڵقوڵاوی پاڵنەری ناوەکی(نەفسی) نەبێت و وای لە راوییەکە کردبێت بیگێڕێتەوە.

١٥. باس لە زیادەڕەوی پاداشتی گەورە نەکات لەسەر کارێکی بچووك و یان زیادەڕەوی لە هەڕەشەی توند لەسەر گوناهێکی بچووك.

زانایان لەسەر ئەم بنچینە دامەزراوانە خۆیان بۆ رەخنە لە مەتنی فەرموودە ساغکردەوە، و سەحیحەکانیان لە سەقیمەکان جیاکردەوە.

**بەلاّم دانەری کتێبەکە** (واتا خاوەنی **"فجر الإسلام"**) **داوا دەکات لەم بابەت و پرسانەدا رەخنە لە مەتنی فەرموودە بگیرێت:**

١. ئایا ئەوەی دراوەتە پالّ پێغەمبەر(ﷺ) تەبایە لەگەلّ ئەو سەردەمەی تیایدا وتراوە؟

٢. ئایا رووداوە مێژووییەکان پالّپشتی دەکەن؟

٣. ئایا ئەو فەرموودەیە جۆرێکە لە گوزارەی فەلسەفیانە کە پێچەوانەیە بەوەی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) پێی ئاشنا بووین؟

٤. ئایا فەرموودەکە لە مەرج و کۆتوبەندیدا بە مەتنی فیقهی دەچێت؟

٥. ئایا فەرموودەکە لەگەلّ واقیع پێکدێتەوە یان نە؟

٦. ئایا پالّنەری سیاسی بۆ هەلّبەستن و دانان هەبووە؟

٧. ئایا فەرموودەکە لەگەلّ ئەو ژینگەی قسەکەی تێدا کراوە پێکدێتەوە یان نە؟

٨. ئایا هیچ پالّنەرێکی دەروونی هەیە راوییەکە هانبدات بۆ دانان(هەلّبەستنی فەرموودەکە) یان نە؟

ئەم رێسا نوێیانە کە خاوەنی **"فجر الإسلام"** هێناونی وا بانگەشە دەکات زانایان پەییان پێنەبردووە، گەر ئەم رێسانەیان بزانیبایە حالّی زۆر فەرموودەیان بۆ ساغ دەبوویەوە کە بڕیاری دروستییان داون و —بەپێی قسەی ئەو- هەلّبەستراون.

بۆ ئەم مەبەستەش لە کتێبی **"فجر الإسلام"**دا ئاماژە بە دوو فەرموودە دەکات لە سەحیحی بوخاریدا، هەروەها لە کتێبی **"ضحی الإسلام"**دا ئاماژە بە فەرموودەیەك دەکات کە **"الترمذي"** لە ئەبی هورەیرەوە ریوایەتی کردووە((کومئە[1] لە گەزۆ(من)یە ئاوەکەی شیفای چاوە، و خورمای عەجوە لە بەهەشتەوەیە و شیفایە بۆ ژەهر)).

---

[1] (رووەکێکی ژێر زەوییە(دۆمبەلاّن)).

دەڵێت: ئەوان نەچوون کومەڵە تاقیبکەنــەوە و ســەرەڕای بانگەشــەکەی ئــەبو هــورەیرە گوایە ئەو تاقیکردووەتەوە و شیفای لێوە بەدەست هێناوە.

بەڵام دواجار دانەر دان بەوەدا دەنێت هەندێ ریوایەت لە هاوەڵانەوە باسکراون کە وەك رەخنەی دەروونی وابووە، وەك رەخنەی ئیبن عومەر بۆ ئەبو هورەیرە لە خســتنە ســەر فەرموودەکە "یان سەگی کشتوکاڵ" دەڵێت: ئەبو هورەیرە بۆ خۆی کشتوکاڵی هەبوو.

**وەرن با پێکەوە لەم پێوەرە نوێیانە و نموونەکانیان بکۆڵینەوە:**

١. گوایە **"ئەوان لەوە نەکۆڵاونەتەوە دراوەتە پاڵ پێغەمبەر(ﷺ) ئایا لەگەڵ ئەو رەوشــەدا پێکدێتەوە تیایدا وتراوە"**.

پێشــتر ناڕاســتی ئــەم بانگەشــەت بــۆ دەرکــەوت، نموونــەی حــەمامان هێنایــەوە، پێغەمبەر(ﷺ) هەرگیز نەچووەتە حەمام و لە چاخی پێغەمبەردا(ﷺ) حیجاز حەمامی تێدا نەبووە.

٢. **"رووداوی مێژوویی پشتیوانی لێ بکات یان بە درۆی بخاتەوە"**.

ئەمەش زانایان لە نیشانەکانی دانان و هەڵبەستن سەرژمێریان کردووە، نموونــەیان بــە ریوایەتی دانانی جزیە لەسەر ئەهلی خەیبەر هێناوەتــەوە، زانایــان رەدی دەکەنــەوە و دەڵێن رووداوی مێژوویی رەدی دەکاتەوە، چونکە لەو کاتەدا ئایەتی جزیە نــەهاتبوو، تۆ دەبینی چۆن مێژوویان بۆ پەردەلادان لەسەر درۆی راوییەکان بەکارهێناوە.

٣. **"فەرموودەکــە جۆرێــك لــە گــوزارەی فەلســەفی بێــت و لــەو شــێوازە گوزارەیــە لــە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئاشنا نەبین"**.

ئەمە دەچێتە ژێر **"ركة اللفظ**-ناڕەوانی دەربڕین و گوزارشت".

ئیبن دەقیق دەڵێت: ((زۆر جار بڕیاری هەڵبەستنی ریوایەتەکە دەدەن، بەوەی گوزارەکە بۆ راوییەکە دەگەڕێتەوە، دەزانن کامە گونجاوە گوزارە و دەربڕینی پێغەمبەر(ﷺ) بێت و کامەش نەشیاو و نەگونجاوە)).

بۆیە گەر ئەوان بەو جۆرە بن زۆر ئاسان لە مەتنێکی فەلسەفیانە تێدەگەن و دەزانن گوزارشتی پێغەمبەر(ﷺ) نییە.

**٤. "فەرموودەکە لە مەرج و کۆتوبەندیدا لە مەتنی فیقهی بچێت".**

زانایان بە مەرجیان گرتووە ریوایەتەکە تەبا نەبێت لەگەڵ مەزهەبی راوییە دەمارگیرەکە، بۆیە بە هەمان هۆ زۆرێك لە ریوایەتی فیقهییان رەد کردووەتەوە، لەوانە ((ئاوڕادان لە دەم و ئاوڕادان لە لووت بۆ کەسی لەشگران فەرزە)).

هەروەها ئەو ریوایەتەی دەڵێت: ((گەر بە ئەندازەی درهەمێك خوێن بە پۆشاکەوە بوو، پۆشاکەکە پاکدەکرێتەوە و نوێژەکە دووبارە دەکرێتەوە)). هەر بەو جۆرە کۆمەڵێك فەرموودە لە "زانستی عەقائید"دا.

**٥. "ئایا فەرموودە لەگەڵ واقیعدا پێکدێتەوە یان نە؟"**

وەك بینیت زانایان باسی ئەوەشیان کردووە، لەو پێناوەدا زۆرێك لە ریوایەتیان رەد کردووەتەوە، لەوانە: ((لەدوای سەد(سەد ساڵی تر) منداڵێك لەدایك نابێت پێویستییەکی بۆ خودا تێدا بێت))، پێچەوانەی واقیعی بینراوە، چونکە زۆربەی ئیمامان لەدوای سەدەی یەکی کۆچی لەدایکبوون.

هەروەها ئەو ریوایەتەی دەڵێت: ((باینجان شیفایە بۆ هەموو نەخۆشییەك)).

هەروەها: ((نیسك بخۆن، چونکە موبارەکە و دڵ نەرم دەکات و فرمێسك زۆر دەکات)) دەڵێن ئەم دوو بەناوفەرموودە پووچ و بێبنەمان، چونکە پێچەوانەن بە واقیعی زانراو لە زانستی پزیشکی و ئەزموونی خەڵکی.

**٦. "ئایا پاڵنەری سیاسی بوونی هەیە بۆ دانانی فەرموودە؟"**

تۆ دەبینی بە دەق رەفزی ریوایەتی خاوەن رێچکەکان و ئارەزووبازە دەمارگیرەکان دەکەن، بەو هۆیەوە ریوایەتەکانی شیعە توندڕەوەکان دەربارەی عەلی رەد دەکەنەوە، هەر بەو جۆرە بەکرییە توندڕەوەکان و عوسمانییە توندڕەوەکان و دەمارگیرەکان بۆ ئەمەوی و

بەنی ئومەیە، و دەمارگیران بۆ عەباسییەکان و بەنی عەباس، دەبینیت زانایان بەوەیان زانیوە جیاوازی سیاسی لە بەهێزترین هۆیەکانی فەموودە هەڵبەستن بووە.

٧. ئەوەش **"ئایا فەرموودەکە لەگەڵ ئەو ژینگە پێکدێتەوە کە تیایدا وتراوە یان نە؟"**

بە دەق لەسەر ئەم خاڵە قسەیان کردووە و زۆرێك لە بەناوفەرموودەیان لەم مەیدانەدا رەد کردووەتەوە، لەوانە: بەناوفەرموودەی: ((تووشی چاوئێشە بووم و سکاڵام لەلای جبریل کرد و پێی وتم: بەردەوام بە لە سەیرکردنی مەسحەف)).

دەڵێن: لەبەر ئەوەی لە سەردەمی پێغەمبەردا مەسحەف نەبوو تا تەماشا بکرێت.

٨. **"ئایا پاڵنەری دەروونی بوونی هەیە کەسەکەی هەڵنابێت بۆ دانان یان نە؟"**

بینیت ئەم لایەنەشیان پشتگوێ نەخستووە، بەڵکو دەڵێن: لە حاڵی راوییەکە سوود دەبینرێت بۆ ناسینەوەی دانان(هەڵبەستن)، بۆ ئەمە نوونەیەکیان لەو بەناوفەرموودانە هێناوەتەوە: ((هەریسە پشت بەهێز دەکات)) راوی ئەم بەناوفەرموودە لەو کەسانە بوو هەریسەی دروست دەکرد.

هەروەها بەناوفەرموودەی: ((مامۆستایانی منداڵەکانتان خراپترینی ئێوەن..)) راویەکەی بریتییە لە سەعدی کوڕی تەریف، دەوترێت منداڵەکەی بەگریانەوە گەڕایەوە بۆ لای و هەواڵی پێدا مامۆستاکەی لێیداوە، ئەویش ئەو ریوایەتەی هەڵبەست.

بەم جۆرە دەبینیت هەموو ئەوەی دانەری کتێبەکە بانگەشەی دەکات زانایانی فەرموودە پەییان پێ بردووە، واتە ئەو رێسانەی رەخنەیان لە مەتن پێ دەگیرێت.

راستە زانایان(رەحمەتی خودایان لێ بێت) ئەو پێوەرانەیان لە میانەیەکی تایبەتدا بەکارهێناوە و فەرموودەیەکیان رەد نەکردووەتەوە هەتا تەئویل کردن شیاو بووبێت، بۆیە کاری سەرەکیان رەخنە بووە لە سەنەد، بەوەش هەزاران بەڵکو دەیان هەزار ریوایەتی درۆیان لەبەردەم سوننەدا لاداوە، پاشان لە سنوورێکی بەرتەسکدا -وەك باسمان کرد- رەخنەیان ئاراستەی مەتن کردووە.

**دووەم: ڕەخنە لە فەرموودە لە سەحیحی بوخاریدا:**

**فەرموودەی یەکەم:**

**((لەدوای سەد ساڵ نەفسێك هەناسە بدات لەسەر پشتی زەوی نامێنێتەوە))**

ئەم فەرموودەیە بوخاری و مسلم و ئیمامانی فەرموودە تەخریجیان کردووە، دانەری کتێبەکە وا تێگەیشتووە پێغەمبەر(ﷺ) مەبەستی بەو هەواڵە کۆتایی دونیا بووە لەدوای سەد ساڵی تر، بۆیە بڕیاری هەڵبەستنی بەسەردا داوە، چونکە پێچەوانەیە لەگەڵ ڕووداوەکانی مێژوو و هەست و بینیندا.

بەڵام ئەم فەرموودەی ناوبراو باسی دەکات بەشێکە لە فەرموودەیەکی تەواو کە بوخاری ریوایەتی کردووە: عەبدوڵای کوڕی عومەر(خوا لێی رازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا نوێژی عیشای کرد، کاتێك سڵاوی دایەوە هەستایە سەر پێ و فەرمووی: ((ئەم شەوی خۆتان بینی، لەدوای سەد ساڵی تر ئەوانەی ئەمڕۆ هەن لەسەر پشتی زەوی نامێننەوە)) مەبەستی ئەوە بوو ئەوانەی کە هەن لەو سەدەیەدا تیادەچن. فەرموودەکە ڕۆشنە.

لە ریوایەتەکەی "جابر"دا -پێش مردنی پێغەمبەر(ﷺ) بە یەك مانگ: ئەوانەی لەسەر زەوی زیندوون-لەو کاتەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو فەرموودەی فەرموو- تەمەنی زیاتر لە سەد درێژ نابێتەوە، هەندێ لە هاوەڵان پەییان بەو سنووردارکردنە نەبرد بوو کە تایبەتە بەوانەی "ئەمڕۆ" لەسەر پشتی زەوین، بۆیە گومانیان برد ڕەهایە بۆ هەموان و دوای سەد ساڵی تر دونیا کۆتایی پێ دێت، بۆیە ئیبن عومەر لەسەر سنووردارکردنەکە لە فەرموودەکەی پێغەمبەردا(ﷺ) ئاگاداری کردنەوە و ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) مەبەستی بووە بۆی ڕۆشن کردنەوە، لە ریوایەتەکەی "**الطبري**"دا عەلی کوڕی ئەبی تالبیش(خوا لێی رازی بێت) هەمان کاری ئەنجام دا.

زانایان شوێنی تەمەنی دوایین هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) کەوتن بینییان دوایین هاوەڵ بریتی بوو لە "**أبو الطفيل عامر بن وائلة**" کە ساڵی سەد و دەی کۆچی وەفاتی کردووە،

ئەوەش سەد ساڵ دەكات لە وتنی فەرموودەكەی پێغەمبەرەوە(ﷺ)، بۆیە فەرموودەكە موعجیزەیەكە لە موعجیزەكانی پێغەمبەر(ﷺ).

ئیبن حەجەر لە "فتح الباري"دا دەڵێت: ((ئیبن عومەر لەم فەرموودەدا مەبەستەكەی پێغەمبەری(ﷺ) رۆشن كردەوە كە دوای كۆتاهاتنی سەد ساڵی تر لە فەرموودەكەی ئەو قەرنە(ئەو نەوەیە).

هیچ كامیان-كە لە كاتی وتنی فەرموودەكەدا لە ژیاندا بوون- لەسەر رووی زەوی نامێنن، ئەوەش بە شوێنكەوتنی رووداوەكان بەو جۆرە دەرچوو.

ئیمامی مسلم بە چەندین رێگە فەرموودەكەی هێناوە، لە یەكێك لە رێگاكانەوە لە جابرەوە، دەفەرموێت: ((هەر نەفسێك كە "ئەمرۆ" هەناسە دەدات سەد ساڵ بەسەریدا گوزەری كرد لەو رۆژگارەدا بە زیندووی نەماوە)).

**فەرموودەی دووەم:**

**((هەر كەس هەموو رۆژێك بەیانیان حەوت دەنك خورما لە عەجوە بخوات نە ژەهر و نە سیحر ئەو رۆژە تا شەو زیانی پێ ناگەیەنێت))**

ئەم فەرموودەیە بوخاری لە كیتابی "الطب"دا تەخریجی كردووە، بە هەمان شێوە "مسلم"، ئەحمەدیش لە سەعدی كوڕی ئەبی وەقاسەوە(خوا لێی رازی بێت) تەخریجی كردووە، زانایان قسەی زۆریان لەسەر كردووە:

هەیانە ئەم فەرموودەیەی تایبەت كردووە بە خورمای مەدینە وەك كاركردن بە فەرموودەكەی مسلم.

هەروەها ریوایەتێكی تری مسلم لە عائشەوە(خوا لێی رازی بێت) لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: ((ئەم عەجوەیە شیفایەكەی بالآیە)).

**دەڵێن:** ئەوەش بە كاریگەری بەرەكەتی پێغەمبەر(ﷺ) و بەرەكەتی دەستی پڕ بەخشندەیی ئەو، چونكە خورمای عەجوە لەو خورمانەیە پێغەمبەر(ﷺ) لە مەدینە ناشتنی.

هەیانە دەڵێت: ئەو فەرموودەیە دەربارەی هەموو عەجوەیەکە، چونکە بەهۆی ساردی زۆریەوە ژەهر ناهێڵێت، گەر بەیانیان بەردەوام بێت لە خواردنی عەجوە گەرمی بەسەریدا زاڵ دەبێت، ئەوەش بەرگری لە ساردی ژەهر دەکات.

ئەوەی هەموو لایەك پێی رازین تایبەت کردنییەتی بە عەجوەی شاری مەدینە، لەوانە ئیبن قەیم لە **"زاد المعاد"**دا.

دەربارەی **"سحر"**یش لە فەرموودەکەدا: سیحر نەخۆشییەکی دەروونییە، و پێویستی بە چارەسەرێکی دەروونییە، ئاماژەی دەروونی کاریگەری گەورەی هەیە لە شیفای نەخۆشەکاندا، گەر عەجوە خۆراکێکی بەسوود بێت بۆ جەستە و بونیادی مرۆڤ بەهێز بکات و بکوژی کرم و زیندەوەرە زیانبەخشەکان بێت و ببێتە هۆی تیابردنی بۆگەنی پاشەڕۆکان و لە عەجوەی مەدینە بێت(شاری پێغەمبەری خودا(ﷺ)) گومانم نییە ئەوە کاریگەرییەکی گەورە و باش لە نەفسی کەسی سیحرلێکراودا بەجێدەهێڵێت، زانستی پزیشکی کاریگەری ئەندێشە و وەهم و ئاماژەی دەروونی بۆ زۆرێك لە نەخۆشییەکان سەلماندووە، ئایا ئەمە بەس نییە بۆ ئەوەی پەلە نەکەین لە بەدرۆ دەرکردنی فەرموودەکە گەر بەم جۆرە ماقووڵییەتی تێدا بێت؟

**فەرموودەی سێیەم:**

**((کومئە[1] لە گەزۆیە، ئاوەکەی شیفایە بۆ چاو و عەجوە لە بەهەشتەوەیە و شیفایە بۆ ژەهر)).**

ئەم فەرموودەیە **"الترمذي"** لە ئەبو هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت) ریوایەتی کردووە و ئیمام ئەحمەدیش لە مەسنەدەکەیدا لە سەعیدی کوڕی زەیدەوە ریوایەتی کردووە، دانەری کتێبی **"فجر الإسلام"** دەڵێت: ((ئایا رۆیشتن ئەزموونی کومئە بکەن، ئایا تریاق(دژە ژەهر)ی تێدایە؟ بەڵێ وتوویانە ئەبو هورەیرە سێ یان پێنج یان حەوت کومئەی هێناوە و لە دەفرێکدا قەتراندوونی و چاوی جاریەیەکی پڕمووشی پێ رشتووە

[1] (رووەکێکی ژێر زەوییە وەك دۆمبەڵانی لای خۆمان).

و چاکبووەتەوە، بەڵام ئەمە بەس نییە بۆ دروستی فەرموودەکە، چونکە ئـەزموونێکی بەشەکی لە رووی مەنتقییەوە بۆ سەلماندنی دەرمانێـك بـەس نییـە، بـەڵکو رێگەکـە ئەوەیە چەندین جار تاقیان بکردبایەتەوە، باشتریش لەمە ئەوەیە لە تاقیگەدا شیکاری بۆ بکرێت بۆ ئەوەی توخمەکانی بزانرێت، گەر شیکاری لەو چاخەدا دەستەبەر نەبووبێت با ئەزموون بکرابایە و بەدواداچوونی بۆ بکرابا، ئەم شێوەیە رێگەیەك بوو بۆ ناسـینی فەرموودەکە و جیاکردنەوەی راستی لە هەڵبەستن))[1].

**لێرەدا دوو خاڵ هەیە:**

**یەکـەم:** ئـەم فەرموودەیـە لـە دوو سـەحیحەکە و کتێبـەکانی تـردا جێگیرکـراوە، سەنەدەکەی سەنەدێکی تۆکمە و بەهێزە و هیچ کەس لە راوییەکان تانەلێدراو نین.

**دووەم:** ئەبو هورەیرە ئەزموونی فەرموودەکەی کرد و بینی سەحیحە و کەسانی تریش لەدوای ئەو ئەزموونیان کردووە و بە هەمان سەرئەنجامی دروسـت گەیشـتوون، ئـەوە **"النووي"** باس لەوە دەکات یـەکێك لـە زانایـانی هاوچـەرخی ئـەو کـوێر بووبـوو و چاوەکانی لەدەستدابوو، چاوی بە ئاوی کومئـە رشـت و شـیفای بـۆ هـات، پزیشـکە موسـڵمانەکان لێکۆڵینـەوە و تاقیکارییـان لەسـەر کـردووە و دانیـان بـە دروسـتی فەرموودەکەدا ناوە، ئیبن قەیم لە کتـێبی **"الهـدی النبـوي"**دا دانپیادانـانی پزیشـکە بەناوبانگەکانمان بۆ باس دەکات کە ئاوی کومئە چاو رۆشن دەکاتەوە، لەوانە پزیشکی مەسیحی و ئیبن سینای تێدایە.

**فەرموودەی چوارەم:**

**ئیبن عومەر لە پێغەمبەری خوداوە**(ﷺ) ریوایەتی کردووە فـەرمووی: **((هـەر کـەس سەگ رابگرێت جگە لە سەگی راو و ئاژەڵ هەموو رۆژێـك دوو قـیرات لـە پاداشـتی کەم دەکاتەوە)) وترا بە ئیبن عومەر: ئەبو هـورەیرە "یـان سـەگی کشـتوکاڵ"ی بـۆ ریوایەتەکە زیاد کردووە، ئیبن عومەر وتی: ((ئەبو هورەیرە کشتوکاڵی هەیە)).**

---

[1] ضحى الإسلام: ١٣١/٢.

خاوەنی کتێبی **"ضحی الإسلام"** لەدوای ئەوە دەڵێت: ئـەم رەخنەلێگرتنــە لــە ئــیبن عومەرەوە لەسەر پاڵنەری دەروونی رەخنەیەکی زۆر وردە [1].

مەبەستی ئەوەیە ئیبن عومەر ئەبو هورەیرە تۆمەتبار دەکات بە زیـاد کردنــی "یـان سەگی کشتوکاڵ" بۆ فەرموودەکە، چونکە ئەبو هورەیرە خاوەنی کشتوکاڵ بووە، بۆیە ئەوەی بـۆ فەرموودەکـە زیـاد کـردووە تـاکو ببێـت بـە پاسـاو بـۆ سـەگڕاگرتن بـۆ کشتوکاڵەکەی.

فەرموودەکەی ئەبو هـورەیرە بوخـاری تـەخریجی کـردووە، بـەبێ قسـەکردن لەسـەر قسەکەی ئیبن عومەر، هەر بەو جۆرە **"الترمذي"** ریوایەتی کردووە و باسی قسـەکەی عەبدوڵای کوڕی عومەر و عەبدوڵای کوڕی مغەفەل و کەسانی تر دەکات، "مسلم"یش ریوایەتی کردووە و باسی قسەکەی ئیبن عومەر دەکات، پاشان هەنـدێ ریوایـەتی تـر دەهێنێت دەیسەلمێنێت هەندێ راوی تر لە ئیبن عومەرەوە ئەو فەرموودەیان گێڕاوەتەوە زیادەکـەی ئـەبو هورەیرەیـان تێدایـە، واتــە ئـەبو هـورەیرە بـەو ریوایەتـە تـەنها نەکەوتووەتـەوە، بـەڵکو کەسـانی تـریش هـەروەکو ئـەو ریوایـەتیان کـردووە و لـە پێغەمبەری(ﷺ) خودایان بیستووە.

راڤەکەرانی فەرموودەکە باسی ئەو زیادەی ئەبو هورەیرەیان کردووە و مەبەسـتەکەی ئیبن عومەریان لە قسەکەی دەربارەی ئەبو هورەیرە رۆشن کردووەتەوە.

**"النووی" لەسەر قسەکەی ئیبن عومەر(ئەبو هورەیرە کشتوکاڵی هەیە) دەڵێت:** ئەمــە بەسووك و لاواز تەماشاکردنی ریوایەتەکەی ئەبو هورەیرە نییە و شك خسـتنە سـەری قسەکەی ئەبو هورەیرە ناگەیەنێت، بەڵکو ماناکەی ئەوەیە لەبەر ئەوەی ئەبو هـورەیرە خاوەنی کشتوکاڵە گرنگی بە فەرموودەکە داوە و لەبەری کـردووە و وردەکـاری تێـدا بەکارهێناوە، نەرێت وایە کەسی تووشبوو بە شتێك لە خەڵکی زیاتر وردەکـاری تێـدا بەکاردەهێنێت، حوکمەکانی لە خەڵکانی تر زیاتر دەزانێت..

---

[1] ضحی الإسلام ٢/١٣١-١٣٢.

**پوختەی قسان** ئەوەیە ئەبو هورەیرە بەم ریوایەتە تەنها نەکەوتووە بەڵکو دەستەیەك لە هاوەڵان تەبان لەگەڵی لە ریوایەتکردنی لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ)، گەر ئەبو هورەیرەش تەنها بکەوتبایە هەر قبووڵ و رەزامەند و رێزلێگیراو بوو)).

ئەمە بریتییە لە دۆخی دروستی فەرموودەکە، ئیبن عومەر چۆن تۆمەتێکی لەو جۆرە دەداتە پاڵ ئەبو هورەیرە لە کاتێکدا دانی بەوەدا ناوە ئەبو هورەیرە لە هەموان زیاتر فەرموودەی پێغەمبەری(ﷺ) لەبەرکردووە.

## کارکردن بە هەواڵی ئاحاد:

دانەری کتێبەکە باس لەوە دەکات: ((زانایانی فەرموودە فەرموودەیان بۆ دوو بەش دابەش کردووە:

**متواتیر:** ئەوەیە یەقین دەگەیەنێت، بەڵام بوونی نییە، هەندێکیش دەڵێن: تەنها یەك فەرموودە بوونی هەیە، هەندێکیش گەیاندوویانەتە حەوت.

**ئاحاد:** ئەوەیە گومان دەبەخشێت، کارکردن پێی شیاوە(گونجاوە) لەباری پارسەنگکردنی صدق تیایدا...هتد)).

ئەم قسەیە دەبێت لەسەری بوەستین، ئەوانەی لە ژمارەی متەواتیردا جیاوازیان لە نێواندایە دیدگایان جیاوازە، وەك **"السیوطي"** هێناویەتی، ئەگینا فەرموودەی متەواتیر زۆرن و لە یەك و دوو و حەوتدا کورت نابنەوە.

فەرموودەی ئاحادیش زانایانی فەرموودە هاوڕان لەسەر کارکردن پێی، جمهووری موسڵمانان-جگە لە شیعەی توندڕەو- کارکردن بە فەرموودەی ئاحاد بە پێویست دەبینن گەر رێگەکەی(سەنەدەکەی) دروست بوو، هەشیانە باوەڕ پێ بوونی بە پێویست دەبینێت، واتە زانست(یەقین) و کارپێکردنی بە پێویست دەبینن، ئەوەی مامۆستا(ئەحمەد ئەمین) باسی دەکات کارپێکردنی شیاوە(گونجاوە) یان لە نەبوونی ئاگاهی و مەعریفەوەیە کە نەزانی بە ئەوەوە پەیوەست دەکات، یان لە زانستەوەیە و شێواندن بۆ ئەو پێویست دەکات و ئەگەری سێیەم بوونی نییە.

# دەربارەی ئەبو هورەیرە(خوا لێی رازی بێت)

## ناو و کونیەکەی:

لەسەر ناوی خۆی و باوکی جیاوازی هەیە، تا نزیکەی چل و چوار قسە لەسەری، ئیبن حەجەر بۆ سێ قسە کورتیان دەکاتەوە:

بەناوبانگترینیان ئەوەیە لە نەفامیدا پێی دەوترا: عبد شمس بن صخر، کاتێک موسڵمان بوو پێغەمبەر(ﷺ) ناوی نا عبدالرحمن، سەر بە قەبیلەی "دەوس"ە و دایکی ناوی "أميمة بنت صفيح بن الحارث دوسية"یە.

هۆی ئەوەی کونەیەکەی بە ئەبو هورەیرە هاتووە ئەوەیە کە "الترمذي" لە ئەبو هورەیرەوە باسی دەکات: کاتی خۆی مەڕ و ماڵاتی خزم و خانەوادەکەم دەلەوەڕاند، پشیلەیەکی بچووکم هەبوو، شەوان لەسەر درەختێك دامدەنا، کە رۆژ دەبوویەوە لەگەڵ خۆم دەمبرد و یاریم پێ دەکرد، بۆیە کونیەکەیان کردم بە ئەبو هورەیرە.

## ئیسلامبوون و هاوەڵی کردنی:

ساڵی حەوتی کۆچی موسڵمان بووە لە نێوان حودەیبییە و خەیبەردا، ئەو کات تەمەنی سی ساڵ بووە، پاشان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە بۆ مەدینە و لە "الصفة"[1] نیشتەجێ بوو، لەو کاتەوە بەتەواوی پەیوەست بوو بە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) و بۆ هەر شوێنێ بچووبایە لەگەڵی دەڕۆیشت، زۆر جار لەگەڵی دەخوارد تا پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد.

## زوهد و عیبادەت و وەرعی ئەبو هورەیرە:

بوخاری لە ئەبو هورەیرەوە تەخریجی کردووە فەرموویەتی: ((سوێند بە خودای تاك و تەنها لەسەر زەوی بە جگەرمەوە لە برساندا تەپاوتلم دەکرد و بەردم لەسەر سکم دەبەست)).

[1] (شوێنێك بوو لە مزگەوتەکەدا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆ هەژارانی کۆچکەرانی ئامادە کرد بوو).

هەروەها دەڵێت: ((منت دەبینی لە نێوان مینبەری پێغەمبەر(ﷺ) و ژوورەکەی عائشەدا کەوتبووم(أصرع) و دەوترا: شێتە، بەڵام هیچ شێتێتیم پێوە نەبوو، تەنها برسیم بوو)).

ئەوانەی دەڵێن: ئەبو هورەیرە فێدار بووە لەبەر وشەی **"أصرع"** ئەبو هورەیرە بۆخۆی لێکدانەوەی بۆ **"أصرع"** کرد و دەڵێت تەنها برسێتی زۆر تەنگەتاوی کرد بوو، نەك فێی لێهاتبێت.

دەربارەی عیبادەتی ئەبو هورەیرە ئیبن حەجەر لە جەریرییەوە لە **"أبي نضرة"**ەوە لە پیاوێك لە **"الطفاوة"**ەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: بووم بە میوانی ئەبو هورەیرە هیچ پیاوێکی هاوەڵانم نەبینیوە بە ئەندازەی ئەو -لە عیبادەتدا- لێبڕاو بێت و بە ئەندازەی ئەو خزمەتی میوانی بکات.

## لەبەرکردن و هێزی یادەوەری:

بەهۆی پەیوەستبوونی بە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) بە پەیوەستبوونێکی تەواو ئاگاهی بە کۆمەڵێك شت هەبوو هاوەڵانی تر نەیانبوو دەربارەی گوفتار و کرداری پێغەمبەری خودا(ﷺ)، کاتێك موسڵمان بوو لەبەرکردنی خراپ بوو، سکاڵای ئەو حاڵەی بردە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: پۆشاکەکەت بکەرەوە و رایبخە، پاشان پێی فەرموو: بیگوژە بە سینەتدا، ئەویش گوشی بە سینەی خۆیدا، لەدوای ئەوە هیچ قسەیەکی لەبیر نەچووە.

ئەم چیرۆکە(چیرۆکی کردنەوەی پۆشاك) ئیمامانی فەرموودە لەوانە بوخاری و مسلم و ئەحمەد و **"النسائي و أبو يعلى و أبو نعيم"** ریوایەتیان کردووە.

ئەوەی **"گۆڵد تسیهر"** دەیڵێت: گوایە ئەو چیرۆکە هەڵبەستراوە و خەڵکی رەشۆکی هەڵیانبەستووە بۆ پاساودانی ئەو فەرموودە زۆرانەی باسی کردووە تەنها درۆ و بوختانێکی گەورەیە و ئەندێشەکردنێکە زانست پاساوی نادات و دەمارگیرییەکە یەهودی بوونەکەی وەحی بۆ کردووە.

**سەنای هاوەڵان و شوێنکەوتووان و ئەهلی زانست لەسەر ئەبو هورەیرە:**

**تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا دەفەرموێت:** گومانم نییە لەوەی ئەبو هورەیرە شتانێکی لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) بیستووە ئێمە نەمانبیستوون.

**ئیبن عومەر دەڵێت:** ئەبو هورەیرە لە من چاکتر و باشترە و زاناترە بەوەی دەیگێڕێتەوە.

**پیاوێك هات بۆ لای زەیدی کوڕی سابیت پرسیاری لێ کرد** زەید پێی وت: بچۆ بۆ لای ئەبو هورەیرە، من و ئەبو هورەیرە و فلان لە مزگەوت بووین دوعامان دەکرد و یادی خودامان دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لامان و لەگەڵمان دانیشت و فەرمووی: بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی لەسەری بوون، زەید دەفەرموێ: من و هاوەڵەکەم دەستمان بە دوعا کرد و پێغەمبەر(ﷺ) ئامینی بۆ دوعاکەمان دەکرد، ئەبو هورەیرە دوعای کرد و وتی: خودایە، من داوای ئەوەت لێ دەکەم ئەو دوو هاوەڵەم داوایان لێکردی، هەروەها داوای زانستێکت لێ دەکەم لەبیرم نەچێتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئامین، زەید و هاوەڵەکەی وتیان: ئێمەش ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) داوای زانستێك دەکەین لەبیرنەچێتەوە، فەرمووی ئەو گەنجە دووسییە پێشتان کەوت.

**عومەر دەفەرموێت:** تۆ لە هەموومان زیاتر پەیوەستبووی بە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) و لە هەمووومان زیاتر فەرموودەکانت لەبەر دەکرد.

ئوبەی کوڕی کەعب دەڵێت: ئەبو هورەیرە بوێر بوو بۆ پرسیارکردن لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەربارەی کۆمەڵێك شت کە کەسانی تر جگە لە ئەو نەیان دەپرسی.

**شافیعی دەفەرموێت:** ئەبو هورەیرە لە سەردەمی خۆیدا لە هەمووان زیاتر فەرموودەی لەبەربووە و ریوایەتی کردووە.

**بوخاری دەڵێت:** ئەهلی زانست نزیکەی هەشتسەد فەرموودەیان لێوە باس کردووە و لە سەردەمی خۆیدا لە هەموان زیاتر فەرموودەی لەبەر بووە و ریوایەتی کردووە.

**سەعیدی کوڕی ئەبی حەسەن(برای حەسەنی بەصری) دەڵێت:** هیچ کام لە هاوەڵان بە ئەندازەی ئەبو هورەیرە فەرموودەی زۆر نەبووە.

**ئەوانەی فەرموودەی لێوە باسکردوون و ئەوانەی فەرموودەیان لێوە ریوایەت کردووە:**

**لە زۆرێك لە هاوەڵانەوە فەرموودەی ریوایەت کردووە لەوانە:** ئەبوبەکر و عومەر و فەزڵی کوڕی عەباس و ئوبەی کوڕی کەعب و ئوسامەی کوڕی زەید و عائشە(خوایان لێ رازی بێت)، هەروەها دەستەیەك لە هاوەڵان لە ئەوەوە فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، لەوانە: ئیبن عومەر و ئیبن عەباس و جابر و ئەنەس و وائیلەی کوڕی ئەسقەع.

**لە شوێنکەوتووان** سەعیدی کوڕی موسەیب کە مێردی کچەکەی بوو[1]، و عەبدوڵای کوڕی سەعلەبە و عوروەی کوڕی زوبەیر و قەبیصەی کوڕی زوئەیب و سەلمانی ئەغەڕ و سولەیمانی کوڕی یەسار و عەراکی کوڕی مالیك و سالمی کوڕی عەبدوڵای کوڕی عومەر و ئیبن سیرین و عەتای کوڕی ریباح و عەتای کوڕی یەسار و ئەبو سەلەمە و حومەید[2].

**زۆرێکی تر لە شوێنکەوتووان کە وەك بوخاری دەڵێت:** گەیشتوونەتە هەشتسەد کەس لە ئەهلی زانست و فیقهـ ریوایەتیان لێوە باس کردووە، ئەو گواستنەوە و باوەڕبوونە بە فەرموودەکانی بریتییە لە هەشتسەد بەڵگە لەسەر گەورەیی و راستگۆیی ئەو(خوا لێی رازی بێت).

## نەخۆشی و مردنی:

**ئیبن ئەبی دونیا بە سەنەدێکی سەحیحەوە لە ئەبی سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمانەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت:** چووم بۆ لای ئەبو هورەیرە ئازاری زۆر بوو بۆیە لە ئامێزم گرت و وتم: خودایە، شیفای ئەبو هورەیرە بدەی، ئەویش وتی: خودایە دوعاکەی وەرمەگرە- دوو جار- پاشان وتی: گەر توانیت بمریت بمرە، سوێند بەو خودایەی نەفسی ئەبو هورەیرەی بە دەستە رۆژگارێك بەسەر خەڵکیدا دێت کەسێك بە پاڵ گۆڕی براکەیدا گوزەر دەکات و ئاوات دەخوازێت لە جێگەی ئەو بوایە.

لە تەمەنی حەفتا و هەشت یان حەفتا و نۆساڵیدا لە مەدینە کۆچی دوایی کردووە.

---

[1] (واتە ئەبو هورەیرە کچی سەعیدی کوڕی موسەیبی خواستبوو).

[2] (دوو کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف بوون).

## شوبهەی نووسەری "فجر الإسلام" لەسەر ئەبو هورەیرە:

**یەکەم:** لە هاوەڵان وەك ئیبن عەباس و عائشە(خوایان لێ رازی بێت) هەندێ فەرموودەیان رەد کردووەتەوە و بەدرۆیان خستووەتەوە.

**دووەم:** فەرموودەی نەنووسیوە، بەڵکو لە ریوایەتکردندا شانی لەسەر زەین و یادەوەری خۆی داداوە.

**سێیەم:** ئەو بەوەوە نەوەستاوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) بیستوویەتی بەڵکو ئەوەش لە کەسانی ترەوە بیستوویەتی لە فەموودە دەیگێڕایەوە وەك ئەوەی خۆی بیستبێتی.

**چوارەم:** هەندێ لە هاوەڵان رەخنەی زۆریان لێگرتووە و سکاڵایان هەبووە لە صدقی.

**پێنجەم:** حەنەفییەکان فەرموودەکانی رەد دەکەنەوە گەر بەرهەڵستی پێوانە(قیاس) بکەن، چونکە دەڵێن ئەو فەقیە نەبوو.

**شەشەم:** دانەرانی فەرمووده زۆری فەرموودەکانی ئەویان بە هەلزانیوە بۆیە زۆرێك لە فەرموودەیان بە ناوی ئەوەوە هەڵبەستووە.

**دانە بە دانە وەڵامی ئەمانە دەدەینەوە و هەڵەکانیان دەخەینە روو.**

### ١-رەدی هەندێ لە هاوەڵان لەسەر ئەبو هورەیرە(خوا لێی رازی بێت):

دانەری کتێبەکە دەڵێت: ((ئەبو هورەیرە فەرموودەی: ((هەر کەس جەنازەیەك هەڵدەگرێت با دەستنوێژ بگرێت)) ریوایەتکردووە، ئیبن عەباس هەواڵەکەی وەرنەگرتووە و وتوویەتی: دەستنوێژمان لەسەر نییە لە هەڵگرتنی داری وشکدا.

هەر بەو جۆرە ئەبو هورەیرە فەرموودەیەکی تر دەگێڕێتەوە کە لە دوو سەحیحەکەدا هاتووە: ((گەر یەکێك لە ئێوە لە خەو بەئاگا هات با دەستی بشوات بەر لەوەی بیخاتە ناو دەفرەکەوە، چونکە کەسێك لە ئێوە نازانێت دەستی خۆی لە کوێ داناوە)) عائشە لێی وەرنەگرتووە و وتوویەتی: ئێمە چی بکەین و چۆن بکەین لەگەڵ "دەفر"؟

دانەری کتێبەکە ئەم دوو رووداوە دەگێڕێتەوە و دەیانکاتە بەڵگەی ئەوەی هاوەڵان هەندێکیان رەخنەیان لە هەندێکی تریان گرتووە.

هەموو ئەوەی لە نێوان هاوەڵاندا روویداوە لە قسەی هەندێکیان لەسەر هەندێکی تریان گفتوگۆیەکی زانستی رووت بووە، لەسەر جیاوازی دید و تێڕوانین و جیاوازی ئاستی پلەی ئیجتیهاد و هەڵهێنجانیان بیناکراوە، یان لەسەر لەبیرچوونەوەی فەرموودەیەك کە ئەویتریان بەبیری دەهێنێتەوە، ئەوە لە شك یان گومان یان بەدرۆزانینی یەکترەوە سەریهەڵنەداوە، بۆیە دەبێت لەم گۆشەنیگاوە تەماشای گفتوگۆی ئەبو هورەیرە و کەسانی تر لە هاوەڵان بکرێت و دروست نییە هەڵبدرێتە سەر شتێکی تر، چونکە ئەوان یەکتریان بەڕاست دەزانی، بەتایبەت ئەبو هورەیرە.

**فەرموودەی یەکەم:** ((**هەر کەس جەنازە هەڵدەگرێت با دەستنوێژ بگرێت**)) و رەدەکەی ئیبن عەباس لەسەر ئەبو هورەیرە، قسە لەسەری لە چەند روویەکەوە:

**یەکەم:** هیچ سەرچاوەیەکم لە کتێبی فەرموودە و کتێبی فیقهی بۆ ئەو فەرموودەیە-بەو شێوەی ئەو هێناویەتی- نەبینییەوە و باسی ئەو رووداوە نەکراوە ئیبن عەباس بەرپەرچی ئەبو هورەیرەی دابێتەوە، گەر فەرموودەکە و رووداوەکە جێگیربوونایە دەقەکەیان لەسەری پشتگوێ نەدەخست، بەڵێ، هەندێ لە زانایانی ئوسوڵ باسیان کردووە-لەناویان خاوەنی **"مسلم الثبوت"**- ئەوانە(واتە زانایانی ئوسوڵ) دەستەیەکن هەندێکیان لە هێنانی هەندێ فەرموودەدا کە ئەسڵیان نییە خەمساردی دەنوێنن، یان ئەسڵێکی هەیە لە رێگەیەکی لاوازەوە، چونکە فەرموودە لە پسپۆڕی ئەوان نییە.

**دووەم:** ئەوەی هەیە لە هەندێ سەرچاوەی فەرموودەدا ئەوە نییە ئەو هێناویەتی.

**"الترمذي"** لە ئەبی هورەیرەوە-بە بەرزکراوەیی- تەخریجی کردووە: ((لە غوسڵ دەرکردنی مردوو دەبێ غوسڵ بکات، هەر کەسیش هەڵیدەگرێت دەستنوێژ دەگرێتەوە))، **"الترمذي"** دەڵێت: لەم دەروازەیەدا فەرموودە هەیە لە عەلی و عائشەوە(خوایان لێ رازی بێت).

هەروەها دەڵێت: فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە فەرموودەیەکی حەسەنە.

لای مالیك و شافیعی ئەو کەسەی غوسڵی مردوو دەکات غوسڵی بۆ خۆی "مستحب"ە، ئەحمەد دەفەرمویت: رجام وایە غوسڵی لەسەر "واجب" نەبێت.

ئەوەی دەردەکەوێت ئەوەیە ئەبو هورەیرە بە گێڕانەوەی ئەو فەرموودە تەنها نەکەوتووە، بەڵکو عەلی و عائشەش ریوایەتیان کردووە، هەروەها شوێنەوارێك بۆ رەدی ئیبن عەباس نابینرێتەوە.

**سێیەم:** لەبارێکدا وا دابنێین رووداوەکە دروستە و ئیبن عەباسیش رەدی داوەتەوە، ماناکەی بەدرۆخستنەوە و تانەلێدان نییە، بەڵکو ئەوە جیاوازییەکە لە تێگەیشتن لە فەرموودەکە و فیقهی فەرموودەکە، ئەبو هورەیرە دەستنوێژ بە "واجب" دەبینێت، ئیبن عەباس پێی وایە "واجب" بوون بە مەبەست نەگیراوە.

**فەرموودەکەی دووەم:** کە بریتییە لە: ((**هەر کات یەکێك لە ئێوە لە خەو بەئاگا هات...**)) فەرموودەیەکی سەحیحە لە دوو سەحیحەکەی "بوخاری و مسلم" و کەسانی تردا لە خاوەنی سەحیحەکان، لە ئیبن عومەر و جابر و عائشەوە ریوایەت کراوە.

رەدی عائشە و وتنی: "چی بکەین لە دەفر؟ ئەمە لە کتێبەکانی فەرموودەدا دروست نییە و باسیش نەکراوە، بەڵکو ئەوەی "**ابن العربي و الحافظ الولي العراقي**" لە "**طرح التثريب شرح التقريب**"دا لە "**البيهقي**"ەوە رایدەگەیەنن ئەمەیە: ((ئەو کەسەی بەرپەرچی ئەبو هورەیرەی دایەوە بریتییە لە "**قين الأشجعي**" لە هاوەڵانی عەبدوڵای کوڕی مەسعوود(خوا لێی رازی بێت).

هەر بەو جۆرە "**الدار قطني و البيهقي**" لە ئیبن عومەرەوە ریوایەتیان کردووە، پیاوێك پێی وت: ئەی ئەگەر حەزێك بێت؟ ئیبن عومەر لای پەسەند نەبوو نموونە بۆ فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) بهێنێتەوە، ئەو کەسێك بوو زۆر بە توندی شوێنپێی پێغەمبەری خودای هەڵدەگرت))

لێرەدا دەردەکەوێ ئەبو هورەیرە لە گێڕانەوەی فەرموودەکە تەنهانەکەوتووە، بەڵکو ئیبن عومەریش ریوایەتی کردووە، "**الترمذي**"ش باس لەوە دەکات لە عائشەوە(خوا لێی رازی بێت) هەمان فەرموودە گوازراوەتەوە و ئەو کەسەی بەرهەڵستی ئەبو هورەیرەی کردووە بریتی بووە لە "**قين الأشجعي**" نەك ئیبن عەباس و عائشە(خوایان لێ رازی بێت)، "**قين الأشجعي**" کەسێکی تابعی بوو، ئیبن مەندە دەڵێت لە هاوەڵان بووە.

### ٢-نەنووسینەوەی فەرمووده لەلایەن ئەبو هورەیرەوە:

ئەوەی فەرموودەی نەنووسیوەتەوە و لەسەر یـادەوەری خـۆی قسـەی کـردووە ئەمـە کارێکە تەنها ئەبو هورەیرە پێی تـەنها نەکەوتووەتـەوە، بـەڵکو کـاری هـەموو ئـەو کەسانەیە فەرموودەیان گێڕاوەتەوە لە هاوەڵانی پێغەمبـەر(ﷺ) جگـە لـە عەبـدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص، ئەو لاپەڕەیەکی خۆی هەبوو تیایدا دەنووسـی، تەنانـەت نووسەر بۆ خۆی دان بەم راستییەدا دەنێت و دەڵێت: هەرچـۆنێك بێـت چـاخی یەکـەم تێپەڕی و تۆمارکردنی فەرمووده باو و بەربڵاو نەبوو، بـەڵکو بـە دەمـاودەم و لەبـەر دەیانگێڕایەوە، ئەو کەسەش تۆماری دەکرد بۆ خۆی دەینووسییەوە))[١].

### ٣- گێڕانەوەی فەرمووده بەبێ ئەوەی لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) بیستبێتی:

ئەوەش گوایە ئەبو هورەیرە بـەوەوە نەوەسـتاوە لـە پێغەمبـەرەوە(ﷺ) بیسـتوویەتی بەڵکو ئەوەش لە کەسانی ترەوە بیستوویەتی لـە فـەمووده دەیگێڕایـەوە وەك ئـەوەی خۆی بیستبێتی.

بۆ نموونە ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە: ((هەر کەس بە لەشگرانی بەیانی لـێ بێتـەوە رۆژووی بۆ نییـە)) عائشـە بەرپەرچـیدایەوە و وتـی: پێغەمبـەر(ﷺ) بەرەبـەیانی لـە رەمەزاندا بەسەردا دەهات و لاشەی گران بوو-بەبێ ئەوەی ئیحتیلام بوو بێـت- بۆیـە خۆی دەشۆری و بەڕۆژوو دەبوو، کاتێك ئەوە باسکرا بۆ ئەبو هورەیرە وتی: ئەو زاناترە لە من، من لە پێغەمبەری خودام(ﷺ) نەبیست، بـەڵکو فـەزڵی کـوڕی عـەباس لێـی بیست بوو))[٢].

**قسە لەسەر ئەم بابەتە لە دوو رووەوە:**

**یەکـەم:** دانەپاڵی فەرمووده بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) لەلایەن هاوەڵێکەوە کە لە خـودی پێغەمبەری(ﷺ) نەبیستبێت ئەبو هورەیرە پێی تـەنها نەکـەوتووە، بـەڵکو هـاوەڵانی

[١] ص٢٧٢.
[٢] ص٢٦٩.

گەنج و ئەوانەی ئیسلامیان دواکەوت هەمان کاریان ئەنجامداوە، وەك عائشە و ئەنەس و **"البراء"** و ئیبن عەباس و ئیبن عومەر، هەموو ئەمانە فەرمووودەیان داوەتە پاڵ پێغەمبەر(ﷺ) کە لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) بیستوویانە، ئەوەش لەبەر ئەوەی دادپەروەری و صدقی هاوەڵان لەلایان ساغ بووبوویەوە.

ئیبن عەباس ریوایەتی ئەو فەرموودەی کردووە **"إنما الربا في النسيئة"**، کاتێك لەو بارەیەوە بۆ لای گەڕانەوە فەرمووی: ئوسامەی کوڕی زەید هەواڵی پێدام.

ئەم شێوازە لە گێڕانەوەی فەرموودە زانایان بە **"مرسل الصحابي"** ناوزەدیان کردووە، هەموو کۆدەنگیان هەیە لەسەر بەڵگەپێهێنانەوەی و حوکمەکەی حوکمێکی بەرزکراوەیە.

هەڵبەت جگە لە **"أبو إسحاق الإسفراييني"** کە دەڵێت: ئەگەری هەیە هاوەڵەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لە شوێنکەتوویەکەوە(تابعی) فەرموودەکەی گێڕابێتەوە، ئەمەش قسەیەکی رەد کراوەیە و ئەوەندە بەسە ئەهلی فەرموودە و ئوسولّ کۆدەنگیان لەسەر پێچەوانەی ئەو قسەی ئەو هەیە.

**دووەم: ئەو فەرموودەی دانەری کتێبەکە هێناویەتی وەك بەڵگەیەك بۆ قسەکەی لە چەند روویەکەوە:**

**(یەکەم)** کتێبە سەحیحەکان لەسەر فەرموودەکە باسی ئینکاری عائشەیان نەکردووە، بەڵکو بابەتەکەیان وا باس کردووە پرسیار لە ئەبو هورەیرە کراوە دەربارەی رۆژووی ئەو کەسەی بە لەشگرانی رۆژی لێ دەبێتەوە، ئەویش فتوای بەوە دا رۆژووی بۆ نییە.

لەو بارەیەوە پرسیار لە عائشە و ئوم سەلەمە(خوایان لێ رازی بێت) کرا ، هەردووکیان فتوای دروستی رۆژووەکەیان دا، کاتێك ئەوە بە ئەبو هورەیرە گەیەنرا لە فتواکەی پاشگەز بوویەوە و وتی: ئەوان لە من زاناترن، شوێن و رووداوەکە شوێن و رووداوی فتوایە، هەریەکەیان فتوای بەوە دا کە دەیزانی و لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) بە دروستی دەبینی، بۆیە ئینکار و رەدی عائشەی تێدا نییە.

**لێرەدا دەقی فەرموودەكە لەلای "مسلم" وەك خۆی دەگوێزینەوە:**

لە **"أبي بكر بن عبدالرحمن بن الحارث"**ەوە تـەخریجی كـردووە دەڵێـت: گـوێم لـە ئـەبو هورەیرە بوو لە چیرۆكەكانیدا دەیوت: هـەر كـەس بـە لەشـگرانی رۆژی لـێ بوویـەوە بـا بەرۆژوو نەبێت، منیش ئەوەم بۆ **"عبدالرحمن بن الحارث"**(واتـە بـۆ بـاوكی) بـاس كـرد، ئەویش قسەكەی بەرپەرچدایەوە، بۆیە عبدالرحمن(باوكی) و منیش لەگەڵی دەرچـووین تـا خۆمان گەیاندە لای عائشە و ئوم سەلەمە(خوایان لـێ رازی بێـت) عبـدالرحمن پرسـیاری ئەوەی لێكردن، هەردووكیان وتیان: پێغەمبەر(ﷺ) بە لەشگرانی-بـەبێ ئیحتـیلام- رۆژی لێ دەبوویەوە پاشان بەرۆژوو دەبوو، رۆیشتین تا چووینە لای مەروان ئەوەی بۆ بـاس كـرد، مەروان وتی: داوات لێ دەكەم بچی بـۆ لای ئـەبو هـورەیرە رەدی ئـەوەی وتوویـەتی بـۆ بكەیەوە، ئێمەش هاتین بۆ لای ئەبو هورەیرە-ئەبوبەكری كوڕی عەبـدورەحمان لـە هـەموو ئەمانەدا ئامادە بووە- وتی: عبدالرحمن ئەوەی بۆ باس كرد، ئەبو هورەیرە وتی: ئایـا ئـەو دوانە ئەو قسەیان كرد؟ وتی: بەڵێ، ئەبو هورەیرە وتی: ئـەو دوانـە زانـاترن پاشـان ئـەبو هورەیرە ئەوەی وتبووی دایە پاڵ فەزڵی كوڕی عەباس، و وتی: ئەوەم لە فـەزڵ بیسـت لـە پێغەمبەری خودام(ﷺ) نەبیست، بۆیە پاشگەزبوویەوە لەوەی وتبووی.

**(دووەم)** گەر وا دابنێین عائشە ئینكاری قسەكەی ئەبو هورەیرەی كردووە ئەمە مانای بەدرۆخستنەوەی ئەبو هورەیرە ناگەیەنێت لەوەی ریوایەتی كردووە، بەڵكو مانای ئەوەیە عائشە ئەو حوكمە بەو جۆرە نازانێت بەڵكو پێچەوانەكەی لەلای ئەو ئاشكرایە، بۆیـە ئەمە یەكێكی ترە لە بەهاناچوونەكانی عائشە بۆ هاوەڵانی مەزن، هەروەك چۆن رۆیشت بە هانای عومەر و ئیبن عومەر و عەبدوڵای كوڕی ئەبی بەكر و عەلی و ئیبن مەسعوود و ئیبن عەباس و زەیدی كوڕی سابیت و ئـەبی سـەعیدی خـودری و كەسـانی تـریش، بەردەوام هاوەڵان هەندێكیان بە هانای هەندێكی تریانەوە دەچوون و لە هەڵە و تێكەوتن دەیانپاراستن بەبێ ئەوەی ناوی بەدرۆخستنەوەی لێ بنێن، بەڵكو ئەو كارە بریتی بوو لە راستكردنەوەی زانست و گەیاندنی ئەمانەت، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((هەر كەس زانستێك بشارێتەوە خودا بە لەغاوێك لە ئاگر لەغاوی دەكات))[1].

---

[1] أخرجه أبو داود والترمذي وغيرهما.

**(سێیەم)** زۆربەی ریوایەتەکان باس لەوە دەکەن ئەبو هورەیرە لــەو رووداوەدا فــەرموودەی بــەرز نەکردووەتــەوە بــۆ لای پێغەمبــەر(ﷺ) بــەڵکو فتــوای داوە بــەوەی دەیزانێــت لــە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ)، کەمێك دەڵێن فەرموودەکەی بە بەرزکراوەی باس کردووە.

**(چوارەم) ئیبن حەجەر دەڵێت:** بەو کارە ئەبو هورەیرە لە فتواکەی پاشگەزبوویەوە، جا یان بەهۆی پارسەنگدانی ریوایەتەکەی دوو دایکی باوەڕداران لــە گونجــاوی ئــەو کــارە بەڕاشکاوی بەسەر ریوایەتی کەسانی تردا -لەگەڵ بوونی ئەگەر لە ریوایەتی کەسانی تر جگە لەو دوانە- چونکە گونجاوە ئەو کارە هەڵبدەینە سەر "إستحباب" بــەبێ فــەرز، هەر بەو جۆرە نەهی لە رۆژووی ئەو رۆژە، یان باوەڕی وابووە هەواڵەکــەی دوو دایکــی باوەڕداران(خوایان لێ رازی بێت) نەسخکەری هــەواڵی کەســانی تــرە، ئەمــە ئەوەیــە زۆربەی زانایانی لەسەرە، هەندێ لە شــوێنکەوتووان لەســەر فتواکــەی ئــەبو هــورەیرە رۆیشــتوون وەك "الترمــذي" بۆمــان دەگوێزێتــەوە، پاشــان جیاوازییەکــە هــەڵگیراو و کۆدەنگی چەسپا پێچەوانەی ئەوە وەك "النووي" پێداگری لەسەر دەکات[1].

### ٤-هاوەڵان زۆری فەرموودەیان لێ ئینکار کردووە:

دانەری کتێبەکە دەڵێت: ((هەندێ لە هاوەڵان رەخنەی زۆریان لێگرتووە لەسەر زۆری فەرموودە لە پێغەمبەری خــوداوە(ﷺ) و ســکاڵایان لێــی هــەبووە، وەك چــۆن ئــەوەی "مسلم" ریوایەتی کردووە لە سەحیحەکەیدا ئاماژەی پێ دەکات: ئەبو هورەیرە وتــی: ئێوە پێتان وایە ئەبو هورەیرە فەرموودەی زۆر لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە، پەنا دەگرم بە خودا، پیاوێکی گەدا و هەژار بووم خزمەتی پێغەمبەرم دەکــرد لەســەر تێر کردنی سکم، کۆچکەران سەرقاڵی سەودای بازاڕ بــوون و ســەرخەرانیش ســەرقاڵی هەستان بوون بە کاروباری ماڵ و سامانیان.

لە فەرموودەیــەکی تــری "مســلم"دا ئــەبو هــورەیرە وتــی: دەڵــێن: ئــەبو هــورەیرە فەرموودەی زۆر دەڵێت، پەنا دەگــرم بــە خــودا، هــەروەها دەڵــێن: بــۆ کۆچــکەران و

[1] فتح الباري ٤/١١٨.

سەرخەران وەك ئەو فەرموودەی زۆر ناگێڕنەوە؟ من هەواڵی ئەوەتان پێ دەدەم: براکانم لە سەرخەران خەریکی زەوی و زاریان بوون، براکانم لە کۆچکەران سەرقاڵی سەودای بازاڕ بوون، من لەسەر تێرکردنی سکم پەیوەستبووم بە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ)، کاتێك ئەوان بزر و نادیار بوون من ئامادە دەبووم، کاتێك ئەوان لەبیریان دەچوو من لەبەرم دەکرد))[1].

لە دوای مردنی پێغەمبەر(ﷺ) پرسیار کردن دەربارەی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر بوو، هاوەڵان بڵاوەیان کرد بوو بە وڵاتاندا، بۆیە وەك گەیاندنی ئەرك و ئەمانەتێك و نەشاردنەوەی زانست هەستا بە باسکردن و گێڕانەوەی ئەو زانستەی لەلای بوو، ئەبو هورەیرە(خوا لێی رازی بێت)-وەك بوخاری و مسلم ریوایەتی دەکەن- بۆ خۆی دەفەرموێت: گەر دوو ئایەت لە کتێبەکەی خودا نەبوونایە هیچ فەرموودەیەکم نەدەگێڕایەوە، پاشان ئەم دوو ئایەتەی خوێندەوە:

**﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلْهُدَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِى ٱلْكِتَٰبِ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟ وَبَيَّنُوا۟ فَأُو۟لَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٠﴾ ﴾ البقرة: ١٥٩ - ١٦٠**

شتێکی ئاسایی بوو داڕژانی خەڵکی بەسەر ئەبو هورەیرەدا(خوا لێی رازی بێت) بۆ وەرگرتنی فەرموودە بوویێتە جێگەی سەرسامی شوێنکەوتووان و هەندێ لە هاوەڵانی دوور لە شاری مەدینە و وتبێتیان: **"ما بال أبي هريرة يكثر الحديث وأصحاب رسول الله(صلى الله عليه وسلم) لا يكثرون مثله**-ئەبو هورەیرە چییەتی ئەم گشتە فەرموودە دەگێڕێتەوە، لە کاتێکدا هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) وەك ئەو فەرموودەی زۆر ناگێڕنەوە؟" پرسیارێکە بە زەینیاندا گوزەر دەکات و ئاراستەی ئەبی هورەیرەی دەکەن، نە شك و گومانە و نە بەدرۆخستنەوە، بەڵام حەزی لابردنی ئەو سەرسوڕمانە لە دەروونیاندا وا لە ئەبو هورەیرە دەکات هۆیەکەیان بۆ رۆشن بکاتەوە، ئەوەش وا لە ئەوان دەکات دڵنیاببنەوە و و رازی بن و بێدەنگ بن، ئێمە دەپرسین گەر هاوەڵانی

---

[1] ص٢٦٩.

پێغەمبەر(ﷺ) شك و گومانیان لـە صـدق و لەبـەرکردنی ئـەبو هـورەیرە بوایـە ئایـا ڕێگەیان پێ دەدا بەردەوام بێت لە گێڕانەوەی فەرموودە لە پێغەمبـەری خـوداوە(ﷺ)؟ یان ئەمیری باوەڕداران لەگەڵ ئەو هەموو توندی و ڕەقییە بۆ حەق ڕێگەی دەدا بە ئەبو هورەیرە کارێکی لەو جۆرە بکات؟ یان عائشە لێی بێدەنگ دەبوو؟

**٥-هەندێ جار وازهێنانی حەنەفییەکان لە فەرموودەی ئەبو هورەیرە:**

خاوەنی **"فجر الإسلام"** دەڵێت: ((هەندێ جار حەنەفییەکان واز لە فەرموودەی ئـەبو هورەیرە دەهێنن گەر بەرهەڵستی پێوانە(قیاس) بکات وەك لە فەرموودەی **"المصراة-**گوان پانکردن"[١] ئەنجامیاندا.

ئەبو هورەیرە ریوایەتی کردووە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: شیر لە گوانی حوشتر و مەڕ و ماڵاتدا مەهێڵنـەوە، هـەر کـەس دوای ئـەوە فرۆشـتنی ئـەوا لـە خێـری هـەردوو بارەکەدایە[٢] دوای ئەوەی دەیدۆشێت، گەر رازی بوو لای خۆی دەیهێڵێتەوە، گەر ناڕازی بوو دەیگێڕێتەوە لەگەڵ "صاع"ێك خورما، وتیان ئـەبو هـورەیرە فەقیـه نییـە، ئـەم فەرموودەیە پێچەوانەیە لەگەڵ تەواوی پێوانەکاری، گەر شیرەکە بدۆشێ دەستدرێژییە، دەستەبەری دەستدرێژیش بە هاونموونەیە یان بە بەهاکەیەتی، "صـاع"ێك لـە خورمـا هیچ کام لەو دوانە نییە))[٣].

**لێرەدا دانەری کتێبەکە چەند بانگەشەیەك دەکات:**

١. حەنەفییەکان پێوانە(قیاس) پێش دەخەن بەسەر خەبەردا گەر بەرهەڵستی یەکتریان کرد.

٢. ئەوان ئەو کارەیان لە فەرموودەکانی ئـەبو هـورەیرەدا کـردووە گـەر بەرهەڵسـتی پێوانەی کردبێت، وا دەردەکەوێت ئەم هەڵوێستەیان تایبەت بووبێت بە ئەبو هورەیرە.

٣. ئەوان ئەبو هورەیرە بە فەقیه دانانێن.

---

[١] (ئەوەیە ئاژەڵێك چەند ڕۆژێك شیرەکەی لە گواندا بمێنێتەوە تا کڕیارەکە پێیوابێت هەموو ڕۆژێك ئەو بڕە لە شیر دەدات).

[٢] (واتە شیرەکەی دەست دەکەوێت و گیاندارەکەش دەفرۆشێت).

[٣] ص٢٦٩.

دانەر لەم سێ خاڵەدا بەهەڵەدا چووە.

**(یەکەم)** حەنەفییەکان پێوانە بەسەر فەرمووەدەدا پێش ناخەن، بەڵکو ئیمام ئەبو حەنیفە و دوو هاوەڵەکەی و جمهووری زانایانی مەزهەبەکەی لەسەر ئەوەن بەرەهایی هەواڵ بەسەر پێوانەدا پێشدەخرێت، راویەکە فەقیهـ بێت یان نە، ئەمەش مەزهەبی شافیعی و ئەحمەد و جمهووری ئەهلی ئوسوڵە، هەر بەو جۆرە لای **"فخر الإسلام و ابن أبان و أبو زيد"** کە لە حەنەفییەکانن.

**"الكمال بن الهمام و ابن الحاجب و الآمدي"** پێیانوایە: گەر جێگیربوونی هۆیە لە پێوانەکەدا پارسەنگدراو بوو بەسەر هەواڵەکەدا، و بوونی لە لقەکەدا وەك بوونی وابوو لە ئەسڵەکەدا، لەو بارەدا پێوانە پێش دەخرێت، گەر جێگیربوونی هۆیەکە لە ئەسڵ و لە لقدا یەکسان بوو لەگەڵ جێگیربوونی هەواڵەکە ئەوا وەستان هەیە، ئەگەر نە، هەواڵەکە پێش دەخرێت.

**(دووەم)** ئەم هەڵوێستە پێشخستنی پێوانە بەسەر هەواڵدا تایبەت نییە بە فەرمووەدەکانی ئەبو هورەیرە وەك ئەوان دەڵێن، بەڵکو ئەوان بەسەر هەموو راوییەکدا فەقیهـ نەبێت گشتگیری دەکەن، ئەمەش گوزارشتەکەی **"مسلم الثبوت"** و شەرحەکەیەتی: ((**فخر الإسلام** دەڵێت: گەر راوییەکە لە موجتەهیدان بوو وەك چوار ئیمامەکە و عەبدولاکان و کەسانی تر ئەوا هەواڵەکە پێش دەخرێت، گەر لەو راوییانە بوو بە عەدالەت ناسراو بوو بەبێ فەقیهـ بوون وەك ئەبو هورەیرە و ئەنەس هەواڵەکەی بە بەرهەڵستی پێوانە وازلێ ناهێنرێت، مەگەر دەروازەی ڕا دابخرێت وەك فەرمووودەی **"المصراة**-گوان پانکردن بەهۆی هێلانەوەی شیرەوە")) [1].

ڕۆشن بوویەوە تایبەت کردنەوەی ئەبو هورەیرە بەم حوکمە وەك ئاشکرای قسەی دانەرەکە دەیگەیەنێت دروست نییە.

**(سێیەم)** ئەوەی لە حەنەفییەکانەوە دەیگوێزێتەوە لە فەقیهـ نەبوونی ئەبو هورەیرە دیسان نادروستە، چونکە تەنها **"فخر الإسلام"** لە حەنەفییەکان و دوو هاوەڵەکەی

[1] (هێلانەوەی شیر لە گوانی حوشتر و مەڕ و ماڵاتدا بۆ چەند ڕۆژێك لەبەر فریودانی کەسی کڕیار).

ئەبی حەنیفە ئەو قسەیان کردووە، جمهووری حەنەفییەکان پێچەوانەی ئەوەن و هێرشی توندیان لەسەر ئەو قسەیان هەیە.

"الكمال بن الهمام"-دوای باسکردنی رایەکەیان- کە لە **"مسلم الثبوت"** گواستوویەتەوە دەڵێت: ئەبو هورەیرە کەسێکی فەقیه بوو، شەرحکەری **"مسلم الثبوت"**.

**(ابن أمير الحاج) دەڵێت:** ئەبو هورەیرە هیچ شتێکی لە کەرەستەکان(هۆیەکان)ی ئیجتیهاد کەم نەبوو، لە سەردەمی هاوەڵاندا فتوای داوە، تەنها کەسی موجتەهید لە سەردەمی هاوەڵاندا فتوای دەدا، نزیکەی هەشت سەد پیاو لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان ریوایەتیان لێوە باس کردووە، لەوانە ئیبن عەباس و جابر و ئەنەس، هەر ئەمەش دروستەکەیە[1].

بەڵێ، حەنەفییەکان لەگەڵ ئەوەی هەواڵ بەسەر پێوانەدا پێش دەخەن گەر بەرهەڵستی یەکتریان کرد لێرەدا هەواڵەکەی ئەبی هورەیرەیان واز لێهێناوە نەك بە هۆی خودی ئەبی هورەیرەوە، بەڵکو بە هۆی دەرچوونی هەواڵەکە لە رێساکانیان، بەڵکو بە هۆی دەرچوون لە رێسایەکی بەڵگەنەویست لای هەموو زانایان ئەویش ئەوەیە گەر هەواڵ بەرهەڵستی قورئان و فەرموودە و ئیجماعی کرد کاری پێناکرێت، پاشان رۆیشتوون بۆ قسەکردن لەسەر ئەو هەواڵەی ئەبو هورەیرە کە بۆ شەش قسە کورتدەبێتەوە، نزیکترینیان ئەوەیە هەواڵەکە نەسخکراوەتەوە، هەمان بۆچوونیش لە ئەبو حەنیفەوە ریوایەت کراوە.

### ٦-دانەرانی فرموودە زۆری فەرموودەی ئەبو هورەیرەیان بەکارهێناوە:

ئەوەی ((دانەرانی فەرموودە زۆری فەرموودەی ئەبی هورەیرەیان بە هەلزانی و بوختانیان بە دەمەوە کرد و کۆمەڵێکی زۆر بەناوفەرموودەیان بە دەم ئەوەوە هەڵبەست))[2].

---

[1] التقرير٢/٢٥١، انظر كذالك التيسر٣/٥٣.

[2] ص٢٧٠.

ئەمە شتێکە پەیوەندی بە ئەبو هورەیرەوە نییە، بەڵکو **"عومەر و عەلی و عائشە و ئیبن عەباس و ئیبن عومەر و جابر و ئەنەس"**یش(خوایان لێ رازی بێت) فەرموودەیان بە دەمەوە هەڵبەستراوە و زۆرێك لە فەرموودە دراوەتە پاڵیان، شتێك لە خراپی ئەو کارەش لە ژیاننامەیان تۆمار نەکراوە ئیتر چۆن دروستە لە ژیاننەمەی ئەبو هورەیرەدا لەسەری بنووسرێت؟



# دەروازەی سێیەم

## ئاست و پلە و پایەی سوننە لە تەشریعی ئیسلامیدا

**سێ بەش لە خۆ دەگرێت:**

**بەشی یەکەم:** پلە و ئاستی سوننە لەگەڵ قورئاندا

**بەشی دووەم:** چۆن قورئان سوننە لەئامێز دەگرێت؟

**بەشی سێیەم:** نەسخی سوننە بە قورئان و قورئان بە سوننە

# دەروازەی سێیەم

## بەشی یەکەم

## پلە و ئاستی سوننە لەگەڵ قورئاندا

خودا قورئانی بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ) دابەزاند وەك هیدایەت بۆ خۆپاریزان و دەستوورێك بۆ موسڵمانان و شیفا بۆ سینەی ئەوانەی خودا شیفای بۆ دەوێن، قورئان هەموو ئەو مەرامانە لەئامێز دەگرێت پێغەمبەرانی لەپێناودا رەوانە کردووە، تەشریع و ئاداب و تەرغیب و تەرهیب و چیرۆك و یەکتاپەرستی تێدایە، قورئان دروستییەکەی یەقینی و براوەیە و هەر کەس گومانی لەسەر ئایەتێك یان وشەیەك یان پیتێکی قورئان هەبێت موسڵمان نییە، گرنگترین شتێك زانای خاوەن فیقهـ دەستی بۆ دەبات لە ئایینی خودادا ئەوەیە حوکمەکانی خودا لە کتێبەکەیدا و ئەوەی بۆ بەندەکانی تەشریعی کردووە لە رێکخستن و یاسا بزانێت.

هاوەڵان لە دەمی پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) وەریانگرت و شوێنکەوتوانیش لە چاخی هاوەڵاندا بە وەرگرتنێکی متەواتیر وەریان گرت و لە سەدەکانی دوای ئەوان بە متەواتیری بۆ موسڵمانان گوازراوەتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) جگە لە گەیاندنی قورئان بەبێ کەم و زیاد ئەرکێکی تری لەسەر شان بوو ئەوەش بریتی بوو لە رۆشنکردنەوەی ئەو قورئانە و شەرحی ئایەتەکانی و درێژەدان بە پوختەی حوکمەکانی و رۆشنکردنەوەی ئەو رێسا گشتییانە یان ئەو حوکمە پوختانە خودا لە کتێبەکەیدا دایبەزاند بوو.

لێرەوە موسڵمانان ئاتاج دەبن بە زانین و ناسینی رۆشنکردنەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ پێویستیان بە کتێبەکەی خودا، ناتوانین دروست و راستەقینە لە قورئان تێبگەین و

مەبەستی خودا لە زۆرێك لە ئایەتەکانی ئەحکام حاڵی ببین تا نەگەڕێینەوە بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە خودا کتێبەکەی بۆ سەر ئەو دابەزاندووە تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی دابەزیوە لە پەروەردگاریانەوە رۆشنی بکاتەوە.

لێرەوە تەواوی دەستە موسڵمانەکانی کۆن و نوێ-مەگەر کەسانێکی شاز لە دەستە لادەرەکان- لەسەر ئەوە رێکەوتوون سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) لە گوفتار و کردار و دانپیادانان یەکێکە لە سەرچاوەکانی تەشریعی ئیسلامی، لێرەدا باسی پلە و پایەی سوننە دەکەین بەراورد بە قورئان، ئایا سوننە لەگەڵ قورئاندا لە یەك ئاستدان یان لە پلە و پایەدا لێی دواکەوتووە؟

ئەوەی گومانی تێدا نییە مەتنی قورئان جێگیربوون و ساغبوونەوەی بڕاوە و یەقینییە(**قطعي الثبوت**)، پاشان هەندێکی یان ئاماژەکەی بڕاوەیە(**قطعي الدلالة**) یان ئاماژەکەی گومانئامێزە(**ظني الدلالة**)، بەڵام سوننەت ئەوەی متەواتیرە جێگیربوونەکەی بڕاوەیە(**قطعي الثبوت**)، بەڵام ئەوانەی متەواتیر نین جێگیربوونەکەیان گومانئامێزە(**ظني الثبوت**) هەرچەند بەشێك لەوانە ئاماژەکەیان بڕاوەیە(**قطعي الدلالة**) و بەشێکی تریان ئاماژەکەیان گومانئامێزە(**ظني الدلالة**)، پلە و ئاستی ئەوانەی جێگیربوونەکەیان گومانئامێز(**ظني الثبوت**)ە بە هەردوو جۆرەکەیەوە(واتە ئاماژە گومانئامێزی قورئان و ئاماژە گومانئامێزی سوننە) لە دوای هەردوو جۆرەکەی بڕاوە جێگیربوون و گومانئامێز جێگیربوون(**قطعي الثبوت و ظني الثبوت**)ەوە دێن.

هەروەها سوننە یان رۆشنکردنەوەی قورئانە یان زیادەیەکە بۆ سەری، گەر رۆشنکردنەوە بێت ئەوا لە ئاستی دووەمدایە، واتە دەقە بنەڕەتییەکە(قورئان) بنچینەیە و لێکدانەوە و رۆشنکردنەوەکە(سوننە) لەسەر ئەو بیناکراوە، بەڵام گەر زیادە بێت بۆ سەر قورئان ئەوا بەهەند وەرناگیرێت مەگەر دوای ئەوەی لە قورئاندا بوونی نەبێت، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر پێشخستنی قورئان.

ئەمە ئەوەیە سەرنجدانی ئەقڵی ئاماژەی پێ دەکات، لەسەر ئەمەش زۆرێك لە هەواڵ و ئاسار ئاماژەی پێ دەکەن.

لەوانە فەرموودەکەی مەعازی کوڕی جەبەل کە "أبو داود و الترمذي" ریوایەتی دەکەن: ((چۆن قەزاوەت دەکەی گەر پرسێکت خرایە بەردەم؟ فەرمووی: بە کتێبەکەی خودا، فەرمووی: گەر نەتبینییەوە؟ فەرمووی: بە سوننەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، فەرمووی: گەر نەتبینییەوە؟ فەرمووی: بەڕای خۆم ئیجتیهاد دەکەم.

گومانی تێدا نییە فەرموودەی ئاحاد لەبەر ئەو گومانەی لەسەر ڕێگەی ساغبوونەوەیەتی وای لێ دەکات لەڕووی جێگیربوونەوە(**من حيث الثبوت**) لە ئاستی دووەم دابنرێت لەدوای قورئان، بەڵام لەڕووی ئیجتیهاد و تێگەیشتن لە دەقەکان پێویستە بگەڕێینەوە بۆ سوننە بەر لە جێبەجێ کردنی دەقەکانی قورئان، ئەوەش لەبەر ئەگەری تایبەتکردنی دەقە قورئانییەکە یان سنووردار کردنی لەلایەن سوننەوە، لەم ڕووەوە(ڕووی ئیجتیهاد) لەگەڵ قورئاندا یەکسانە، چونکە دەقەکانیان بەرانبەر بە یەکتر دەوەستنەوە و تەبایی لە نێوانیاندا دەدۆزرێتەوە، یان گەر شتێك لە بەرهەڵستی لە نێوانیاندا سەریهەڵدا هەوڵی کۆکردنەوەیان دەدرێت، ئەمە هیچ کەس لەوانەی باوەڕیان بە حوجەتبوونی سوننەتە ناکۆکیان لەسەری نییە.

## ئایا سوننە سەربەخۆ تەشریع دەکات؟

**جیاوازی نییە لە نێوان زانایاندا دەقەکانی سوننە سێ بەشن:**

**یەکەم:** ئەوانەی پشتگیری حوکمەکانی قورئان دەکەن، لەڕووی پوختە و درێژەپێدانەوە تەبان لەگەڵیان، وەك ئەو فەرموودانەی باس لە واجبوونی نوێژ و زەکات و حەج و ڕۆژوو دەکەن بەبێ دەستبردن بۆ مەرجەکانی و پایەکانی، ئەمانە تەبان لەگەڵ ئەو ئایەتانەی لەو میانەدا هاتوون، وەك فەرموودەی: ((ئیسلام لەسەر پێنج پایە بیناکراوە: شەهادەتی "**لا إله إلا الله**" و أن محمدا رسول الله، نوێژکردن و دانی زەکات و ڕۆژووی ڕەمەزان و حەجی ماڵی خودا بۆ کەسێك بتوانێت ڕێگەی بۆ بگرێتە بەر)) ئەم فەرموودەیە تەبایە لەگەڵ ئایەتی:﴿**وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ**﴾ **البقرة: ٨٣**، هەروەها ئایەتی: ﴿ **يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٨٣** ﴾ **البقرة: ١٨٣**.

هەروەها ئایەتی: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٧﴾﴾ آل عمران: ٩٧

هەروەها وەك فەرموودەی: ((مـاڵی کەسـێکی موسـڵمان حـەڵاڵ نییـە مەگـەر بـە خۆشحاڵی دەروونی)) تەبایە لەگەڵ ئایەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ﴾ النساء: ٢٩

**دووەم:** ڕۆشنکەرەوەی حوکمەکانی قورئان بن، لە سنووردار کردنی ڕەها و درێـژەدان بە پوختە و تایبەتکردنی گشتی، وەك ئـەو فەرموودانـەی حوکمـەکانی نوێـژ و ڕۆژ و زەکات و حەج و کڕین و فرۆشتن و مامەڵەکان کە بە پوختی لە قورئاندا هاتوون، ئـەم بەشە زۆرینەی سوننە پێکدەهێنێت و لە هەموان زۆرتر هاتووە.

**سێیەم:** ئەوەی ئاماژە بە حوکمێك دەکات قورئان لێی بێدەنگە، نە پێویستی کردووە و نە نەرێی کردووە، وەك ئەو فەرموودانەی باس لە کۆکردنەوەی ئافرەت دەکەن لەگەڵ پووری یان لەگەڵ خاڵی بۆ یەك پیاو، هەروەها ڕەجمی زیناکەری خاوەن ژن یان خـاوەن پیاو، و نەفی کردنی زیناکەری بێژن و میراتی داپیر، و شتانی تر.

لەسەر دوو بەشی یەکەم جیاوازی لە نێوان زانایاندا بوونی نییە، واتە لە هاتنیان و جێگیر کردنی حوکمەکانیان و بەوەی زۆرینەن لە فەرموودەی پێغەمبەردا(ﷺ)، ئـەوان لـە بەشـی سێیەمدا جیاوازیان هەیە، واتە ئەو بەشەی کۆمەڵە حوکمێك جێگیر دەکەن قورئان جێگیر و نەرێی نەکردوون لـە هـەر ڕێگەیەکـەوە بێـت؟ لـە ڕێگـەی سـەربەخۆبوونەوە بێـت بـە جێگیرکردنی حوکمی نوێ، یان لە ڕێگەی چوونە ناو دەقەکانی قورئان بێت با بە تەئویلیش بێت، خاوەنی کتێبی "الموافقات" و کەسانی تر بۆ دووەمیـان دەچـن، بـەڵام جمهـوور بـۆ یەکەمیان دەچن، شافیعی(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت: ((لە ئەهلی زانست کەسـێك نابینم سەرپێچی بکات لەوەی سوننەتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لـە سـێ ڕووەوەن، لەسـەر دوو ڕوویان ئیجماعیان هەیە، ئەو دوو ڕووەش کۆدەبنەوە و لقیان لێ دەبێتەوە:

**یەکـەمیان:** ئەوەی خودا دەقێکی قورئانی بۆ دابەزانـدووە، پێغەمبـەر(ﷺ) هـەروەك دەقە قورئانییەکە والای کردووە و خستوویەتە ڕوو.

**ئـەویتریان:** ئەوەیە خودا بە پوختە لە قورئاندا دایبەزاندووە پێغەمبەر(ﷺ) لە خوداوە ئەو مانایەی خودا مەبەستی بووە ڕۆشن دەکاتەوە.

ئەمە ئەو دوو ڕووەیە زانایان جیاوازیان تیایدا نییە.

**ڕووی سێیەم:** ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی و دەقێکی قورئانی لەسەر نییە.

١. **هەیانە دەڵێت:** لەبەر ئەوەی خودا گوێڕایەڵی پێغەمبەری(ﷺ) پێویست کردووە و بە زانستی خودادا گوزەری کردووە ئەو پێغەمبەرە(ﷺ) لەسەر تەبایی و ڕازیبوونی خودا کارەکانی دەکات بۆیە ڕێگەی پێداوە سوننەتێك بگەیەنێت کە لە قورئاندا **بوونی نییە.**

٢. **هەیانە دەڵێت:** پێغەمبەر(ﷺ) سوننەتێکی نەهێناوە ریشە و بنەڕەتەکەی لە قورئاندا نەبێت، وەك سوننەتەکانی ڕۆشنکردنەوەی ژمارەی ڕکاتی نوێژەکان و چۆنێتی ئەنجامدانیان کە پوختەکەی لە قورئاندایە، هەر بەو جۆرە ئەوەی لە کڕین و فرۆشتندا هێناویەتی و خودا بنەڕەت و بنچینەکەی لە قورئاندا داڕشتووە: ﴿ **يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ** ﴾ **النساء: ٢٩**، هەروەها دەفەرموێت: ﴿ **وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ** ﴾ **البقرة: ٢٧٥**، ئەوەی حەڵاڵی کردووە یان حەرامی کردووە لە خوداوە ڕۆشنی کردووەتەوە وەك چۆن نوێژی ڕۆشن کردووەتەوە.

٣. **هەیانە دەڵێت:** ئەوانە پەیامی خودا بۆی هێناوە و سوننەتەکەی بە فەرزی خودا جێگیر بووە.

٤. **هەشیانە دەڵێت:** هەموو ئەوەی سوننەتی کردووە هەڵدراوەتە ناو دڵییەوە، سوننەتەکانی ئەو حیکمەتەن لە خوداوە هەڵدراوەتە ناو دڵییەوە، ئەوەی هەڵدراوەتە ناو دڵ و ناخییەوە سوننەتەکانی بووە)) تا ئێرە قسەی شافیعی بوو.

ئەوەی ڕۆشنە جیاوازی لە بەشی سێیەمدا جیاوازی نییە لە بوونی(یان نەبوون)ی ئەو بەشە، بەڵکو جیاوازییە لە سەرچاوە و شوێنی هاتنە دەرەوەی، ئایا سەربەخۆیە بە تەشریع کردن وەك خاوەنانی قسەی یەکەم و سێیەم و چوارەم بۆی دەچن، یان دەچێتە ناو دەقەکانی قورئانەوە وەك خاوەنی ڕای دووەم؟

**بەڵگەكانی ئەوانەی لەسەر سەربەخۆبوونی ئەو بەشەن لە سوننەت:**

**دەڵێن:**

**یەكەم:** لەڕووی ئەقڵەوە هیچ ڕێگرێك بوونی نییە لـە سـەربەخۆبوونی سـوننەت بـە تەشریع چونكە پێغەمبەر(ﷺ) مەعسوومە لە هەڵە و گوناه، خودا بۆی هەیە فـەرمان بە پێغەمبەرەكەی(ﷺ) بكات حوكمـەكانی بـە هـەر ڕێگەیـەك گونجـاوە بـە خـەڵكی بگەیەنێت، بە قورئان بێت یان بە ڕێگەیەكی تر، گەر لە ڕووی ئەقڵەوە گونجاو بێـت و لە ڕووی كرداریشەوە رووی دابێت ئیتر بۆ رامان لەسەری نەبێت؟

**دووەم:** ئەو دەقانەی لە قورئاندا هاتوون و ئاماژە بـە پێویسـتبوونی شـوێنكەوتن و گوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ) دەكـەن لـەو شـتانەی بەگشـتی فـەرمانیان پـێ دەكـات و نەهیان لێ دەكات، هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان سوننەی ڕۆشـنكەرەوە و سـوننەی دووپاتكەرەوە و سوننەی سەربەخۆ، بەڵكو لە هەندێك لە دەقـەكانی قورئانـدا مانـای ئەو سەربەخۆبوونە ئامـاژە پـێ دەكـەن، وەك:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ ﴾ **النساء: ٥٩**، گێڕانەوە بۆ لای خـودا گێڕانەوەیـە بـۆ لای قورئـان، گێڕانـەوە بـۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) گێڕانەوەیە بۆ لای سوننەتەكانی لە دوای مردنی.

هەروەها دەفەرمووێت:﴿ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَٱحۡذَرُواْ ﴾ **المائدة: ٩٢**، ئەمە و تەواوی ئەو ئایەتانەی گوێڕایەڵی خودای هاوملی گوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ) كردووە، گوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەیە فەرمانی پێكردووە و نەهی لێكردووە لـەوەی هێناویـەتی و لـە قورئاندا نییە، چونكە گەر لە قورئاندا بوونی هەبێت لە گوێڕایەڵی خودایە.

هەروەها دەفەرمووێت:﴿ فَلۡيَحۡذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنۡ أَمۡرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمۡ فِتۡنَةٌ ﴾ **النور: ٦٣**، پێغەمبەر(ﷺ) تایبەتكرا بە شتێك كە تیایدا دەبێت گوێڕایەڵی لـێ بكرێـت، ئـەوەش بریتییە لە سوننەت كە لە قورئاندا نەهاتووە.

هەروەها دەفەرمووێت:﴿ مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَ ﴾ **النساء: ٨٠**،

هەروەها ئایەتی: ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ﴾ الحشر: ٧

هەروەها ئایەتی: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾ ﴾ النساء: ٦٥.

لەسەر قەزاوەتی پێغەمبەر(ﷺ) دابەزی کە بڕیاری ئاودانیدا بۆ زوبەیر(خوا لێی ڕازی بێت) پێش کەسە ئەنصارییەکە، ئەو حوکمە لە کتێبەکەی خودادا بوونی نییە.

**سێیەم:** فەرموودەگەلێکی زۆر هاتوون ئاماژە بەوە دەکەن شەریعەت لە دوو ئەسڵ پێکدێت: کتێبەکەی خودا و سوننەت، هەروەها لە سوننەتدا کۆمەڵێك شت هاتوون کە لە قورئاندا نەهاتوون و پێویستە ئەو حوکمانە لە سوننەوە وەربگیرێن وەك چۆن لە قورئانەوە وەردەگیرێن.

وەك ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ): ((نزیکە یەکێك لە ئێوە بڵێت: ئەمە کتێبەکەی خودایە، ئەوەی تیایدا هاتووە لە حەڵاڵ بە حەڵاڵی دەزانین، ئەوەی تیایدا هاتووە لە حەرام بە حەرامی دەزانین، دەزانن هەر کەس لە منەوە فەرموودەیەکی پێ بگات بەدرۆی بزانێت ئەوا خودا و پێغەمبەر و ئەو کەسەی بۆی باس کردووە بە درۆ زانیوە))[1].

**چوارەم:** لە فەرموودەکەی عەلییەوە(خوا لێی ڕازی بێت): ((هیچمان لەلا نییە جگە لە کتێبەکەی خودا یان تێگەیشتنێك بە پیاوێکی موسڵمان درابێت، یان ئەوەی لەم لاپەڕەدایە..هتد)) سوننەت جێگیر دەکات.

هەروەها لە فەرموودەکەی مەعازی کوڕی جەبەلەوە(خوا لێی ڕازی بێت):

بە چی حوکم دەکەی؟ بە کتێبەکەی خودا.

فەرمووی: گەر نەتبینییەوە؟ فەرمووی: بە سوننەتی پێغەمبەری خودا.

فەرمووی: گەر نەتبینییەوە؟ فەرمووی: ئیجتیهاد دەکەم، ئەمە ڕۆشنە لە سوننەتدا شتێك هەیە لە قورئاندا بوونی نییە.

[1] رواه الطبراني في الأوسط وأورده ابن عبد البر في "جامع بيان العلم".

**بەڵگەی ئەوانەی سەربەخۆیی سوننەت ڕەد دەکەنەوە:**

ئەوانەی ڕەدی سەربەخۆبوونی سوننەت دەکەنەوە ئیمامی **"الشاطبي"** بەم جۆرە گوزارشتی لە رایەکەیان کردووە:

سوننەت لە مانایدا دەگەڕێتەوە بۆ قورئان، سوننە پوختەی کیتاب درێژە پێ دەدات و ناڕوونییەکانی ڕۆشن دەکاتەوە و کورتکراوەکەی والا دەکات، ئەمەش چونکە سوننەت بەیانی کیتابە، ئەوەش ئەو ئاماژەیە قورئان رایدەگەیەنێت:

﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾ **النحل: ٤٤**، لە سوننەتدا شتێك بوونی نییە قورئان ئاماژەی پێ نەکردبێت بە ئاماژەیەکی پوخت یان درێژەپێدراو.

عائشە(خوا لێی رازی بێت) ئەم ئایەتەی:﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ۝٤﴾ **القلم: ٤**،

وا لێکدایەوە کە ئەخلاقی پێغەمبەر(ﷺ) بریتی بوو لە قورئان، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە گوفتار و کردار و ئیقراری پێغەمبەر(ﷺ) گەڕاوەتەوە بۆ قورئان، چونکە ئەخلاق لەو سیانەدا کورتدەبێتەوە، هەروەها لەبەر ئەوەی قورئان بەیانکەر و ڕۆشنکەرەوەی هەموو شتێکە لەمەوە پێویست دەکات سوننەت سەراپا لە ناویدا بێت، چونکە فەرمان و نەهی لە کیتابدا لە پێشوەن.

هەروەها وەك ئایەتی: ﴿مَّا فَرَّطْنَا فِى ٱلْكِتَٰبِ مِن شَىْءٍ﴾ **الأنعام: ٣٨**.

و ئایەتی:﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ **المائدة: ٣**، مەبەست پێی دابەزینی قورئان کامڵ و تێر و تەواو بوو.

**جیاوازییەکە گوزارەییە(لفظي)ە:**

هەردوو لا کۆدەنگیان هەیە لەسەر بوونی حوکمی نوێ لە فەرموودەدا کە بە دەق و راشکاوانە لە قورئاندا نەهاتووە:

**دەستەی یەکەم دەڵێن:** ئەمە بریتییە لە سەربەخۆبوون لە تەشریعدا، چونکە حوکمگەلێك جێگیر دەکات لە کیتابدا نەهاتوون.

**دەستەی دووەم**-لەگەڵ ئەوەی دان بەوەدا دەنێن ئـەو حوكمانـەی سـوننە بـە دەق لـە قورئاندا نەهاتوون- **دەڵێن:** لە روویەك لە رووەكانەوە دەچنە ژێر دەقەكانی قورئانـەوە، بۆیە لەسەر ئەم تێگەیشتنە دەڵێن: فەرموودەیەكی سەحیح نابینیتەوە حوكمێك جێگیر بكات و لە قورئاندا نەهاتبێت نەچێتە ژێر دەقێك یان رێسایەك لە رێساكانی قورئـان، گەر فەرموودەیەكت بینی بەو جۆرە نەبوو ئەوە بەڵگەیە كە فەرموودەیەكی ناسەحیحە و دروست نییە كاری پێ بكرێت.



# بەشی دووەم

# چۆن قورئان سوننەت لەئامێز دەگرێت

گەر سوننە ڕۆشنکەرەوەی قورئان بێت و قورئان بە شێوەکی پوخت یان درێژەپێدراو ئاماژەی بە هەموو ئەوە کردبێت لە سوننەتدا هاتووە وەم رایەکەی **"الشاطبي"** و ئەوانەی لەگەڵ ئەو دەیڵێن، ئەوەش وەك وەرگرتنی ئایەتی: ﴿تِبۡيَٰنٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ﴾ **النحل: ٨٩** و ئایەتی: ﴿مَّا فَرَّطۡنَا فِي ٱلۡكِتَٰبِ مِن شَيۡءٖ﴾ **الأنعام: ٣٨**، لەسەر چ ڕوویەك ئەمە هاتووە لەگەڵ ئەوەی ئێمە زۆرێك لە ئەحکام دەبینین لە قورئاندا نەهاتوون؟

**زانایان لە ڕۆشنکردنەوەی ئەمەدا بۆ پێنج ڕێگە دابەش بوون:**

**ڕێگەی یەکەم:** قورئان ئاماژەی بە واجبوونی کارکردن بە سوننەت کردووە، هەر کارکردنێك بە سوننەت کارکردنە بە قورئان، ئەمە ڕێگەیەکی گشتییە و لەوانەی کاریان پێکردووە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودە، ریوایەت کراوە ئافرەتێك لە بەنی ئەسەد هات بۆ لای وتی: ئەی باوکی عبدالرحمن لە تۆوە پێمگەیشتووە تۆ نەفرەتت کردووە لە **"الواشمات و المستوشمات و المتنمصات و المتفلجات للحسن المغيرات خلق الله**-خاڵکوت و ئەوەی خاڵەکەی بۆ دەکوتیّ، برۆهەڵگر و ئەوەی برۆی بۆ هەڵدەگرێت، ئەوەی بۆشایی دەخاتە نێوان ددانی پێشەوەی بۆ جوانی، ئەوانەی خەلقی خودا دەگۆڕن"، وتی: چۆن نەفرەت ناکەم لە کەسانێك پێغەمبەر(ﷺ) نەفرەتی لیّ کردوون و لە کتێبەکەی خودادا هاتووە، ژنەکە وتی: هەموو قورئانم خوێندووەتەوە ئەوەی تێدا نییە، عەبدوڵا فەرمووی: گەر بتوخێندبایەتەوە دەتبینییەوە، خودا(عز وجل) دەفەرمویێت: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْ﴾ **الحشر: ٧.**

**ڕێگەی دووەم:** ئەوەش ڕێگەیەکی بەناوبانگە لای زانایان، ئەوەش ئەوەیە کیتاب پوختەیە و سوننە درێژەپێدەرییەتی، وەك ئەو فەرموودانەی حوکمە پوختەکان درێژە پیّ دەدەن، ڕۆشنکردنەوەی نوێژەکان بە جیاوازیان لە کاتی جۆراوجۆردا و ڕکوع و سوژدە و

تەواوی حوكمەكانی تری، هەروەها ڕۆشنكردنەوەی زەكات و بڕ و كات و ڕادەی مـاڵ، هەر بەو جۆرە حوكمەكانی ڕۆژوو كە لە قورئاندا نەهاتوون، بە هەمان شێوە تاوانەكان و تۆڵەسەندنەوەكان و ئەحكامی حەج و قوربانی و هاوسەرگیری و ئەوەی پەیوەستە پێیەوە و مامەڵ و كڕین و فرۆشتن و حوكمەكانی، هەموو ئەمانە پوختەكەی لە قورئاندا هاتووە و ڕۆشنكردنەوەكەی بە پێغەمبەر(ﷺ) سپێرراوە، و دەچێتە ژێـر ئایـەتی: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾ **النحل: ٤٤**

هەروەها دەگێڕنەوە **"عمران بن الحصين"** بە پیاوێكی وت: تۆ كەسێكی گەمژەی، ئایا لە كتێبەكەی خودادا هاتووە نوێژی نیوەڕۆ چوارە و نابێت لە خوێندنەوەدا دەنگ بەرز بكەیەوە؟ پاشان نوێژ و زەكاتی بۆ ژمارد و وتـی: ئایـا ئەمانـە بـە لێكـدراوەیی لـە كتێبەكەی خودادا دەبینیتەوە؟ كتێبەكەی خودا ئەمـەی نـاڕوون كـردووە و سـوننەت لێكدانەوەی بۆ كردووە[1].

بە **"مطرف بن عبدالله"** وترا: تەنها بـە قورئـان قسـەمان لەگـەڵ بكە(واتـە باسـی سوننەتمان بۆ مەكە) **"مطرف"** وتی: سوێند بە خودا هـیچ جێگرەوەیـەك بـۆ قورئـان دانـانێین، بـەڵام ئـەو كەسـەمان دەوێـت زانـاتر بـووە بـە قورئـان لـە ئێمە(واتـە پێغەمبەر(ﷺ))[2].

**ڕێگەی سێیەم:** بریتییە لە تێڕوانینی مانای گشتی كە تەشریعی قورئـانی لـە دەقـە جۆراوجۆرەكانیدا مەبەستییەتی، ئەوەی لە سوننەتدایە لـە ئـەحكام لـەو مەبەسـت و مەرام و مانانە دەرناچن.

درێژەپێدانی ئەمە ئەوەیە قورئان بۆ دەستەبەركردنی بەختەوەری هاتووە بۆ مرۆڤ لـە ژیانی دونیا و دواڕۆژیدا، بەختەوەریش سێ شتە:

١. **زەرووریات(زۆر پێویست):** بریتییە لە پارێزگاری دین و نەفس و نەوە و مـاڵ و ئەقڵ.

---

[1] الموافقات٤/٢٦، وجامع بيان العلم٢/١٩١.

[2] نفس المصدر.

٢. **حاجيات(پێویست):** هەر شتێك سەردەكێشێت بۆ بەرینكردن و هەڵگرتنی تەنگەلانی و حەرەج وەك موباحبوونی نەگرتنی ڕۆژوو لە سەفەردا یان بەهۆی نەخۆشییەوە.

٣. **تەحسینیات(پەسەندكراوەكان):** ئەوەیە بە ئەخلاقی بەرز و بڵند و نەریتی باشەوە گرێدراوە.

ئەم سیانە وەك بنچینە و بناغە قورئان هێناونی، هەموو حوكمەكانی قورئان دەكەونە ژێرییەوە، سوننەش وەك لقكردنەوە و درێژەپێدانی كیتاب هێناونی، هەرچی دەقەكانی سوننەتە بە شیكردنەوە دەگەڕێنەوە بۆ ئەو سێ بنچینەیە.

**ڕێگەی چوارەم:** قورئان بە دەق دوو حوكم بەرانبەر بە یەكتر دەهێنێت، لێكچوون بە هەر یەكێكیانەوە بوونی هەیە، سوننە دێت لێكچوونەكە بە یەكێكیانەوە یەكلا دەكاتەوە یان حوكمێكی تایبەتی پێ دەدات كە گونجاو بێت لە دوو لێكچوونەكە، هەندێ جاریش قورئان بە دەق حوكمێك دەهێنێت بە هۆی بوونی هۆیەك تیایدا پێغەمبەر(ﷺ) شتێك دەكات بە پاشكۆی كە هەمان هۆی تێدایە، ئەمەش لە ڕێگەی پێوانە(قیاس)ەوە.

**نموونە:**

١. خودا پاكی حەڵاڵ كردووە و پیسی حەرام كردووە، هەندێ شت ماوەتەوە نازانرێت پاكن یان پیسن، پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆشنی دەكاتەوە سەر بە یەكێك لەو دوانەن، بۆیە نەهی كردووە لە خواردنی گۆشتی هەموو ئەو گیاندارانەی كەڵبەیان هەیە لە دڕندە، یان چڕنووكیان هەیە لە باڵندە، هەروەها نەهی كردووە لە خواردنی گۆشتی كەری ماڵی، لە كاتێكدا پێغەمبەر(ﷺ) بزنمژە و كەروێشكی لە پاكەكان سەرژمێر كردووە.

٢. خودا ڕاوی دەریای حەڵاڵ كردووە و بە پاكی داناوە، هەروەها مردارەوەبووی حەرام كردووە و بە پیسی داناوە، لێرەدا مردارەوەبووی دەریا كەوتووەتە نێوان ئەو دوانەوە و حوكمەكەی تەمومژاوییە.

بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((دەریا ئاوەكەی پاكە و مردارەوەبووی حەڵاڵە))[١].

[١] أخرجه أبو داود والنسائي والترمذي وابن ماجة.

هــەروەها فەرمووپــەتی: ((دوو مردارەوەبوومــان بــۆ حەڵاڵــە: ماســی و کوللــە، دوو خوێنەکەش: جگەر و سپڵ ))[1].

٣. مرداروەبووی حەرام کردووە و سەربڕاوی حەڵاڵ کردووە، بەچکەی مردارەوەبووی ناو سکی گیانداری سەربڕاو دەکەوێتە نێوان ئەو دوو بەرەیەوە(مردارەوەبوو، سەربڕاو).

بۆیە لێرەدا پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((ســەربڕینی بەچــکەی نــاو ســك ســەربڕینی دایکەکەیەتی))[2].

## نموونە بۆ پێدانی حوکمێکی تایبەت لە نێوان دوو لێکچوودا:

١. خودا هاوسەرگیری و "ملك اليمين"ی حەڵاڵ کردووە و زینای حەرام کــردووە، و لە هاوسەرگیری پێچەوانە بە شەرع بێدەنگ بووە، ئەوە نە هاوسەرگیری تەواوە و نە زینای تەواوە.

بۆیە لە سوننەدا هاتووە: ((هەر ئافرەتێك بەبێ مۆڵەتی سەرپەرشــتیارەکەی مێــردی کرد هاوسەرگیرییەکەی پووچە، هاوسەرگیرییەکەی پووچە، هاوسەرگیرییەکەی پووچــە، گەر پیاوەکە چووە لای مارەیی بۆ هەیە بەوەی بۆی حەڵاڵ بووە لە ژنەکە))[3].

٢. خودا کوشتنی نەفسی بە نەفس دانــاوە، "قصــاص"یش بــۆ بــڕینی ئەندامــەکانی جەستە، بەڵام لە باری کوشتنی بەهەڵە خوێنپێدان هەیە، بۆ ئەندامەکانیش خوێنپێــدان بە بڕێکی دیاریکراو، کوشتنی منداڵی ناو سکی دایــك نــاڕوونی و تەمومــژ دروســت دەکات گەر یەکێك لە دایکــی منداڵەکــەی دا و منداڵەکــەی لەبارچــوو، منــداڵ بــە ئەندامێکی جەســتەی مــرۆڤ چــوێنراوە، و وەکــو دروســتکراویش بــە مرۆڤــی تــەواو تەماشــاکراوە، بۆیــە لــە ســوننەدا خوێنەکــەی بریتییــە لــە خــوێنی بەندەیــەك یــان کەنیزەکێك.

---

[1] أخرجه ابن ماجة والحاكم والبيهقي من رواية ابن عمر.
[2] رواه أبو داود والترمذي وحسنه وابن ماجة وابن حبان والدار قطني.
[3] رواه أبو داود والترمذي.

**نموونە بۆ پاشکۆکردنی بە ڕێگەی پێوانە(قیاس):**

١. خودا سووی حەرام کردووە، لەبەر ئەوەی هۆیەکە تیایدا بریتییە لە زیادە بەبێ بەرانبەر، بۆیە سوننە هەر زیادەیەك بە هەمان مانا هاتبێت کردوویەتی بە پاشکۆی سوو.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((زێڕ بە زێڕ، زیو بە زیو، گەنم بە گەنم، جۆ بە جۆ، خورما بە خورما، خوێ بە خوێ، هاونموونە بە هاونموونە، یەکسان بە یەکسان، دەست بە دەست، هەر کەس زیادی کرد یان زیادی خستە سەر ئەوە سووی وەرگرتووە، گەر ئەم جۆرانە جیاواز بوون چۆنتان دەوێت بفرۆشن ئەگەر دەست بە دەست بوو))[1].

٢. خودا کۆکردنەوەی دوو خوشکی لە هاوسەرگیریدا حەرام کردووە، لە قورئانیشدا هاتووە: ﴿وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمْ﴾ **النساء: ٢٤**، نەهی پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە لەسەر کۆکردنەوەی ئافرەت و پووری(لە دایکی یان لە باوکی) لە هاوسەرگیریدا، پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕێگەی پێوانەوە ئەم جۆرە هاوسەرگیرییەی کرد بە پاشکۆی ئەو جۆرەی تر لە هاوسەرگیری، چونکە ئەو مانایەی لە پێناویدا زەمی کۆکردنەوەی دوو خوشك کراوە لەم جۆرە هاوسەرگیرییەشدا هەیە.

وەك لە فەرموودەکەدا هاتووە: ((ئێوە گەر ئەو کارەتان ئەنجام دا پەتی خزمایەتی و کەسایەتیتان پچڕاندووە))

**ڕێگەی پێنجەم:** گێڕانەوەی هەموو ئەوەی لە سوننەتدا هاتووە لە ئەحکامە درێژەپێدراوەکان بۆ ئەحکامە درێژەپێدراوەکانی ناو قورئان، لە نموونەی ئەمە:

١. ئیبن عومەر ژنەکەی خۆی لە باری بێنوێژی(حەیز)دا تەڵاقدا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بە عومەر: ((فەرمانی پێ بکە با بیگێڕێتەوە و وازی لێ بهێنێت تا پاك دەبێتەوە و پاشان دەکەوێتەوە بێنوێژی و پاشان پاك دەبێتەوە، پاشن گەر ویستی با بیگێڕێتەوە، گەر ویستیشی تەڵاقی بدات بەر لەوەی دەستی بۆ ببات، ئەوە ئەو عیدەیە کە خودا فەرمانی کردووە ژنی تێدا تەڵاق بدرێت))[2].

---

[1] هذا الحديث مشهور روته جميع كتب السنة بألفاظ متقاربة، وهذا هو من ريواية مسلم و أبي داود وأحمد وغيرهم.

[2] أخرجه الستة.

واتــه ئــەوەی لــەم ئایەتــەدا فــەرمانی پێکــراوە:﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ ﴾ **الطلاق: ١**

٢. فەرموودەکەی فاتیمەی کچی قەیس لەوەی پێغەمبەر(ﷺ) شوێنی نیشــتەجێبوون و خەرجی بۆ دابین نەکرد کاتێك مێردەکەی بە سێ تەڵاق تەڵاقی دا -ئــەو ئافرەتــەی بــە سێ تەڵاق دەدرێت شوێنی نیشتەجێ بوونی بۆ هەیە با خەرجیشی بۆ نەبێت- چــونکە بە زمان شتی خراپی لەسەر خانەوادەکەی وتبوو، ئــەوەش راڤــەکردنی ئــەم ئایەتەیــە: ﴿وَلَا يَخۡرُجۡنَ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ ﴾ **الطلاق: ١**

**چیرۆکەکانی سوننە:**

چیرۆك و نموونەکان و مەعیزەکانی سوننە هەندێکی لێکدانەوەی ئەوەیە لــە قورئانــدا هاتووە، وەك ئــەو فەرموودانــەی لــە راڤــەکردنی ئایــەتی:﴿وَٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ سُجَّدٗا ﴾ **البقرة: ٥٨** هاتوون، فەرمووی: ((لەسەر "سمت"یان چوونە ژوورەوە)).

هەروەها لە لێکدانــەوەی ئایــەتی:﴿ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ قَوۡلًا غَيۡرَ ٱلَّذِي قِيلَ لَهُمۡ ﴾ **البقرة: ٥٩** هاتووە فەرمووی: ((وتیان **"حبــة في شــعرة"**(لــە جێگــەی ئــەوەی بڵــێن: **"حطة"**)

هەیانە ناچێتە ژێر لێکدانەوەی ئایەتەوە، داوایەکی باوەڕ یان کرداریــان تێــدا نییــە، بۆیە پێویست نییە بنچینەیەکی لە قورئانــدا هــەبێت، لەگــەڵ ئــەوەش وەك چــیرۆکی قورئانی گوزەر دەکات لەو سۆنگەیەوە تەرغیب و تەرهیبی تێدایە، بۆیە دەگەڕێنــەوە بۆ بەشی یەکەم، ئەوەش وەك چیرۆکی(کەچەڵ و گول و کوێرەکە).

هەروەها چیرۆکی **"جورەیجی عابیــد"**، و ئــەو ســیانەی چــوونە نــاو ئەشــکەوتەکە و بەردەکە دەرگاکەی لێ گرتن.

# بەشی سێیەم

# نەسخی سوننە بە قورئان و قورئان بە سوننە

**نەسخ لە قورئاندا:**

جیاوازی لە نێوان زانایاندا نییە لە نەسخی قورئان بە قورئان، جگە لەوەی لـە **"أبـي مسلم الأصفهاني"**ەوە ریوایەت کراوە کە بـوونی نەسـخ لـە قورئانـدا رەد دەکاتـەوە، هەر بەو جۆرەش جیاوازی لە نێوانیاندا نییە لە نەسخی سوننەت بـە سـوننەت، گـەر سوننەتەکە متەواتیر بوو بەمەرجگیراوە نەسخکەرەکە متەواتیر بێت، گەر ئاحـاد بـوو بە ئاحاد یان بە متەواتیر نەسخ دەکرێتەوە، نموونەی زۆرێك لە فەرموودە دەهێننـەوە، لەوانە: ((کاتی خۆی نەهیم لێکردن لە لە سەردانی گۆڕستان، بزانن لە ئێستاوە بـڕۆن سەردانی بکەن))[1].

**لە دوو جێگەدا جیاوازیان لە نێواندا هەیە:**

**یەکەم:** نەسخی سوننەت بە کیتاب.

**دووەم:** نەسخی قورئان بە سوننەت.

**یەکەم: نەسخی سوننەت بە کیتاب:**

**(أ) جمهوور دەڵێن:**

ئەوە کارێکی گونجاوە، لە واقیعیشدا روویداوە، بۆ ئەو مەبەسـتە چـەندین نموونـەیان باس کردووە:

لەوانە نەسخی رووکردنە "بيت المقدس" بە رووکردنە کەعبە، ئەوەی زانراوە ئەوەیە موسڵمانان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لە سەرەتای کۆچـیان بـۆ مەدینـە نزیکـەی چـەند

---

[1] رواه مسلم وأبو داود والترمذي وابن ماجة.

مانگێك روویان لە "بيت المقدس" بوو، ئەو كارەش دەقێكی قورئانی لەسەر نەبوو، پاشان ئەو كارەی پێغەمبەر(ﷺ) بەم ئایەتە نەسخكرایەوە:﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا ۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ﴾البقرة: ١٤٤

**(ب) شافیعی(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:**

سوننە بە قورئان نەسخ نابێتەوە و بۆ ئەو مەبەستەش بەڵگە دەهێننەوە.

**دووەم: نەسخی كیتاب بە سوننەت:**

**زانایان دوو رایان هەیە:**

**(ا) رای حەنەفییەكان:**

نەسخبوونەوەی كیتاب بە سوننەتی متەواتیر و مەشهوور گونجاوە، بەڵام بە فەرموودەی ئاحاد نەسخ نابێتەوە، نموونەیان بە نەسخی كیتاب بە مەسحی سەر خوف هێناوەتەوە كە فەرموودەیەكی مەشهوورە، هەروەها نموونەیان بە وەسێتی واجبی ناو ئەم ئایەتە هێناوەتەوە:﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ ﴾ البقرة: ١٨٠.

بە فەرموودەی: ((**لا وصية لوارث**-وەسێت بۆ واریس نییە))

**(ت) جمهوور دەڵێن:**

نەسخی قورئان بە سوننەت دروست و گونجاو نییە، جا سوننەتەكە متەواتیر بێت یان مەشهوور یاخود ئاحاد.

شافیعی بەڵگەی بۆ قسەی جمهوور بەم ئایەتە هێناوەتەوە: ﴿ مَا نَنسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَا أَوْ مِثْلِهَا ۗ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾ ﴾ البقرة: ١٠٦، سننە وەك قورئان نییە و چاكتر نییە لە قورئان.

هەروەها ئایەتی: ﴿ قُلْ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أُبَدِّلَهُ مِن تِلْقَاءِ نَفْسِي ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰ إِلَيَّ ﴾ یونس: ١٥، ئەوە بەڵگەیە پێغەمبەر(ﷺ) شوێنی ئەوە كەوتووە وەحی بۆ

کراوە، و شتێکی لەو وەحییە نەگۆڕیوە و ئاڵگۆڕی پــێ نــەکردووە، نەســخ تەبدیلــە و نابێت ئەو کارە ئەنجام درابێت.

هەروەها خودا(سبحانە وتعالى) دەفــەرموێت: ﴿لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾ **النحـل: ٤٤**، خودا رایگەیاند پێغەمبەر(ﷺ) رۆشنکەرەوەی ئەوەیە دابەزیوە تاکو خەڵکی بــەو دابەزێنراوە کار بکەن دوای ئەوەی بە رۆشنکردنەوەی خۆی بۆی رۆشــن کردنــەوە، لــە بارێکدا بە گونجاوی بزانین کیتاب بە سوننەت نەسخ ببێتەوە ئەم حوکمە هەڵــدەگیرێت، چونکە ئەو کاتە کارکردن بە نەسخکەرەکەیە، گەر نەســخکەریش لــە ســوننەت بێــت کارکردن پێی کارکردن نییە بەوەی دابەزێنراوە.

گومانی تێدا نییە رای جمهوور لــە حەقــەوە نــزیکترە و دڵنیــانین ســوننەتێك بــوونی هەبێت قورئانی نەسخ کردبێتەوە، ئەوەی حەنەفییەکان لە مەسحی خــوف و وەســێتی واریس باسی لێوە دەکەن لەم جۆرە نییە و ناچێتە ناو نەسخەوە.



# کۆتایـــی

چوار ئیمامەکە و خاوەنانی شەش کتێبەکەی فەرمووده:

١. ئیمامی ئەبو حەنیفە(٨٠ك-١٥٠ك)

٢. ئیمامی مالیك (٩٣ك-١٧٩ك)

٣. ئیمامی شافیعی(١٥٠ك-٢٠٤ك)

٤. ئیمامی ئەحمەد (١٦٤ك-٢٤١ك)

٥. ئیمامی بوخاری (١٩٤ك-٢٥٦ك)

٦. ئیمامی مسلم (٢٠٤ك-٢٦١ك)

٧. ئیمامی نەسائی و سوننەنەکەی (٢١٥ك-٣٠٣ك)

٨. ئیمامی ئەبو داود و سوننەنەکەی (٢٠٢ك-٢٧٥ك)

٩. ئیمامی "الترمذي" و جامعەکەی (٢٠٩ك-٢٧٠ك)

١٠. ئیمامی ئیبن ماجە و سوننەنەکەی (٢٠٧ك-٢٧٣ك)




# ئیمامی ئەبو حەنیفە

## ٨٠-١٥٠ك

### رەچەڵەك و لەدایكبوونی:

ئەو ناوی "ئەبو حەنیفە نیعمانی كوڕی سابیتی زووتی"ە، لەپێش چوار ئیمامەكەوە لەدایك بووە و لە هەموو ئیمامەكان زیاتر شوێنكەوتەی لە موسڵمانان هەیە، لە شاری كوفە -لە راستترین بۆچووندا- لە ساڵی (٨٠ك) لەدایكبووە، ساڵی (١٥٠ك) لە شاری بەغداد كۆچی دوایی كردووە.

لەدوای مردنی مامۆستاكەی(حەماد) لە ساڵی (١٢٠ك) سەرۆكایەتی قوتابخانەی كوفەی كەوتە دەست و بوو بە ئیمامی فەقیهانی عێراق.

### بنچینەی مەزهەبەكەی:

"البیهقی" لە یەحیای كوڕی خورەیسەوە دەڵێت: سوفیانم بینی پیاوێك هات بۆ لای وتی: ئەریّ رق لە ئەبو حەنیفە هەڵناگری؟ ئەویش پرسی: بۆ، چییەتی؟ وتی: ((گوێم لیّ بوو دەیوت ئەوەی لە كتێبەكەی خودادایە وەریدەگرم، گەر نەمبینییەوە بە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) كاردەكەم، گەر لە كتێبەكەی خودا و سوننەتی پێغەمبەردا نەمبینییەوە، قسەی هەندیّ لە هاوەڵان وەردەگرم و هەندێكی تریان وەرناگرم، لە قسەی ئەوان لانادەم بۆ قسەی كەسانی تر، بەڵام گەر كارەكە گەیشتە سەر "**إبراهیم و الشعبي و ابن سیرین و الحسن و عطاء و ابن المسیب**"-ناوی كۆمەڵێك پیاوی هێنا- ئەوانە دەستەیەك بوون ئیجتیهادیان كردووە، منیش هەروەك ئەوان ئیجتیهاد دەكەم))[١].

---

[١] مفتاح الجنەص٣٤.

**دەنگۆی گەورە بە دەوریدا:**

لە ژیانیدا و لەدوای مردنی دەنگۆی گەورە لەسەر مەزهەبەکەی پەیدا بووە، هەندێکیان دانیان بە گەورەیی ئەبو حەنیفەدا ناوە و بۆ زانستەکەی ملکەچ بوون و بە ئیمامێکی مەزنیان داناوە، ئەمانە بریتین لە جمهووری موسڵمانان، دەستەیەکیش هەبوون رقیان لێی بووە و خەڵکیان لە مەزهەبەکەی دوورخستووەتەوە، ئایا نهێنی ئەمە چی بووە؟ و ئەو تانەدەرانە کێن؟

**هۆی ئەو دەنگۆیە:**

١. ئەبو حەنیفە یەکەم کەسە لەناو ئیمامانی چاخی خۆیدا لە هەڵهێنجانی فیقهدا فراوانخوازی کردووە و لقی لە ئەسڵەکان هەڵگرتووە و ئەگەری کۆمەڵێك رووداوی داناوە کە روویان نەداوە، زانایانی پێش ئەو ئەو کارەیان لا ناپەسەند بوو و بە کاتکوشتن و سەرقاڵ کردنی خەڵکیان دەزانی.

زەیدی کوڕی سابیت گەر پرسیاری بابەتێکی لێبکرابایە دەیپرسی: روویداوە؟

گەر بیاوتبایە: نەخێر، دەیوت: لێیبگەڕێن تا روودەدات، ئەبو حەنیفە پێچەوانەی ئەوە بیری دەکردەوە، چونکە کاری موجتەهید -لەلای ئەو- رێگەخۆشکردنی فیقهیانە بووە بۆ خەڵکی.

مەدرەسەی ئەبو حەنیفە بە مەدرەسەی "ڕا" ناسراوە، واتە ئەوانەی ئەگەری رووداو دادەتاشن بە وتنی: چی دەبێ گەر فلان رووداو روویدا؟ چی دەبێت گەر بەو جۆرە بوو؟

٢. ئەبو حەنیفە لە قبووڵ کردنی هەواڵ(فەرموودە و قسەی هاوەڵان) زۆر توندگیری تێدا بوو، کۆمەڵێك مەرجی گرانی بۆ قبووڵ کردنی دانابوو، ئەوەش لەبەر بڵاوەکردنی بەناوفەرموودەی دانراو و هەڵبەستراو.

٣. لە لایەکی ترەوە بەڵگەی بە فەرموودەی "مرسل" دەهێنایەوە گەر ئەو کەسەی فەرموودەکە بەرزدەکاتەوە جێمتمانە بێت، ئەمەش پێچەوانە بوو لەگەڵ ئەوەی جمهووری ئەهلی فەرموودە لەسەری بوون.

٤. بەهۆی بەرتەسك كردنەوەی بازنەی كاركردن بە فەرمووده ناچار بووه كار بە پێوانه(قیاس) و بەكارهێنانی ڕا بكات.

٥. به هۆی وردەكاری زۆری ئەبو حەنیفەوه لە را فیقهییەكانیدا لە هەندێك لە رایەكانیدا پێچەوانه لەگەڵ زانایان و رای جمهووری ئەهلی فەرمووده وەستاوەتەوه ئەمەش به هۆی وەستانی ئەوان له پای رووالّەت و ئاشكرای فەرمووده.

٦. ئەبو حەنیفه كۆمەڵێك هاودەم و هاوچەرخی خۆی لە زانایان هەبوو، سروشتی مرۆڤیش ململانێ و پێشبڕكێیه، بۆیه كارێكی سروشتییه هەندێك لەوانە سینگیان هاتبێتەوه یەك به هۆی ئەو تێگەیشتن و ناوبانگەی ئەبو حەنیفه هەیبوو.

٧. بەهۆی كاریگەری هەموو ئەو خالآنەی ئاماژەیان پێكرا خەڵكی كۆمەڵێك شتیان له ئەبو حەنیفەوه باس دەكرد كه هەندێكی ناحەق و هەندێكی راستەقینەكەی حالّی نەبووبوون.

خاوەنی "الخيرات الحسان" بۆمان باس دەكات و دەڵێت: ئەوزاعی گومانی خراپی به ئەبو حەنیفه هەبوو كاتێك ئەبو حەنیفە كارەكەی بەرەو ناوبانگ دەركردن دەڕۆیشت، ئەو هێشتا چاوی به ئەبو حەنیفه نەكەوتبوو، تا جارێك بە عەبدولآی كوڕی موبارەكی وت: ئەو كابرا بیدعەكاره كێیە لە كوفە پەیدا بووه و پێی دەوترێت ئەبو حەنیفه؟

ئیبن موبارەك وەلآمی نەدایەوه، بەڵكو هەندێ بابەتی زۆر قورسی باس كرد و تێگەیشتنیانی خسته روو و فتوای لەبارەوه راگەیاند، ئەوزاعی پرسیاری كرد: خاوەنی ئەم فتوانه كێیه؟

ئیبن موبارەك وتی: شێخێكه له عێراق، ئەوازاعی وتی: دیاره ئەو پیاوه زانایەكی زۆر مەزنه، برۆ و سوودی لێ ببینه، ئیبن موبارەك وتی: ئەو پیاوه ئەبو حەنیفەیه.. پاشان ئەبو حەنیفه و ئەوزاعی له مەككه كۆبوونەوه، ئەو بابەتانەی ئیبن موبارەك باسی كرد بوو له نێوان خۆیاندا باسیان كردەوه و ئەویش پەردەی لەسەریان لادا، كاتێك لەیەكتر جیابوونەوه ئەوزاعی به ئیبن موبارەكی وت: ((سەرسام بووم به زۆری زانستی ئەم پیاوه

و ئەقڵی دامەزراوی، داوای لێخۆشبوون لە خودا دەکەم، من لە هەڵەیەکی ئاشکرادا بووم، پابەند بە بەم پیاوەوە، ئەو پیاوە پێچەوانەی ئەوەیە بە من گەیشتووە))[1].

## ئایا ئەبو حەنیفە لە فەرموودەدا بێ شمەك بوو؟

کارێکی ترسناکە ئیمامێك لە ئیمامە مەزنەکانی موسڵمانان کە خاوەنی مەزهەبێکی فیقهی بەرینە و دەیان ملیۆن موسڵمان پابەندی مەزهەبەکەی ئەون —وەك دەوترێت- تەنها چەند فەرموودەیەکی زانیبێت، یان-وەك دەوترێت- سەد و پەنجا فەرموودەی زانیبێت.

ئایا ئەم راستە؟

١. ئەبو حەنیفە ئیمامێکی موجتەهید بوو بە کۆدەنگی هەموو لایەك، لە مەرجەکانی ئیجتیهادیش ئەوەیە ئابلۆقەی هەبێت بە فەرموودەکانی ئەحکام کە بە هەزاران دەژمێررێن، چۆن گونجاو بووە بۆ ئەبو حەنیفە ئیجتیهاد بکات لە کاتێك مەرجەکانی ئیجتیهادی تێدا نەهاتووەتە دی؟! چۆن ئیمامەکان ئیجتیهادەکەیان بەهەند وەرگرتووە و گرنگیان بە فیقهەکەی داوە، لە کاتێکدا لەسەر بنچینەیەکی تۆکمە و دامەزراو راستنەبوویێتەوە؟!

٢. هەر کەس تەماشای مەزهەبی ئەبو حەنیفە بکات دەبینێت لە سەدان بابەتدا لەگەڵ فەرموودەدا تەبایە.

خاوەنی کتێبی: "شارح القاموس"(**السيد مرتضى الزبيدي**) هەموو ئەو فەرموودانەی بەڵگەن لەسەر بابەتە ئیجتیهادییەکانی مەزهەبی ئەبو حەنیفە کۆکردووەتەوە کە لە مەسنەدی ئیمام ئەحمەد و شەش کتێبە سەحیحەکەدا هاتوون و ژمارەیان سەدان فەرموودەی سەحیحە.

دەپرسین: چۆن ئیجتیهادەکانی ئیمام لەگەڵ سەدان فەرموودەی سەحیح پێکهاتووتەوە لە کاتێکدا تەنها چەند فەرموودەیەکی لەلا بووبێت؟

[1] الخيرات الحسان ص٣٣.

٣. ئیبن شەیبە لە کتێبەکەیدا دەروازەیەکی کردووەتەوە بۆ ئەو بابەتانەی ئەبو حەنیفە پێچەوانە لەگەڵ فەرموودە وەستاوەتەوە کە سەد و بیست و پێنج بابەتن، گەر ئـەوەی ئیبن شەیبە دروست بێت کەوابوو لە هەشتا و سێ هەزار بابەتدا ئەبو حەنیفـە لەگـەڵ فەرموودەدا پێکهاتووەتەوە، ئایا ئەو ژمارە زۆرە -کە ئـیبن ئـەبی شـەیبە دان بـەوەدا دەنێت ئەبو حەنیفە لەگـەڵ سـوننە تیایانـدا پێچـەوانە نـەبووە- دەکرێـت بـە چـەند فەرموودەیەکی کەم ئەنجام درابێت؟

٤. ئەبو حەنیفە لەو زانانەیە را و بۆچـوونەکانی لـە زانسـتی "زاراوەی فـەرموودە"دا دەگوێزرێنەوە، ئیتر چۆن دەکرێت لەو مەیدانەدا کەم شمەك بووبێت؟!

٥. ئەبو حەنیفە لە چوار هەزار شێخەوە زانست و فەرموودەی نووسیوە و وەرگرتـووە، زەهەبی لەسەری نووسیویەتی: یەحیای کوڕی نەصر دەڵێت: چووم بۆ لای ئەبو حەنیفـەماڵەکەی پڕ بوو لە کتێب، وتم: ئەمانە چین؟

وتی: ئەمانە فەرموودەن تەنها کەمێکیم باس کردووە کە سوودی لێ دەبینرێت[١].

٦. ئەبو حەنیفە هەرچەند وەك ئەهلی فەرموودە دانەنیشتووە بۆ گێڕانەوەی فـەرموودە و کتێبی لـەو بـارەوە دانـەناوە وەك مالیـك، بـەڵام قوتابییـەکانی فـەرموودەکانیان کۆکردووەتەوە کە دەگاتە دەیان مەسنەد، بەناوبانگترینیان بریتییە لە:

- "کتاب الآثار"ی ئەبی یوسف.
- "کتاب الآثار المرفوعة"ی محەمەد .
- "الآثار المرفوعة والموقوفة" لە مەسنەدی حەسەنی کوڕی زیاد.
- هەروەها مەسنەدی حەمادی کوڕی ئیمام ئەبو حەنیفە، و هتد..
- پاشان هەموو ئەو مەسنەدانە لە مەسنەدێکی گەورەدا کۆکراونەتـەوە بـە نـاوی "جامع المسانید" لەلایەن محەمەدی کوڕی مـەحموودی خوارەزمیـەوە کـە سـاڵی (٦٦٥ك) مردووە.

---

[١] واتە بۆ ئیجتیهاد سوودی لێ دەبینرێت.

## ئایا ئەبو حەنیفە ڕای پێش فەرمووده دەخست؟

**ئیبن ئەبی عەوام بە سەنەدی خۆی بۆ سەر ئەبی یوسف تەخریجی کردووە دەڵێت:** ((گەر بابەتێك بهاتبایەتە پێشەوە ئەبو حەنیفە دەیپرسی: چیتان لە لایە لە هەواڵ(فەرموودە و قسەی هاوەڵان)؟ گەر ئاسارمان لەلابوایە باسمان دەکرد و ئەویش ئەوەی لەلایەتی لە تێڕوانین باسی دەکرد، گەر ئاسار لەسەر دوو را بوایە رای زۆرینەی وەردەگرت، گەر لەیەکتر نزیکبوونایە و هاوتای یەکتر بوونایە ورد دەبوویەوە و هەڵبژاردنی دەکرد))[1].

موەفەق خوارەزمی بە سەنەدی خۆی بۆ سەر ئەبی موقاتیل لە کتێبی "العالم والمتعلم"دا تەخریجی کردووە لە ئەبی حەنیفەوە وتوویەتی: ((هەموو ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی-بیستبێتمان یان نەمانبیستبێت- لەسەر سەر و لەسەر چاوە، ئیمانمان پێهێناوە بەو جۆریە کە پێغەمبە(ﷺ) فەرموویەتی)).

**هەروەها ئیبن عبدالبر لە "الأنتقاء"دا تەخریجی کردووە لە ئەبو حەنیفەوە وتوویەتی:** ((نەفرەت لەو کەسەی سەرپێچی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەکات، بە پێغەمبەر خودا ڕێزی لە ئێمە ناوە و بە پێغەمبەر(ﷺ) رزگارمان دەبێت))

**"الشعرانی" لە "المیزان"دا لە ئەبی حەنیفەوە(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** ((سوێند بە خودا ئەو کەسە درۆی کردووە و بوختانی بەدەمەوە کردووین کە دەڵێت: ئێمە پێوانە(قیاس) بەسەر دەقدا پێشدەخەین، ئایا لەدوای بوونی دەق پێویستمان بە پێوانە(قیاس) دەبێت؟))

**بە هەمان شێوە لە ئەبو حەنیفەوە دەگوێزێتەوە وتوویەتی:** ((ئێمە تەنها لەباری زۆر پێویستدا پێوانە دەکەین، یەکەمجار تەماشای کیتاب و سوننە و قەزاوەتی هاوەڵان دەکەین و بەوە کار دەکەین ئەوان لەسەری رێکەوتوون، گەر جیاوازیان لە نێواندا هەبوو حوکمێك پێوانە دەکەینە سەر حوکمێك کە یەك هۆی نێوان دوو بابەت(دوو پرس) کۆیاندەکاتەوە تاکو ماناکە رۆشن ببێتەوە)).

---

[1] تأنيب الخطيب: ص٨٦.

**هەروەها لە ئەبو حەنیفەوە دەگوێزێتەوە وتوویەتی:** ((ئــەوەی لــە پێغەمبــەرەوە(ﷺ)- دایك و باوكم فیدای بێت- هاتووە لەسەر سەر و لەسەر چاوە، بۆمان نییە سەرپێچــی لێ بكەین، ئەوەش لــە هاوەڵانییــەوە هــاتووە هەڵبــژاردنمان پــێ دەدات، ئــەوەش لــە كەسانێكەوە هاتووە جگە لە ئەوان ئەوان پیاون و ئێمەش پیاوین))[1].

**ئیبن قەیم لە "أعلام الموقعین"دا دەڵێت:** ((هاوەڵانی ئەبو حەنیفە كۆدەنگییان لەسەر ئەوە هەیە مەزهەبی ئەبو حەنیفە فــەرموودەی لاوازیــان لــە پێوانــە و را لەپێشــترە و لەسەر ئەوەش مەزهەبەكەی بینا كردووە، وەك چۆن فەرموودەی **"القهقهــة"**ی بەســەر "پێوانە و را"دا پێشخستووە، هەروەها فەرموودەی دەستنوێژ بە دۆشاوی خورمــا لــە سەفەردا لەگەڵ لاوازییەكەی پێشخستووە بەسەر پێوانە و رادا، هەر بەو جــۆرە بــڕینی دەستی دز بە دزییەك كــەمتر لــە دە درهــەم كــە فەرموودەكــە لاوازە پێشخســتووە، هەروەها زۆرترین حەیزی بە دە رۆژ داناوە و فەرموودەكە لاوازە...هتد)).

دەڵێم: لاوازی فەرموودەكان لای ئەهلی فەرموودە ئەوە ناگەیەنێت لای ئەبو حەنیفــە بە لاواز تەماشاكرابن بەو مانایەی پێشین ویستوویانە، بەڵكو دەبێ ئــەو فەرموودانــە لەلای دروست بووبن بینا لەسەر بناغە گشتییەكەی.

ئیبن ئەبی شەیبە رەخنەی ئەوەی لە ئەبو حەنیفە گرتووە سەرپێچی لە ســەد و پــەنجا فەرمووده كردووە.

**وەڵامەكەی لە چەند روویەكەوە:**

١. لەڕووی سەنەدەوە سەرنج و تێڕوانینەكان جیاوازن لە بڕیــاردان لــە دروســتی یــان لاوازی فەرموودەیەك، ئەوەی ئەبو حەنیفە -بۆ نموونە- بــە دادپــەروەر و جێمتمانــەی زانیوە لەلای كەسانی تر جێی تانەلێدان بــووە، گومــانی تێــدا نییــە ئــەبو حەنیفــە شارەزاتر و بەئاگاتر بووە لەو شێخانەی خۆی كە فــەرموودەی لــێ وەرگرتــوون، ئــەو لەڕووی كاتەوە زۆر پێشكەوتووترە لەوانەی رەخنە لە شێخەكانی ئەبو حەنیفە دەگرن، زۆرجار لە نێوان ئەبو حەنیفە و هاوەڵانی پێغەمبەردا تەنها دوو راوی بوونی هەیــە،

[1] هذه النصوص عن الشعراني في ميزانه ١/٥١ وما بعدها.

لەم بارەدا لەسەری ئاسان دەبێت ڕەخنە لەو دوو ڕاوییە بگرێت بەهۆی نزیکی ئەبو حەنیفە لە ئەوانەوە، هەروەها لەبەر بوونی کەسانێك پرسیاریان لێ بکات دەربارەی ئەوانە، بەڵام جگە لە شێخەکانی خۆی لە ڕاوییەکانی شام و عێراق ئەبو حەنیفە زۆرجار لەسەریان وەستاوە، بۆیە وازی لە کارکردن بە هەندێ فەرموودە هێناوە لای کەسانی تر بە سەحیح دانراون، وەك چۆن کەسانی تر وازیان هێناوە لە کارکردن بە کۆمەڵێك فەرموودە ئەبو حەنیفە بە سەحیحی داناون.

٢. کەسی موجتەهید شتێك لە فەرموودەیەکدا -کە لەلای خۆی و لای کەسانی تر سەحیحە- دەبینێت کە لە ڕووالەتەکەی دوور دەکەوێتەوە بۆ ڕوویەکی تر بەهۆی بەڵگەیەکەوە لەلای ئەو ڕاستبووەتەوە، یان بانگە دەکات بۆ وازهێنان لە کارکردن پێی بە هۆیەکی شاراوە یان بەرهەڵستی کردنی بەڵگەیەکی بەهێزتر لەلای موجتەهیدەکە یان بە هۆی باوەڕی بوونی وەهم لەلای ڕاوییەکە یان نەسخ لە فەرموودەکەدا، یان تایبەتکردنی گشتی یان کۆتوبەندکردنی ڕەها، لەو کاتانەدا کارکردن بەو فەرموودەیە وازلێدەهێنێت، لەو بارەدا ئەهلی فەرموودە یان کەسانی تر پێیانوایە ئەو موجتەهیدە کارکردن بە فەرموودەی سەحیحی وازلێهێناوە، لەیسی کوڕی سەعد حەفتا فەرموودەی سەحیحی هێناوە ئیمامی مالیك کاری پێنەکردووە، ئەوانەش مالیك لە "الموطأ"دا تەخریجی کردوون.

٣. ئێمە ئەوە ڕەد ناکەینەوە لەوانەیە شتێك لە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) نەگەیشتبێتە دەستی ئەبو حەنیفە، چونکە هاوەڵان بە وڵاتاندا بڵاوەیان کرد بوو، لە هەر وڵاتێکیش کۆمەڵێك فەرموودە بوونیان هەبووە کە لە وڵاتێکی تر بوونیان نەبووە، هیچ کەس لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان بانگەشەی ئەوەی نەکردووە هەموو سوننەی لەلا بێت.

٤. ئەبو حەنیفە مەرجی زۆر وردی هەبووە بۆ قبوولّ کردنی هەواڵ(فەرموودە و قسەی هاوەڵان)، ئەوەش وایکردووە بەو جۆرە بێت بڵاوەکردنی درۆ و بەناوفەرموودەی هەڵبەستراو بووە لە سەردەمی ئەودا، بۆیە لە خەمخۆری بۆ ئایینی خودا خۆپارێزی زۆری کردووە و لە وەرگرتنی هەواڵ توندگیری نواندووە.

**نموونەی دیدگای ئەبو حەنیفە لە هەندێ فەرموودەدا:**

١. ئەبو حەنیفە لە **"دار الخیاطین"** لەگەڵ ئەوزاعی کۆبوویەوە، قسە و گفتوگۆیان دەربارەی زانست بوو، ئەوزاعی وتی: بۆچی لە چوون بۆ رکوع و لە بەرزبوونەوە لە رکوع دەستتان بەرز ناکەنەوە؟

ئەبو حەنیفە وتی: چونکە شتێکی سەحیح لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) لەو بارەیەوە نەهاتووە، ئەوزاعی وتی: چۆن؟ لە کاتێکدا "الزهری" لە "سالم"ەوە لە باوکییەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) بۆی باسکردووم: پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك نوێژی دادەبەست و کاتی چوون بۆ رکوع و کاتی بەرزبوونەوە لە رکوع دەستی بەرز دەکردەوە؟

ئەبو حەنیفە وتی: حەماد بۆی باسکردم لە ئیبراهیمی کوڕی عەلقەمەوە لە ئەسوەدەوە لە عەبدولڵای کوڕی مەسعوودەوە: ((پێغەمبەر(ﷺ) تەنها لە کاتی دابەستندا دەستەکانی بەرز دەکردەوە)) و دەستی لەدوای ئەوە بەرزنەدەکردەوە، ئەوزاعی وتی: من لە زوهەرییەوە لە سالمەوە لە ئیبن عومەرەوە بۆ تۆی باس دەکەم کەچی تۆ دەڵێیت حەماد لە ئیبراهیمەوە بۆی باس کردم؟

ئەبو حەنیفە وتی: حەماد لە زوهەری فەقیهتر بوو، ئیبراهیمیش لە سالم فەقیهتر بوو، عەلقەمە لە خوار ئیبن عومەرەوە نییە، گەر ئیبن عومەر هاوەڵی بۆ هەبێت ئەوا ئەسوەد فەزڵێکی زۆر گەورەی هەیە، لە ریوایەتێکی تردا: ئیبراهیم لە سالم فەقیهترە، گەر فەزڵی هاوەڵی نەبوایە دەموت: عەلقەمە لە ئیبن عومەر فەقیهترە، عەبدولڵاش عەبدولڵایە، بۆیە ئەوزاعی بێدەنگ بوو))[1].

**٢. سوفیانی کوڕی عویینە لەگەڵ ئەبو حەنیفە کۆبوونەوە، پرسیاری لێ کرد:** ئەوە راستە تۆ فتوات داوە دوو فرۆشیارەکە(کڕیار و فرۆشیار) هەڵبژاردنیان بۆ نامێنێتەوە گەر لە قسەکردن لەسەر کڕین و فرۆشتن لایاندا بۆ قسەکردن لەسەر شتێکی تر با لە هەمان شوێنی کڕین و فرۆشتنەکەشدا مابنەوە؟ ئەبو حەنیفە وتی: بەڵێ، سوفیان

---

١ حجة الله البالغة ١/٣٣١.

وتی: چۆن ئەو فتوایە دەدەی لە کاتێکدا فەرموودەی سەحیح لە پێغەمبەری خوداوە هاتووە: ((کڕین و فرۆشتن بە هەڵبژاردنە گەر لەیەکتر جیانەبنەوە))؟

ئەبو حەنیفە وتی: باشە گەر ئەو دوو کەسە لە کەشتییەکدا بوون، یان ئەو دوو کەسە لە بەندیخانەیەکدا بوون؟ یان ئەو دوو کەسە پێکەوە لە سەفەرێکدا بوون؟ چۆن لەیەکتر جیاببنەوە؟

تۆ دەبینی ئەبو حەنیفە فەرموودەکەی ڕەد نەکردووەتەوە بەڵکو "جیابوونەوە" بە جیابوونەوەی قسە لەسەر کڕین و فرۆشتنەکە حاڵی بووە نەك جیابوونەوەی جەستەیان لەیەکتری، ئەوەش وەك ڕەچاوکردنی مەرام لە گرێبەستەکاندا.

## ئەڵقەی زانستی ئەبو حەنیفە:

**ئیبن عەوام لە نوحی کوڕی ئەبی سوفیانەوە تەخریجی کردووە دەڵێت:** موغیرەی کوڕی حەمزە پێی وتم: هاوەڵانی ئەبی حەنیفە کە کتێبەکانیان لەگەڵ دەنووسییەوە چل پیاوی مەزنی ناو مەزنەکان بوون))

هەر بە سەنەدی خۆی بۆ سەر ئەسەدی کوڕی فورات باس لەوە دەکات هەندێك لە دە پێشکەوتووەکە لەو چل پیاوە ئەمانە بوون: **"أبو یوسف، و زفر بن الهذیل، و داود الطائي، وأسد بن عمرو، و یوسف بن خالد السمتي، و یحیی بن زکریا"**

**لە ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمەوە دەڵێت:** هاوەڵانی ئەبو حەنیفە لە بابەتێکدا ڕۆدەچوون، گەر **"عافیة بن یزید"** ئامادە نەبوایە ئەبو حەنیفە دەیوت: بابەتەکە دامەخەن تا **"عافیة"**ش ئامادە دەبێت، گەر ئامادەبوایە و لەگەڵیان تەبا بوایە ئەبو حەنیفە دەیوت: ئێستا جێگیری بکەن، گەر لەگەڵیان تەبانەبوایە ئەبو حەنیفە دەیوت: جێگیری مەکەن.

## قسەیەك لە ویژدانەوە:

لەم میانەدا قسەیەکی ئیبن عبدالبر جێگەی سەرسامیمە کە لە "جامع بیان العلم"دا هێناویەتی: ((هاوەڵانی فەرموودە لە زەمی ئەبو حەنیفە زیادەڕەوییان کردووە و

سنووریان تێپەڕاندووە، هۆی پێویست بۆ ئەو کارەیان هێنانی را و پێوانەیە و سەرخستنیان بەسەر ئاساردا، زۆربەی ئەهلی زانست دەڵێن: گەر ئەسەر(فەرموودە) دروست بوو پێوانە و بۆچوون پووچ دەبێتەوە، هەروەها رەدکردنەوەی هەندێ لە هەواڵی ئاحاد بە تەئویلێك کە هەڵیدەگرێت، زۆربەی ئەو کارانەی ئەبو حەنیفە شوێنکەوتنی ئەهلی شارەکەی خۆی بووە وەك ئیبراهیمی نوخەعی و هاوەڵانی ئیبن مەسعوود، هیچ کەسێك لە ئەهلی زانست بوونی نییە تەئویلی لە ئایەتدا یان لە سوننەتدا نەبێت، لە پێناوی ئەوەدا بە تەئویلێکی شیاو یان بانگەشەی نەسخ سوننەیەکی تری لای کەسانی تر رەد کردووەتەوە، بەڵام تەنها ئەوەندەیە ئەم کارە لای ئەبو حەنیفە زۆر کراوە و لای کەسانی تر کەم ئەنجام دراوە.



٢

# ئیمامی مالیك

## ٩٣-١٧٩ك

### ژیان و پله و پایەی زانستی ئەو:

باوکی عەبدولاَّ مالیکی کوڕی ئەنەسی ئەصبەحی ئیمامی مەدینە و بەناوبانگترین فەرموودەوێژی، ساڵی **٩٣**ك لە مەدینە لەدایك بووە و لە ساڵی **١٧٩**ك لە شاری مەدینە کۆچی دوایی کردووە، لە **"ربيعة الرأي"**وە زانستی وەرگرتووە، هەر بەو جۆرە لە گەورە شوێنکەوتووانەوە، گوێی لە **"الزهري"** گرتووە و بە بەناوبانگترین قوتابییەکانی ئەو دادەنرێت، هەر بەو جۆرە گوێی لە **"نافع"** گرتووە و بە ریوایەت لە ئەوەوە ناوبانگی دەرکردووە و ریوایەتەکانی لای ئەهلی فەرموودە بە زنجیرەی زێڕین ناودەبرێن کە بریتییە لە **"مالیك لە نافعەوە لە ئیبن عومەرەوە"**

### بنچینەی مەزهەبەکەی:

مالیك بە فیقھ و فەرموودە ناسراوە، هەروەها-هەروەك ئەبو حەنیفە- بەوە ناسراوە بەڵگەی بە فەرموودەی **"مرسل"** هێناوەتەوە، ژمارەیەك لەو **"مرسل"**انەی لە کتێبەکەیدا(**الموطأ**) تەخریج کردووە، بنچینەی مەزهەبەکەی بنچینەگەلێکی دروستن لەلای ئیمامەکان و بریتین لە: کیتاب و سوننەت و ئیجماع و پێوانە(قیاس)، دوو شتی تریشی خستوونەتە سەر: کاری ئەهلی مەدینە، و **"المصالح المرسلة"**، لەسەر ئەوەی کۆتایی دەڵێت: زۆربەی ئیمامان بە پەسەندی دەبینن، کاری خەڵکی مەدینەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە زانست و حاڵ لەسەری بووە، کاری ئەوان نابێتە بەڵگە هەتا هەموویان لەسەری کۆدەنگیان نەبێت و نەوە دوای نەوە بە میرات بۆیان بەجێنەمابێت تا دەگاتە چاخی پێغەمبەر(ﷺ) مەگەر کارێکی ڕەوا بێت هاوەڵان

لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) کاریان پێ کردبێت و پێغەمبەر(ﷺ) دانی پیادا نابێت و پاشان ئەوانەی دواتر بەمیراتیان گرتبێت و لەسەری هاتبن.

**کتێبی "الموطا" و پلە و پایە-ریوایەتەکانی و فەرموودەکانی- و شەرحەکانی:**

بەناوبانگترین کتێبێك لە ئیمامی مالیکەوە کتێبی **"الموطأ"**ە کە بە ئاماژەی مەنصوور(خەلیفەی عەباسی) دایناوە، داوای لێکردووە کتێبێك دابنێت لە توندییەکانی ئیبن عومەر و روخسەتەکانی ئیبن عەباس خۆی بەدوور بگرێت، **"السیوطي"** دەربارەی ناوی کتێبەکە لە مالیکەوە باس دەکات وتوویەتی: ((کتێبەکەم بۆ حەفتا فەقیھ لە فەقیهەکانی مەدینە خستەڕوو هەموویان لەگەڵ مـن لەسەری هاوڕابوون، بۆیە ناومنا **"الموطأ"**))

**ئایا "الموطأ" کتێبی فیقهە یان کتێبی فەرموودەیە:**

لەو کاتەوەی مالیك کتێبەکەی نووسیوە تا ئەم سەردەمەی ئێمە زانایان جیاوازیان لەوەدا نییە کتێبی **"الموطأ"** کۆنترین دانراوە لەسەر فەرموودە لە پێشینی سەدەی دووەمەوە بەدەستمان گەیشتبێت، بۆیە گرنگی پێدانیان بەم کتێبە زۆرە، گەر کتێبەکانی فەرموودە باس بکەن ئەم کتێبەش لەگەڵیان ناو دەهێنن، تا ئەم سەردەمە کە رۆژهەڵاتناسان دەستیان بۆ مێژووی ئێمە و زانایان و هاوەڵان برد کەسانێکیش لە موسڵمانان پەیدا بوون دەڵێن: کتێبی**"الموطأ"** کتێبی فیقهە نەك کتێبی فەرموودە.

**شوبهەی وتنی: "الموطأ" کتێبی فیقهە:**

**دکتۆر عەلی حسن عبدالقادر لە کتێبەکەیدا "نظرة عامة في تأريخ الفقه الإسلامي" دەڵێت:** ((کتێبی **"الموطأ"**-گەر ئەو کۆمەڵەی زەیدی لێ جیابکەینەوە- بە یەکەمین کتێبی فیقهی دادەنرێت لە ئیسلامدا بەدەستمان گەیشتبێت، ناتوانرێت بە یەکەمین کتێبی گەورە لە فەرموودە دابنرێت، سەرەڕای ئەو پلە و پایەی دانەرەکەی(ئیمامی مالیك) لە ئیسلامدا بەدەستی هێناوە، چونکە لە بنچینەدا بە کتێبی فەرموودە دانەنراوە و شوێنی لەپاڵ شەش کتێبەکەی فەرموودەدا بۆ دیارینەکراوە-جگە لە ئەهلی

مــەغریب- بــەڵام پاشــینەکان هــاتن و لــەناو کتــێبی فــەرمووده ســەحیحەکاندا دایاننا...))[1].

**وەڵامی ئەم شوبهەیە:**

١. ئەوەی مالیك ئەهلی فەرمووده نەبووبێت لادانە لە حــەق و پێچــەوانەی ئەوەیــە زانایان دەیڵێن، مالیــك لــە مــەزنانی ئــەهلی فــەرمووده بــوو، دانیشــتنەکانی بــۆ گێڕانەوەی فەرمووده بەناوبانگن و لــە هــەموو لایەکــەوه بــۆ وەرگــرتنی فــەرمووده روویان لێ دەکرد.

لەگەڵ ئەوەی ئیمامێکی فەرمووده بوو فەقیهێکی مەزن و ئیمامێك بــوو لــە ئیمامــانی فیقه، ئەو تەنها بۆ گێڕانەوەی فەرمووده دانەدەنیشت، بەڵکو لە پاڵ فەرموودەدا قسەی لە فیقهی فەرمووده دەکرد، واتە ئەو وەك یەحیای کوڕی موعین و ئەعمەش نەبوو، هەر بــەو جۆره فەقیهانی شوێنکەوتووان بە زۆری فیقه و فەرموودەیان کۆدەکردەوه.

ئەوەش لە کتێبەکەیدا "مرسل"ەکانی کۆکردووەتەوه بۆ ئەو بنچینە دەگەڕێتەوه لــە مەزهەبەکەی کە کار بە "مرسل" و "**منقطع**" دەکات، نەك ئەوەی گرنگی بە سەنەدی فەرمووده نەدابێت وەك ئەهلی فەرمووده گرنگــی پــێ دەدەن، چــۆن دەتوانرێــت ئــەو قسەیە لەسەر مالیك بکرێت لــە کاتێکــدا مالیــك دەڵێــت: ((لەوانەیــە شــێخێك بــە درێژایی رۆژەکەی لەلامان دابنیشێت تەنها یەك فەرموودەی لێ وەرنەگرین))

٢. ئەوەش "**الموطأ**" کتێبی فەرمووده نەبێت گرنگی پێدانی زانایان پێی-بە جیاوازی مەزهــەبییان- هەڵیدەوەشــێنێتەوه، ئــەوه **محەمــەدی** کــوڕی حەســەن بــە ئەوپــەڕی وردەکارییەوه دەیگێڕێتەوه لە کاتێکدا **محەمەد** لە هــاوەڵانی ئــەبو حەنیفەیــە، ئــەوه ئەوزاعی لە مالیکەوه دەیگێڕێتــەوه کــە ئیمــامی مەزهــەبێکی ناســراوه، ئــەوەش شافیعی کە لە مالیکی وەرگرتووه، ئەوانەش زانایانی حەنەفی و شــافیعی بــوون کــە راڤە و لێکدانەوەیان بۆ کردووه، راستە مالیکییەکان زیاتر لە کەسانی تــر گرنگیــان پێداوه چونکە کتێبی ئیمامەکەیان بووه کە خاوەنی مەزهەبەکەیانە.

---

[1] ص٢٤٤-٢٥٢.

گەر"**الموطأ**" کتێبی فیقه بوایه ئەو هەموو گرنگییەی لە هەموو مەزهەبەکانەوە پێ نەدەدرا، ئەوەش دەروازەکانی کتێبەکە بەپێی مەرامی فیقه و باسەکانی داڕێژراوە لەوە دەریناکات کتێبی فەرموودە بێت هەروەك چۆن بوخاری لە سەحیحەکەیدا هەمان کاری ئەنجامداوە و بە کۆدەنگی هەموان کتێبی فەرموودەیە.

باسکردنی رای هاوەڵان یان شوێنکەوتووان لە کتێبی فەرموودەدا کتێبەکە لە ریزی کتێبی فەرموودە دەرناکات بەتایبەت بۆ کەسێك پێیوایە وشەی "فەرموودە" بۆ هەموو ئەسەرێك لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) یان لە هاوەڵانەوە یان لە شوێنکەوتووانەوە بەکاردەهێنرێت.

ئەوەش کە کتێبی"**الموطأ**" لە ریزی شەش کتێبەکە ناژمێررێت بە هۆی ئەو فەرموودە "مرسل"انەوەیە مالیك بە زۆری هێناونی و ئەهلی فەرموودە خۆیانی لێ بەدوور دەگرن، تەنها هۆیەك بوو لە ریزی شەش کتێبەکە دانەنرێت..

ئەوەش گوایە تەقوای پاشینەکان وایکردووە لە ریزی کتێبی فەرموودە دابنرێت رای رۆژهەڵاتناسەکانە و گوزارشتی ئەوانە، ئەگینا مانای تەقوای پاشینەکان چییە؟

ئایا پێش ئەوان تەقوایان نەبوو تا ئەو کتێبە بەو جۆرە تەماشا بکەن؟

تەقوا چ پەیوەندییەکی بەم کارەوە هەیە؟

**ئەو قسەیە چۆن بەڕاست دەگەڕێت لە کاتێکدا شافیعی دەڵێت:** ((لەسەر زەویدا کتێبێك لە زانست بوونی نییە لە کتێبەکەی مالیك دروستی زۆرتر بێت)).

ئیبن صلاح وەڵامیداوەتەوە ئەو قسەیە بەر لە دەرکەوتنی کتێبی سەحیحی بوخاری و سەحیحی مسلم وتراوە[1].

  

[1] مقدمة علوم الحديث ص٩.٣

٣

# ئیمامی شافیعی

## ١٥٠-٢٠٤ك

**ژیان و پله و پایەی زانستی:**

ئەبو عبدالله **محەمەدی** کوڕی ئیدریسی کوڕی عەباسی کوڕی شافیع کە رەچەڵەکەکەی دەچێتەوە سەر **"قصي"** و لە "عبدالمناف"دا رەچەڵەکی بە پێغەمبەر(ﷺ) دەگاتەوە.

لە ساڵی ١٥٠ك لە غەزەی شام لەدایك بووە، لە تەمەنی دوو ساڵیدا دایکی هەڵگرت و بردی بۆ مەککە، لەوێ گەورە بووە و قورئانی لەبەرکردووە، لەناو **"هذیل"**دا بۆ ماوەی دە ساڵ ماوەتەوە و لێیانەوە فێری زمان و هۆنراوە بووە، فیقهی لە **"مسلم بن خالد الزنجي"** مفتی مەککە وەرگرتووە، پاشان چووە بۆ مەدینە و بووە بە قوتابی مالیك و هەموو **"الموطأ"**ی لێ وەرگرتووە، مالیك زیرەکی و هێزی یادەوەری و لێهاتووی لە شافیعی بینیوە بۆیە رێزی تایبەتی لێگرتووە.

پاشان شافیعی لە یەکێك لە ویلایەتەکانی یەمەن کار دەگرێتە دەست، لەلای هاروونە رەشید بۆی تێدەچێنن و بانگدەکرێت بۆ بەغداد وەك تۆمەتبارێك بە شیعەگەری و بانگکردن بۆ ئالوبەیت، ئەوەش لە ساڵی ١٨٤ك دەبێت، **محەمەدی** کوڕی حەسەن دەکەوێتە نێوانەوە تا بۆ بێتاوانی شافیعی رەشید قەناعەت پێ دەکات، لێرەوە پەیوەندی بە ئیمام **محەمەد**ەوە دروست دەبێت و کتێبی هاوەڵانی **محەمەدی** لێ وەردەگرێت، تا دەڵێت: ((لە بەغداد دەرچووم باری حوشترێك زانستی **محەمەدی** کوڕی حەسەنم لەگەڵ خۆم هەڵگرتبوو)) پاشان گەڕایەوە بۆ مەککە.

بەردەوام لە نێوان عێراق و حیجازدا هاتووچۆی دەکرد تا ساڵی ١٩٩ك لە مصر نیشتەجێ بوو و لەوێ مەزهەبە نوێیەکەی تۆمار کرد و لە ساڵی ٢٠٤ك کۆچی دوایی

کرد لە دوای ئەوەی دونیای پڕ کرد لە زانست و ئیجتیهاد و کۆمەڵێك قوتابی نموونەیی لە مصر و عێراق بۆ پەیدا بوو.

## ڕۆڵی شافیعی لە بەرگری کردن لە سوننەت:

جگە لە پلە و پایە فیقهییەکەی ئیمامی شافیعی لەلای ئەهلی فەرمووده پلە و پایەیەکی نایابی پێدراوە، شافیعی ئەو کەسەیە ڕێساکانی ریوایەتی دامەزراندووە، و بەرگرییەکی توندی لە سوننە کردووە، ئەو رایانەی خۆی ڕاگەیاندووە پێچەوانە بوون بە رایەکانی ئەبو حەنیفە و مالیك، ئەوەش ئەوەیە هەر کات فەرمووده بە سەنەدێکی گەیشتوو بە پێغەمبەر(ﷺ) سەحیح بوو پێویستە کاری پێ بکرێت بەبێ ئەوەی کۆتوبەند بکرێت بە کاری ئەهلی مەدینە وەك مالیك بە مەرجی گرتووە یان بەو مەرجانەی تر ئەبو حەنیفە بە مەرجی گرتووە، بەوەش چووەتە بەرەی ئەهلی فەرمووده کە وایان لێهاتووە بە "سەرخەری سوننە" ناوی بهێنن، لە ڕاستیدا **"الرسالة"** و باسەکانی کتێبی **"الأم"** بەنرخترین دانراوێکن شافیعی بۆ بەرگری لە حوجەتبوونی سوننە دایناپێت، هەر کەس لەسەر زاراوەکانی فەرمووده و باسەکانی سوننە و کیتاب لە زانایانی ئوسولّ شتێکیان نووسی بێت لەو مەیدانەدا قەرزداری شافیعین.

**لێرەدا ئەوەی محەمەدی کوڕی حەسەن دەیڵێت دروستە:** ((گەر ڕۆژێك ئەهلی فەرمووده قسە بکەن بە زمانی شافیعی قسە دەکەن)).

**هەروەها "الزعفراني" دەڵێت:** ((ئەهلی فەرمووده نووستبوون شافیعی بەئاگای هێنان)) لێرەوەیە زانایانی فەرمووده بە مەزن تەماشای دەکەن و بەخێر ناوی دەهێنن، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێت: ((هەر کەس قەڵەم و مەرەکەبی بەدەستەوە بێت لە گەردنیدا منەتبارییەك بۆ شافیعی هەیە)). هەروەها دەڵێت: ((پوختەمان لە راڤەکراو و نەسخکەرمان لە نەسخکراو لە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) جیانەدەکردەوە تا لە خزمەتی شافیعیدا دانیشتین)). **"عبدالرحمن بن مهدي"** دەڵێت: ((کاتێك لە ریسالەی شافیعی وردبوومەوە سەرسام بووم چونکە قسەی پیاوێکی ژیرمەندی زمان پاراوی ئامۆژگاریکەرم بینی، من دوعای زۆری بۆ دەکەم)).

**"الكرابيسي"** دەڵێت: ((نەماندەزانی کیتاب و سوننە چییە تا لە شافیعیمان بیست، کەسم نەدیوە وەك شافیعی، شافیعیش کەسی وەك خۆی نەدیوە، هیچ کەسم نـەبینیوە بە ئەندازەی ئەو زمان پاراو و عاریف بێت)).

**بنچینەی مەزهەبەکەی:**

بنچینەی مەزهەبەکەی وەك بنچینەی ئیمامەکانی تر بـوو: کـارکردن بـە کیتـاب و سوننەت و پێوانە و ئیجماع، بەڵام کارکردنی بە سوننە لەلای بازنەکەی بەرینتر بـووە لە مالیك و ئەبو حەنیفە لە رووی وەرگرتنی هەواڵی ئاحادەوە، لـەرووی کـارکردن بـە **"مرسـل"** بازنەکـەی بەرتەسـکتر بـووە، مەگـەر "مرسـل"ی گـەورە پیـاوان لـە شوێنکەوتووان وەك سەعیدی کوڕی موسەیب، هەروەها یەکێکی تر لـە بنچـینەکانی بریتییە لـە **"الإستصـحاب"** حەنەفییـەکان ئـەم رێسـایەیان لـە "الـدفع-پاڵنـان"دا بەکارهێناوە نەك لە **"الإثبات-جێگیرکردن"**دا.

تەنها مەسنەدی شافیعی وەك کتێبی فـەرموودە لـە شـافیعییەوە گوازراوەتـەوە بـە ریوایەتی **"أبي العباس الأصم"**، هەروەها **"سنن الشافعي"** بە ریوایەتی **"الطحاوي"**، وا دەردەکەوێت لە دەرهێنانی قوتابییەکانی شافیعییە نەك لە دانانی خـودی شـافیعی هەروەك مەسنەدەکانی ئەبو حەنیفە، ئەوەش لەبەر ئەوەی شـافیعی دانەنیشـتووە بـۆ گێڕانەوەی فەرموودە وەك ئەهلی فەرموودە ئەنجامیان دەدا و گرنگی بە کۆکردنـەوەی ریوایەتەکان و رێگەکان نەدەدا وەك ئەوان گرنگیان پێ دەدا، بـەڵکو ئـەو ئیمـامێکی موجتەهید بوو، لە سوننەدا بۆ هەر شتێك دەگـەڕا بتوانرێـت بکرێتـە بناغەیـەك لـە بناغەکانی تەشریع، ئەو بەدوای فەرموودەدا دەگەڕا تاکو بیکاتە ناوك بۆ ئیجتیهاد و فیقهەکەی، نەك کتێب و لاپەڕەکانی پێ پڕ بکاتەوە، ئەوە ئەو جیاوازییەیە لـە نێـوان ئەهلی فەرموودە کە بۆ فەرموودە خۆیان یەکلاکردووەتەوە لەگەڵ ئیمامانی موجتەهید لە فیقه و تەشریعدا.

٤

# ئیمامی ئەحمەد

## ١٦٤-٢٤١ك

**ژیان و پلە و پایەی زانستی:**

ئەبو عبداللە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی شەیبانی، لە شاری بەغداد ساڵی ١٦٤ك لەدایك بووە و تیایدا گەورەبووە.

لە سەرەتاوە لە دانیشتنەکانی ئەبو یوسفدا ئامادە دەبوو، پاشان روویکردە کۆکردنەوەی فەرموودە، بەردەوام خەریکی کۆکردنەوە و نووسینی فەرموودە بوو لە شێخەکانییەوە تا لە پارێزگاری سوننەت گەیشتە لوتکە و ئابلۆقەدان پێی و بوو بە یەکێك لە ئیمامانی سوننەی چاخی خۆی.

یەکەمجار فیقهی لە شافیعییەوە وەرگرتووە پاشان شافیعی فەرموودەی لە ئەو وەرگرتووە، ئیمامی بوخاری و مسلم لە قوتابییەکانی ئیمام ئەحمەدن، لە وەرع و زوهد و ئەمانەت و پێداگری لە حەق پلە و پایەیەکی مەزنی هەبووە.

رووبەڕووی فیتنەی خەلقی قورئان بوویەوە و لەسەری ئارامی گرت لە سەردەمی مەئموونەوە بۆ سەردەمی متەوەکیل، بە هۆی هەڵوێستە نەمرەکەی ئەوەوە گەورەترین کاریگەری لە دڵی جمهووری موسڵماناندا بۆ مانەوە لەسەر حەق سەریهەڵدا، دامەزران و ئارامگرتنی لەسەر ئەو میحنەتە پلە و پایەی لە دڵی موسڵماناندا بەرزکردەوە و دانیان بە ئیمامەتی ئەودا نا.

**شایەتی زانایان بۆ ئیمام ئەحمەد زۆر و بەردەستن، تەنها قسەکەی شافیعی بەسە کە دەڵێت:** ((لە بەغداد دەرچووم پیاوێکم لە دوای خۆم بەجێنەهێڵا باشتر و زاناتر و واریعتر و لەخواترستر بێت لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل)).

ساڵی ٢٤١ك کۆچی لە بەغداد دوایی کردووە.

**بنچینەی مەزهەبەکەی:**

بنچینەی مەزهەبەکەی بنچینەی ئیمامەکانی ترە:

کیتاب و سوننەت و ئیجماع و پێوانەیە، زۆر دەستی بۆ سوننە بردووە تا دەڵێت: ((فەرموودەی لاواز لەلام لەپێشترە لە رای پیاوان)).

ئەو زۆر شوێنی رای هاوەڵان دەکەوت، تا گەر هاوەڵان دوو را یان سێ رایان لە بابەتێکدا هەبوایە ئەویش دوو را یان سێ رای لە بابەتەکەدا هەبوو، بۆیە هەندێ لە زانایان لە ئیمامە فەقیهەکان سەرژمێری ناکەن وەك چۆن ابن عبد البر لە کتێبی **"الإنتقاء"**دا رایگەیاندووە، هەروەها **"ابن جرير الطبري"** لە **"إختلاف الفقهاء"**دا هەمان بۆچوونی هەبووە و بە هۆی ئەوەوە ئازارێکی زۆری لەدەست حەنبەلییەکان چەشتووە، بەڵام لەراستیدا ئەو ئیمامێکی موجتەهیدی فەقیه بوو و هیچ گومانێك لەوەدا بوونی نییە، با رەنگی فەرموودەش بەسەریدا زاڵ بووبێت.

**مەسنەد: پلە و پایەکەی و فەرموودەکانی:**

نەمرترین و مەزنترین و بەسوودترین ئاساری ئیمام ئەحمەدە لەسەر سوننە، کتێبەکەی بە ناوی "المسند" کە چل هەزار فەرموودەی تێدا هێناوە و دە هەزاری دووبارەیە، لە کۆی حەوتسەد و پەنجا هەزار فەرموودە لەبەری بوون هەڵیبژاردووە، رێگەکەی لە دانانی کتێبەکەدا ئەوەیە فەرموودەی هەر هاوەڵێك لە دەروازەیەکی تایبەتدا کۆدەکاتەوە، بۆ نموونە ئەوەی لە ئەبوبەکرەوە ریوایەتکراوە لە دەروازەیەکی تایبەتدا کۆیدەکاتەوە سەرەڕای جیاوازی بابەتی فەرموودەکان.

**زانایان دەربارەی پلەی مەسنەدی ئیمام ئەحمەد جیاوازن:**

**دەستەیەك دەڵێن:** هەمووی حوججەیە و تەنها سەحیحی تێدا داناوە، ئەوەش وەك دەستبردن بۆ قسەکەی ئیمام ئەحمەد لە مەسنەدەکەیدا: ((گەر لە فەرموودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) جیاوازیتان بۆ دروست بوو بۆ مەسنەد بگەڕێنەوە، گەر بینیتانەوە باشە، ئەگەر نە ئەوە فەرموودەیەکە حوججەتی تێدا نییە)).

**دەستەیەکی تر دەڵێن:** سەحیح و لاواز و هەڵبەستراوی تێدایە، لەوانەی ئەو بۆچوونەی هەیە ئیبن جەوزییە، بیست و نۆ فەرموودەی لە هەڵبەستراوەکانیدا لە مەسنەدی ئیمام ئەحمەدەوە هێناوە و بڕیاری هەڵبەستنی بەسەردا داون، حافیزی عێراقی نۆ فەرموودەی تری خستووەتە سەر و بڕیاری هەڵبەستنی بەسەردا داون.

دەستەیەکیش هەڵوێستێکی میانەڕەویان هەیە و پێیانوایە سەحیح و لاوازیشی تێدایە، لاوازەکان لە حەسەن نزیکدەبنەوە، لەوانە ئیمامی زەهەبی و ئیبن حەجەر و ئیبن تەیمیە و **"السیوطي"**، ئەمانە شوێن بۆچوونەکەی ئیبن جەوزی و حافیزی عێراقی نەکەوتوون لەوەی پێیانوایە فەرموودەی هەڵبەستراوی تێدایە، بەڵگەیان بۆ ئەو فەرموودانە هێناوەتەوە و بەرگرییەکی گەورەیان لەو فەرموودانە کردووە تا رادەی زیادەڕەوی، ئیبن حەجەر لە کۆتاییدا چاری نەماوە دانی بەوەدا ناوە لە مەسنەددا سێ یان چوار فەرموودەی تێدایە هیچ بنچینە و بناغەیەکیان بۆ نییە، پاساوی بۆ ئیمام ئەحمەد هێناوەتەوە بەوەی بەر لە مردنی وەسێتی کردووە ئەو چەند دانەیە لە مەسنەدەکەی دەربکەن.

**ئیمام ئەحمەد لە فەرموودەی "فضائل"**دا تا رادەیەك ئاسانکاری دەکرد، چونکە ئەو لە جەرح و تەعدیلدا لە میانەڕەوەکان بوو، کوڕەکەی ئیمام ئەحمەد(عبدالله) و راوییەکەی **"أبوبكر القطيعي"** هەندێ شتی نەناسراویان لە مەسنەد زیاد کردووە، ئەوەم زانی ئیبن جەوزی و حافیزی عێراقی لەسەر حەق بوون و دوو کەس بوون تەنها رەخنەیان لە سەنەد نەگرتووە بەڵکو رەخنەیان لە مەتنیش گرتووە و لە کارەکەی خۆیاندا زۆر بەتوانا و لێوەشاوە بوون، بەرگری ئیبن حەجەر و سیوتی تەنها دەمارگیرییەکی ئایینی بووە بۆ بەرگری لە ئیمامێکی مەزنی سوننە(رەحمەتی خودای لێ بێت)، ئەوە هیچ زیانێك بەو ئیمامە ناگەیەنێت، ئیبن تەیمیە لە **"منهاج السنة"**دا دەڵێت: ((ئیمام ئەحمەد لە مەسنەددا بە مەرجی گرتووە هیچ شتێك ریوایەت نەکات لەو کەسانەوە بە درۆ ناسراون، هەرچەند لە مەسنەددا لاوازی تێکەوتووە، پاشان عەبدوڵای کوڕی ئیمام ئەحمەد هەندێ لە فەرموودەی نەناسراوی بۆ زیاد کرد کە هەندێ لەوانە فەرموودەی دانراو و هەڵبەستراون، بۆیە کەسانێك کە زانستیان نەبوو وا گومانیان برد ئەو فەرموودانە ریوایەتی ئەحمەدن لە مەسنەدەکەیدا)).



# ئیمامی بوخاری

## ١٩٤-٢٥٦ك

باوکی عەبدولڵا محەمەدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی موغیرە، ئیمامی ئەهلی فەرموودە و شێخی لەبەرکەرانی سەردەمی خۆی، لە ڕۆژی هەینی ١٣ی شەوالی ١٩٤ك لە بوخارا لەدایك بووە.

هێشتا تەمەنی نەگەیشتبووە دە ساڵ دەستی بە لەبەرکردنی فەرموودە کرد، پاشان بەردەوام بوو لەسەری و بۆ کۆکردنەوەی دەستی بە گەشت و گەڕان کرد تا هەموو وڵاتە ئیسلامییەکان گەڕا.

**ئیمامی بوخاری دەڵێت:** ((دوو جار چوومە شام و مصر و جەزیرە، هەروەها چوار جار چوومە بەصرە و شەش ساڵ لە حیجاز مامەوە، زۆر جار چوومەتە کوفە و بەغداد لەگەڵ ئەهلی فەرموودە)). ناوی هەر شێخێکی ببیستبایە گەشتی دەکرد بۆ لای و تاقیدەکردەوە و پرسیاری لێ دەکرد و لێی وەردەگرت.

لە لەبەرکردن و هێزی لەبەرکردن و ئاگاهی بە سەنەد و مەتن ئایەتێك بوو بۆ خۆی، چیرۆکەکەی لە بەغداد کاتێك زانایان تاقیانکردەوە چیرۆکێکی بەناوبانگە، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر لەبەرکردن و ئەمانەتی ئەو لەم هونەرەدا، خودا بەرانبەر ئارامگری و شاندانە ژێر ناخۆشییەکان لە پێناوی سوننەتدا خەڵاتی کرد بە رووتێکردنی خەڵکی بۆ لای ئەو و باسکردنی چاکە و گەورەیی ئەو.

**"محمود بن الناظر" دەڵێت:** ((چوومە بەصرە و شام و حیجاز و کوفە و زانایانی ئەو شوێنانەم بینی هەر کات باسی محەمەدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری دەکرا بە گەورەتر لە خۆیان باسیان دەکرد)).

جارێك بوخاری گوێی لێ بوو شێخەكەی ئیسحاقی كوڕی راهەوەی بە قوتابییەكانی دەوت: ((گەر بتانتوانیبایە كتێبێكی پوخت لەسەر سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) كۆبكەنەوە)) بوخاری دەڵێت: ((ئەوە كەوتە دڵمەوە بۆیە دەستم كرد بە كۆكردنەوەی "الجامع الصحیح")).

شازدە ساڵ خەریكی كۆكردنەوە و پاڵفتەكردن و دانانی ئەو كتێبە بووە، هەركات فەرموودەیەكی تێدا دانابێت خۆی شۆردووە و دوو ركات نوێژی كردووە پاشان ئیستیخارەی كردووە بە خودا بۆ دانانی لە كتێبەكەیدا، هەر فەرموودەیەك بە سەنەدەكەی سەحیح و پەیوەست بووبێت و راوییەكانی خاوەنی عەدالەت و وردەكاری و دەرخ بووبن لە سەحیحەكەیدا دایناوە، بەوەوە نەدەوەستا قوتابییەكە هاوچەرخی شێخەكە بوایە، بەڵكو دەبوا قوتابییەكە لە شێخەكەی ببیستبایە و یەكتریان بینی بێت.

بەمە كتێبەكەی بووە بە یەكەمین كتێبی سوننە بەو مەرجە وردەوە، خۆی لە فەرموودەی لاواز و حەسەن بەدوورگرتووە، و تەنها ئەو فەرموودانەی داناوە سەحیح بوون، بوخاری سەحیحەكەی لەسەر دەروازەی زانست و فیقھ دامەزراندووە، وردەكاری بێسنووری هەیە و زۆر بە قووڵی لە فەرموودەكاندا رۆچووە، هەندێ جار ناڕوونییەك لە نێوان ناونیشانی دەروازەكە و تەبایی فەرموودەكە لەگەڵی بوونی هەیە، لە دەروازەیەك داوای فەرموودەیەك دەكەیت و نایبینییەوە، بەڵكو لە دەروازەیەكی تردا دەیبینییەوە كە بە بیرتدا نەهاتووە، تیایدا "موقوف" و "معلق" و فتوای هاوەڵان و شوێنكەوتوان و رای زانایانی لەسەر باس دەكات، هەستاوە بە بڕینی فەرموودە بۆ چەندین بەش لە هەر دەروازەیەكدا كە لەگەڵی گونجاوە باسی بەشێكی فەرموودەكە دەكات.

ژمارەی فەرموودەكانی-وەك ئیبن حەجەر باسی دەكات- بە دووبارەبوونەوە دەگاتە(٧٣٩٨) فەرموودە جگە لە "معلقات و متابعات و موقوفات" و بەبێ دووبارەبوونەوەی مەتنە"موصول"ەكان (٢٦٠٢) فەرموودەن.

كاتێك كتێبەكەی دانا و پوختەی كرد بەسەر "أحمد و ابن معین و ابن المدیني" و كەسانی تردا لە ئیمامانی فەرموودە خوێندییەوە هەموو ئەوانە بە باش و پەسەندیان بینی و شایەتی دروستیان بۆ دا جگە لە چوار فەرموودە.

**"العقيلي"** دەڵێت: ((قسه لەو چوار فەرموودەدا قسەی "بوخاری"یە))، کاتێك کەوتە بەردەست خەڵکی و دەستی بە گێڕانەوەی کرد ناوبانگی هەموو ئاسۆکانی پڕ کرد، خەڵکی لە هەموو لایەکەوە روویان لێکرد تا ئەوانەی لێیان وەرگرتووە ژمارەیان گەیشتووەتە سەد هەزار، نوسخەی کتێبەکەی بە هەموو وڵاتاندا بڵاوبوویەوە، خەڵکی دەستیان بە لەبەرکردن و لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە و پوختەکردنی کرد، خۆشحاڵی ئەهلی زانست پێی زۆر مەزن بوو.

زەهەبی دەڵێت: (("الجامع الصحيح"ی بوخاری مەزنترین کتێبی ئیسلامە و باشترینیانە لەدوای کتێبەکەی خودا(سبحانه وتعالى)، گەر کەسێك هەزار فەرسەخ ببڕێت بۆ بیستنی ئەو کتێبە گەشتەکەی بە هەدەر نەڕۆیشتووە)).

لەبەرکەرانی فەرموودە لە سەد و دە فەرموودەدا رەخنەیان لێگرتووە، هەیانە "مسلم" لەسەر تەخریج کردنیان تەبایە، هەشیانە تەنها بوخاری خۆی تەخریجی کردوون کە ژمارەیان (٧٨) فەرموودەیە، ئیبن حەجەر لە پێشەکییەکەیدا لەسەریان دەڵێت: ((هەموو عیللەتەکانیان تانەلێدراو نین، بەڵکو زۆرینەیان وەڵام بۆیان ئاشکرایە، و لادانی تانەکە لەسەریان گونجاوە، هەندێکیشی وەڵامدانەوەیان ئەگەرە، کەمێکی زۆر کەمیان وەڵامدانەوەیان زۆرلەخۆکردنە)).

هەر کەس بگەڕێتەوە بۆ ئەو فەرموودانەی کە رەخنەیان لێگیراوە و رەخنەکە بخوێنێتەوە دەبینێت ئەو رەخنەیە لە جەوهەری سەحیحەکە نییە، بەڵکو تەنها رەخنەیەکی رووالەتییە و لە زیادە حەزەری زانایانەوە و لە ئاگاهییانەوە سەریهەڵداوە، وەك بەرهەڵستکارییان لەسەر فەرموودەیەك بەوەی "مرسل"ە هەرچەند شێوەکەی شێوەی "مرسل"ە، بەڵام لە واقیعدا فەرموودەیەکی پەیوەستە و پەیوەستبوونەکەی ناسراو و زانراوە لەلای ئەهلی فەرموودە، هەروەها وەك فەرموودەیەك کە راوییەکە بە مورسەلی ریوایەتی دەکات لەلای هاودەمانی خۆی لە راوییەکان بە پەیوەست(متصل)ی ریوایەت کراوە، بەڵام بوخاری دوو ریوایەتەکە پێکەوە باس دەکات بۆ ئەوەی ئەو وەهمە بسڕێتەوە و رایبگەیەنێت ئەو عیللەتە بوونی نییە.

ئەمە نموونەی ئەو جۆرە رەخنانەن ئاراستەی فەرموودەی سەحیح کراوە و ئیبن حەجەر لە پێشەکییەکەیدا بەدرێژی باسی کردووە.

دەربارەی پیاوانی سەحیحی حافیزانی فەرموودە هەشتا پیاویان بە لاواز داناوە، بەلام زۆرینەیان لەو شێخانەن بوخاری پێیان گەیشتووە و لەگەڵیان دانیشتووە و حاڵی ئەوانی زانیوە و لە فەرمووده‌کانیان ورد بووەتەوە، بۆیە بوخاری بەوان و بە حاڵی ئەوان بەئاگاتر و شارەزاتر بووە، ئەوەی بەڵگەیە لەسەر کەم نەکردنەوەی بەها و نرخی زانستی کتێبەکەی-بە رەخنە لە پیاوان و فەرموودەکانی - کۆدەنگی زانایانە لەسەر وەرگرتنی ئەو کتێبە و قبووڵ کردنی و رێکەوتنی جمهووری زانایان لەسەر ئەوەی کتێبەکەی بوخاری دروستترین و راستترین کتێبێکە لە دوای کتێبەکەی خودا، لەوەدا جیاوازیان هەیە ئایا لە رووی جێگیربوونەوە ئەو فەرموودانە بڕاوەن و یەقین دەبەخشن؟

ئیبن صلاح پێداگری لەسەر بڕانەوە دەکات، ئیمامی نەوەوی پێچەوانەی ئیبن صلاح پێیوایە ئەو فەرموودانە گومان دەبەخشن نەك یەقین، هەر ئەم رایەش مەزهەبی جمهووری زانایانە. ئیمامی بوخاری ساڵی ٢٥٦ك کۆچی دوایی کردووە[1].

زانایان ئیسلام لەدوای قورئان بە ئەندازەی سەحیحی بوخاری گرنگیان بە هیچ کتێبێکی تر نەداوە، ژمارەیەکی زۆر لەسەر سەحیحی بوخارییان نووسیوە و شەرحیان کردووە و کورتیان کردووەتەوە و وەریانگێڕاوە، تەنها ئەوەندە بەسە بزانیت ژمارەی ئەو شەرحانەی لەسەر سەحیحی بوخاری نووسراوە گەیشتووەتە هەشتا و دوو شەرح، وەك خاوەنی **"كشف الظنون"** باسی کردووە، **لە بەناوبانگترین شەرحی بوخاری چوار شەرحە:**

- شەرحی ئیمام **"بدرالدين الزركشي"** کە ناوی "التنقيح"ی لێناوە(٧٩٤ك).
- شەرحی ئیبن حەجەر(٨٥٢ك) لە **"فتح الباري"**دا کە مەزنترینی ئەو شەرحانەیە و لە هەموویان بەناوبانگترە.
- هەروەها شەرحی **"العلامة العيني الحنفي"**(٨٥٥ك) لە **"عمدة القاريء"**دا.
- شەرحی**"الجلال السيوطي"**(٩١١ك) لە "التوشيح"دا.

---

[1] مقتبسة من مقدمة فتح الباري وغيرها.

٦

# ئیمامی مسلم

## ٢٠٤-٢٦١ك

ناوی مسلمی کوڕی حەجاجی قوشەیری نیساپوورییە، یەکێکە لە ئیمامەکانی فەرموودە و کەسە بەناوبانگەکانی ئەو مەیدانە، ساڵی ٢٠٤ك لە نیساپوور لەدایك بووە، لە منداڵییەوە بەدوای زانستدا گەڕاوە و پاشان رووی لە وڵاتانی ئیسلام کردووە، سەردانی عێراق و حیجاز و شام و مصری کردووە، لە شێخەکانی بوخاری و کەسانی تر زانستی وەرگرتووە، بوخاری زۆر خۆشدەویست و زۆر رێزی لێ دەنا، لە دانانی سەحیحەکەیدا چاوی لە بوخاری کردووە، بەڵام لە کۆتاییەکانی تەمەنیاندا جەفا کەوتووەتە نێوانیانەوە، ساڵی ٢٦١ك لە نیساپوور کۆچی دوایی کردووە.

کتێبێکی سەحیحی دانا کە بە "صحیح مسلم" بەناوبانگە، مەزنترین و دروستترین کتێبێکە لەگەڵ سەحیحی بوخاری، زۆربەی زانایان پارسەنگی سەحیحی بوخاری دەدەن بەسەر سەحیحەکەی مسلمدا لە چەند روویەکەوە:

١. مەرجی بوخاری لە بەیەکتر گەیشتنی دوو راوییەکە و بەبێ رازیبوون بە هاوچەرخبوونی ئەو دوو کەسە، بەڵام مسلم تەنها هاوچەرخبوون بە بەس دەبینێت.

٢. وردی فیقهی بوخاری، سەحیحەکەی کۆمەڵێك هەڵهێنجانی فیقهی لەخۆ دەگرێت لە سەحیحی مسلمدا نابینرێت.

٣. بوخاری حاڵ و باری پیاوانی پشکنیوە، حافیزانی فەرموودە تەنها قسەیان لەسەر هەشتا پیاوی سەحیحی بوخاری هەیە، هەرچەند زۆرینەی ئەو قسانە لەسەر پیاوانی سەحیحی بوخاری جێگەی گفتوگۆ و مشتومڕن، بەڵام ئەو پیاوانەی لە سەحیحی مسلمدا قسەیان لەسەرە ژمارەیان گەیشتووەتە سەد و شەست، لەگەڵ

ئەوەی بوخاری فەرموودەی زۆری لێوە باس نەکردوون، و زۆرینەیان لە شێخەکانی بوخارین و ئاگادار و شارەزا بووە بە نهێنی و حاڵیان زیاتر لە هەر کەسێکی تر رەخنەی ئاراستە کردوون.

٤. کەمی ئەو فەرموودانەی رەخنەیان لە بوخاری پێگیراوە لەڕووی شازبوونەوە و عیللەتدارییەوە بەراورد بەوەی لە سەحیحی مسلمدا رەخنەیان لێگیراوە، لەلای بوخاری ژمارەیان دەگاتە حەفتا و هەشت فەرموودە، بەڵام لەلای مسلم ژمارەیان دەگاتە سەد و سی.

لەم پێناوەدا زۆرینەی زانایان بۆ ئەوە دەچن پارسەنگی سەحیحی بوخاری بدرێت بەسەر سەحیحی مسلمدا و رێکەوتنیان لەسەر ئەوە هەبێت سەحیحی بوخاری لە سەحیحی مسلم لە زانستی فەرموودەدا مەزنتر و بالاتره، "مسلم" بۆ خۆی دانی بەوەدا ناوە، هەروەها مسلم لە بوخارییەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە، بەڵام بوخاری لە "مسلم"ەوە هیچی نەگێڕاوەتەوە.

راستە سەحیحی مسلم لە رووی هونەرییەوە کە بۆ دانان دەگەڕێتەوە تایبەتمەندی لە سەحیحی بوخاری زۆرترە، مسلم فەرموودەی نەپچڕاندووە و ئیسنادی دووبارە نەکردووەتەوە، بەڵکو هەموو ئەو فەرموودانەی کۆکردووەتەوە لەسەر دەروازەیەك هاتوون، ئەو رێگانەی پێیان رازی بووە تیایدا کۆکراونەتەوە، چەندین ئەسانید و گوزارەی جۆراوجۆری تێدا هێناوە، ئەوەش وایکردوە دەستبۆبردنی لەلایەن قوتابییەوە ئاسانتر بێت لە سەحیحی بوخاری، هەروەها پێشەکییەکی زۆر بەپێزی بۆ سەحیحەکەی نووسیوە تیایدا ئەوەی هانیداوە بۆ کۆکردنەوەی سەحیحەکەی و مەنهەجی خۆی لە سەحیحەکەیدا رۆشن کردووتەوە، چەند جوان وتراوە دەربارەی ئەو دوو سەحیحە:

قالوا: لمسلم فضل　　قلت: البخاري أعلى

قالوا: المكرر فيه　　قلت: المكرر أحلى

(وتیان: سەحیحی مسلم فەزڵی خۆی هەیە، وتم: سەحیحی بوخاری بالاترە، وتیان: سەحیحی بوخاری دووبارەبوونەوەی تێدایە، وت: دووبارەبوونەوەکە شیرینتری کردووە)

ژمارەی فەرموودەکانی -بێ دووبارەبوونەوە- گەیشتوونەتە چوار هەزار فەرموودە، لەگەڵ دووبارەبوونەوەشدا ژمارەیان گەیشتووەتە(٧٢٧٥)، زۆربەی ئیمامانی فەرموودە شەرحیان بۆ کردووە، خاوەنی کتێبی **"کشف الظنون"** باس لە پازدە شەرح دەکات، بەناوبانگترینیان شەرحی ئیمام ئەبو زەکەریا نەوەوی(٦٧٨ك)، ژمارەیەك لە زانایان سەحیحی **"مسلم"**یان پوختە کردووە، بەناوبانگترین پوختەکراو بریتییە لە:

- **"تلخيص كتاب مسلم وشرحه"- أحمد بن عمر القرطبي(٦٥٦ك)**.
- هەروەها پوختەکەی "**زكي الدين عبدالعظيم المنذري**"(**٦٥٦ك**)[١].

  

[١] تهذيب الأسماء للنووي٨٩/٢ ومفتاح السنةص٤٦.

٧

# ئیمامی نەسائی و سوننەنەکەی

## ٢١٥-٣٠٣ك

باوکی عبدالرحمن ئەحمەدی کوڕی شوعەیبی خوراسانی، ئیمامی چاخی خۆی بووە لە فەرموودەدا و لە زانستی جەرح و تەعدیلدا پێشەوا بووە، ساڵی ٢١٥ لە نەسا شارێکی بەناوبانگی خوراسان بووە لەدایك بووە.

لە ئیمامانی فەرمووده لە خوراسان و حیجاز و عێراق و مصر و شام و جەزیره فەرموودەی وەرگرتووە، پیاوێکی خۆپارێز و واریع بووە، لە زانستی فەرموودەدا لێهاتوو بووە، دەرخ و وردەکاری کەموێنە بووە.

تا ئیمامی زەهەبی باس لەوە دەکات نەسائی لە ئیمامی مسلم لەبەرکردنی زۆرتر و زیاتر بووە، لە ساڵی ٣٠٣ك لە رەملە کۆچی دوایی کردووە.

نەسائی یەکەمجار **"السنن الکبری"**ی دانا کە سەحیح و عیللەتداری لەخۆ گرتبوو، پاشان **"السنن الصغری"**ی دانا و ناوی نا **"المجتبی"**، لە پلە و پایەدا بەدوای سەحیح بوخاری و مسلمدا دێت، چونکە لە هەموو "سنن"ەکان کەمتر فەرموودەی لاوازی تێدایە.

**"السیوطي"** شەرحی سوننەنەکەی کردووە لە کتێبێکی پوختەدا ناوی ناوە: **"زهر الربی علی المجتبی"**، هەر بەو ئەبو حەسەن محەمەدی کوڕی هادی(١١٣٨ك) پوختەی کردووە و ئەوەی خوێنەر و مامۆستا پێی ئاتاجن تیایدا خستووەتە روو لە جووڵەدان بە وشەکان(حرکات) و رۆشنکردنەوەی وشە نامۆکان[١].

---

[١] تهذیب الأسماء للنووي ٨٩/٢، ومفتاح السنةص٧٩.




# ئیمامی ئەبو داود و سوننەنەکەی

## ٢٠٢-٢٧٥ك

سولەیمانی کوڕی ئەشعەس کوڕی ئیسحاقی سیجستانی، ساڵی ٢٠٢ك لە خۆراسان لەدایك بووە.

بۆ گەڕان بەدوای زانستدا رووی لە عێراق و شام و مصر و خوراسان کردووە، لە ماموستاکانی خۆیەوە فەرموودەی وەرگرتووە، وەك چۆن لە شێخەکانی بوخاری و مسلم وەك ئیمام ئەحمەد و ئیبن ئەبی شەیبە و قوتەیبەی کوڕی سەعید و کەسانی تر فەرموودەی وەرگرتووە، نەسائی و کەسانی تر فەرموودەیان لێ وەرگرتووە.

زانایان بە لەبەرکردن و زانست و تێگەیشتن و وەرع و ئایینداری مەدح و سەنایان کردووە، "الحاكم" لەسەری دەڵێت: ((ئەبو داود ئیمامی ئەهلی فەرموودەی سەردەمی خۆی بوو بەبێ کێبەرکێکار)).

لە شاری بەصرە ساڵی ٢٧٥ك کۆچی دوایی کردووە.

سونەنەکەی لە پێنجسەد هەزار فەرموودە پوختە کردووە و هەڵگۆزیوە، ژمارەی فەرموودەی سوننەنەکەی (٤٨٠٠) فەرموودەیە، تەنها فەرموودەکانی ئەحکامی تێدا جێکردووەتەوە، بەوەش یەکەمین کەسە لە خاوەنی سونەنەکان و سەحیحەکان لەسەر ئەحکام کتێبێك لە فەرموودە دادەنێت، سونەنەکەی ئەو فەرموودانەی لەخۆگرتووە کە فەقیهانی وڵاتەکانی ئیسلام بەڵگەیان پێهێناوەتەوە و ئەحکامیان لەسەر بیناکردووە.

ئیمام ئەبو سولەیمانی خەتابی لە کتێبی "معالم السنن"دا دەڵێت: ((بزانن-خودا رەحمتان پێ بکات- سونەنەکەی ئەبو داود کتێبێکی مەزنە، لە زانستی ئەحکامی ئایین هیچ کتێبێکی تر هاوشێوەی ئەو کتێبە دانەنراوە، لە هەموو خەڵکییەوە

قبوولکراوە و بووە بە دادوەر لە نێوان جیاوازی زانایان و توێژی فەقیهاندا بە جیاوازی مەزهەبیان، هەریەکەیان هەڵگۆزین و خواردنەوەیەکی لەو کتێبە بەدەستهێناوە، ئەهلی عێراق و مصر و شام و مەغریب و زۆرێك لە شوێنەکانی تر شانیان لەسەر داداوە، بەڵام ئەهلی خۆراسان زۆرینەیان هۆگری کتێبەکەی "مسلم"ن، هەرچەند کتێبەکەی ئەبو داود وەسفی باشتر و فیقهی زۆرتری تێدایە، هەر بەو جۆرە کتێبەکەی **"الترمذي"** کتێبێکی باش و پەسەندە)).

((ڕێگەی ئەبو داود لە دانانی سونەنەکەیدا هەواڵ لەمەڕ خۆی دەدات-وەك ئیبن صلاح لە پێشەکییەکەیدا گواستوویەتەوە[1]-: ((سەحیح و هاوشێوەی سەحیح و نزیك بە سەحیحم تێدا باس کردووە، لەم کتێبەمدا فەرموودەیەکم دانەناوە لاوازی تێدا بێت و ڕۆشنییەکەی لەدەستدابێت، کاتێك شتێکم لەو جۆرانە تێدا باس نەکردووە کەوابوو فەرموودەکان چاك و باشن و هەندێکیان لە هەندێکیان سەحیحترن)).

**ئیبن مەندە دەربارەی دەڵێت:** ((ئیسنادی لاوازی هێناوە گەر لەو دەروازەیەدا تەنها ئەو فەرموودە بوونی هەبووبێت، چونکە ئەوە لەلای لە ڕای پیاوان بەهێزتر بووە)).

**زۆرێك لە ئەهلی زانست سونەنەکەیان شەرح کردووە، لەوانە:**

- **"الخطابي"**(٣٨٨هـ) .
- **"قطب الدين اليمني"**(٧٥٢هـ) .
- شەهابەدینی ڕەمڵی(٨٤٤هـ) و **"المنذري"** پوختەی کردووە(٦٥٦هـ) ئیبن قەیم(٧٥١هـ) هەستاوە بە پوختەی ئەو پوختەیە، ئابادی شەرحی کردووە و ناوی ناوە (عون المعبود"، لە هاوچەرخانیش **"محمود خطاب السبكي"** شەرحی کردووە.

  

[1] ص١٨.

٩

# ئیمامی "الترمذي" و جامعەكەی

## ٢٠٩-٢٧٠ك

ئەبو عیسا محەمەدی كوڕی عیسای كوڕی سورەی سولەمی ترمزی، لە ساڵی ٢٠٠ك لـە **"ترمذ"** لەدایك بووە، فەرموودەی لە زۆر كەس وەرگرتووە، لەوانە بوخاری و كەسانی تر.

ئاسۆ بەرینەكانی دونیا گەڕاوە و لە خوراسانییەكان و عێراقییـەكان و حیجازییـەكان فەرموودەی وەرگرتووە تا بووە بە ئیمام لە فەرموودەدا، ئـایین و وەرع و خۆپـارێزی و متمانەی لە خۆدا كۆكردبووەوە.

**ئەبو یەعلای خەلیلی دەڵێت:** ((كەسێكی متمانەدارە و كۆدەنگی لەسـەرە، ئەوەنـدە بەسە بۆ متمانەی ئەو ئیمـامی ئـەهلی فـەرمووده بوخـاری شـانی لەسـەر دادەدا و فەرموودەی لێ وەردەگرت)) لە **"ترمذ"** لە ساڵی **٢٧٩**ك كۆچی دوایی كردووە[١].

ئیمامی **"الترمذي"** جامیعەكەی لەسەر دەروازەی فیقهـ و شتانی تـر دامەزرانـدووە، سـەحیح و حەسـەن و لاواز لـەخۆ دەگرێـت، لەگـەڵ ڕۆشـنكردنەوەی پلـەی هـەر فەرموودەیەك لە شـوێنی خۆیـدا، لـە هـەموو ئـەو بابەتانـەی دەروازەی بـۆ دانـاون مەزهـەبی هـاوەڵان و زانایـانی وڵاتـانی تێـدا ڕۆشـن كردووەتـەوە، لـە تـرازووی ئیمامی**"الترمذي"** ئەوەیە لە كۆتـایی جامیعەكەیـدا بەشـێكی تایبـەت كـردووە بـە عیللەتەكان كە كۆمەڵێك ڕێسای گشتی تێدا كۆكردووەتەوە.

**زۆرێـك لـە زانایـان شـەرحی "جامع"ەكـەیان كـردووە، لەوانـە: "أبـوبكر بـن العربـی"**(٥٤٣هـ) و **"الجـلال السـیوطي"** و ئـیبن ڕەجـەبی حەنبـەلی(٧٩٥هـ) و **"عبدالرحمن المباركفوري"**(١٣٥٣هـ) كە ناوی ناوە **"تحفة الأحوذي"**.

---

[١] تهذیب الأسماء واللغات للنووي، ومیزان الإعتدال للذهبي٣/١١٧.

١٠

# ئیمامی ئیبن ماجە و سوننەنەکەی

## ٢٠٧-٢٧٣ك

عەبدوڵای کوڕی یەزیدی کوڕی ماجە ساڵی ٢٠٧ لەدایك بووە و بەدوای زانستی فەرموودەدا گەڕاوە، بۆ ئەو زانستە ڕێگەی سەفەری گرتووەتە بەر لە هاوەڵانی مالیك و لەیسی کوڕی سەعد فەرموودەی بیستووە، خەڵکێکی زۆر لە ئیبن ماجەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە.

**ئەبو یەعلای خەلیلی قەزوێنی دەربارەی دەڵێت:** ((پیاوێکی زانا بوو بەم زانستە، چەندین دانراوی هەیە هەیانە مێژووە و هەیانە سونەنە، گەشتی بۆ لای عێراقییەکان و مصر و شام کردووە)).

**"ابن کثیر" دەڵێت:** ((خاوەنی سونەنی بەناوبانگە کە ئاماژەن لەسەر زانست و کار و فراوانی و ئاگاهی و شوێنکەوتنی سوننە لە ئوصولّ و لە فروعدا)).

ژمارەی کتێبەکانی دەگەنە سی و دوو کتێب، لە هەزار و پێنج سەد دەروازەدا، بەسەر چوار هەزار فەرموودەدا دابەشبوون، هەموو فەرموودەکان باش(جید)ن جگە لە کەمێکی زۆر کەم، ساڵی ٢٧٣ك کۆچی دوایی کردووە[١].

### پلە و پایەی سونەنەکەی:

زۆرێك لە پێشینەکان و پاشینەکان ئوسوڵی کتێبی فەرموودە بە پێنج دادەنێن: (بوخاری و مسلم و نەسائی و ئەبو داود و ترمزی)، بەڵام هەندێ لە پاشینەکان ئیبن ماجەشی دەخەنە سەر، چونکە کتێبەکەی لە مەیدانی فیقهدا سوودێکی مەزن

[١] البداية والنهاية لإبن كثير ١١/٥٢.

دەگەیەنێت، یەکەمین کەسێك ئەو کارەی کردووە بریتییە لە "**أبو محمد بن طاهر المقدسي**(٥٠٧هـ)"، بەڵام هەندێکیان لەوەدا پێچەوانەن و پێیانوایە شەشەم کتێب بریتییە لە "**سنن الدارمي**"، چونکە ئیبن ماجە فەرموودەی لە پیاوگەلێکەوە دەرهێناوە بە درۆ و دزی لە فەرموودەدا تۆمەتبار کراون، هەندێکی تر دەڵێن: پێویستە شەشەم کتێب "**الموطأ**"ی ئیمامی مالیك بێت ئەوەش بەهۆی دروستی و مەزنی ئەو کتێبەوە، سونەنی ئیبن ماجە لە پلە و پایەدا لەخوار سێ سونەنەکەوەیە.

"**السيوطي**" لە "شرح المجتبى"**دا دەڵێت:** ((تیایدا تەنهاکەوتووەتەوە بە تەخریج کردنی چەند فەرموودەیەك لە کۆمەڵە پیاوێکەوە کە بە درۆ و دزی لە فەرموودەدا تۆمەتبار کراون، هەندێ لەو فەرموودانە تەنها لای ئەو پیاوانەوە زانراون وەك "**حبيب بن أبي حبيب**" نووسەری مالیك، هەروەها "**العلاء بن زياد و داود بن المحبر وعبدالوهاب بن الضحاك**" و کەسانی تر.

زۆرێك لە زانایان شەرحی سونەنەکەیان کردووە، لەوانە **محەمەدی** کوڕی موسای دومەیری(٨٠٨هـ) و "**السيوطي**" لە "**مصباح الزجاجة على سنن ابن ماجة**"دا.

**ئەمە ئەوە بوو خودا یارمەتیدام لەسەر نووسین و دانانی، یەکەمجار و دواجار حەمد هەر بۆ خودایە.**

**وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم، والحمد لله رب العالمين.**

  

ڕۆژی شەممە ٢٠١٦/٥/١٤ لە وەرگێڕان و پوختەکردن و پێداچوونەوەی ئەم کتێبە تەواو بووم.

**خودا خێر و چاکە بۆ دانەرەکەی بنووسێت و ئێمە و خوێنەرانیش لە پاداشت بێبەش نەکات. آمین.**

وەرگێڕ/ سلێمانی

  

# ناوەڕۆك

# دەروازەی دووەم

## ئەو شوبهانەی لەسەر سوننە هاتوون لە چاخە جیاوازەکاندا حەوت بەشی تێدایە: ( ٧٣ - ١٨٨ )

# دەروازی سێیەم

## ئاست و پلە و پایەی سوننە لە تەشریعی ئیسلامیدا

## سێ بەش لە خۆ دەگرێت: ( ١٨٩ - ٢٠٨ )

# کۆتایـــی

## چوار ئیمامەکە و خاوەنانی شەش کتێبەکەی فەرموودە ( ٢٠٩ - ٢٤٤ )

